# گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی 47



ژمارە ٣
ساڵی سیانزەهەم
تشرینی دووەمی ٢٠٠٥

## لەم ژمارەیەدا :



### تەوەر: ئاین و دەوڵەت لەتورکیا



سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان
دەری دەکا

# گۆڤاری سەنتەری لیکۆڵینەوەی ستراتیجی

**گۆڤارێکی وەرزیيە**

**سەنتەری لیکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان دەری دەکا**




**مەڵبەندی گشتی:**

سلێمانی سەرچنار

شەقامی سەگرمە ٧٥ / گەڕەکی ١١٩/

ژمارەی خانوو ٤٣

تەلەفۆن ٣١٨٢٢٢٨

# بابەتەکانی ئەم ژمارەیە








### تەوەری ئاین و دەوڵەت لەتورکیا



بەشی عەرەبی
سەرپەرشتیار:
ئیسماعیل عەبدوڵلا عەزیز

فایلی ژمارە
سەرپەرشتیار:
بێکەس ئەنوەر


سایتی سەنتەر:
www.kss-c.org

ئیمەیل:
asasard2004@yahoo.com
info@KSS-C.org
support@KSS-C.org

نوسینگەی لەندەن:
Amin Qader mineh
11 Linden Court
Haydon Way
London Swll 1YB
UK
Tel. 00442088703354

## مۆركردنی پرۆتۆكۆلی هاوكاری لەبواری زانستو لێكۆڵینەوە
## لەنێوان ناوەندی نێونەتەوەیی لێكۆڵینەوەی ئایندەیی و ستراتیجی میسرو سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجی كوردستان

لەرەوتی سەردانی وەفدێكی سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجی كوردستان بەسەرۆكایەتیی فەرید ئەسەسەرد بەڕێوەبەری سەنتەرو ئەندامانی سەنتەر د. عەبدوڵلا محەمەد عەلی عەلیاوەیی، یوسف گۆرانو رێبین محەمەد سۆفی بۆ وڵاتی میسر، رۆژی ٢٠ی ئەیلولی ٢٠٠٥ پاش كۆبونەوەو راگۆڕینە لەگەڵ نوێنەرانی ناوەندی نێونەتەوەیی لێكۆڵینەوەی ئایندەیی و ستراتیجی میسر، هەردولا پرۆتۆكۆلێكیان لەبواری زانستو لێكۆڵینەوە مۆر كرد. پرۆتۆكۆلەكە لەلایەن ناوەندی نێونەتەوەیی لێكۆڵینەوەی ئایندەیی و ستراتیجییەوە د. عادل سلێمان بەڕێوەبەری ناوەند مۆری كردو لەلایەن سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجی كوردستانەوە فەرید ئەسەسەرد.

ئەمەش دەقی پرۆتۆكۆلەكەیە:

بەمەبەستی پتەوكردنی هاوكاری لەنێوان دامودەزگاكانی زانستو لێكۆڵینەوەو سەنتەرە ئیقلیمی‌یەكانی بیر لەسەر هەمو ئاستو لەهەمو بوارەكاندا، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەستە بەپەیوەندییەكانی میسر-عیراقو لەچوارچێوەی دیدو تێڕوانینە هاوبەشەكاندا، گفتوگۆی گشتی لەنێوان هەردولادا بۆ دەستنیشان كردنی باشترین رێوشوێن بۆ هێنانەدیی ئامانجی ناوبراو كراو لەم رەوتەدا هەردولا لەسەر ئەم چوارچێوە گشتییە رێككەوتن:

١-گۆڕینەوەی بڵاوكراوە لەنێوان هەردولا-پەخشنامەی تایبەت/ وەرزنامە/ كتێب/ نامیلكە/ راپۆرت/ كۆبەندی كۆڕو سیمینارو وۆرك شۆپو چالاكیی تر.

٢-سەردانی کردنی یەکتریی ئەو لێکۆڵیارو پسپۆرانەی کە لەسەریان ڕێکدەکەون و کاتی سەردانەکانیش هەردولا لەسەری ڕێکدەکەون.

٣-بەشداری کردنی هەر لایەك لەکۆڕو دیدارو سیمیناری نەخشەی ساڵانەی لێکۆڵینەوەی لاکەی تر.

٤-ڕێکخستنی کۆنفرەنس و کۆڕو وۆرك شۆپ و چالاکیی تری ڕۆشنبیری بەهاوبەشی، هەروەها ئەگەر هەردولا پێشەکی ڕەزامەندییان لەسەر نیشاندابوو، دەکرێ لایەنێکی سێیەمیش لەو بوارانەدا بەشدار بێ کەجێی بایەخی هەردولان.

٥-هاوکاری لەبواری بلاوکردنەوەی ئەلیکترۆنی لەئینتەرنێت و بەکارهێنانی ڕێوشوێنە هەمەجۆرەکان.

هەردوو لەسەر پێکهێنانی لیژنەیەکی ڕاپەڕاندنی هاوبەش بۆ ئامادەکردنی وردەکارییەکانی ڕێککەوتن لەبوارەکانی هاوکاریی هاوبەش و هەرچی پەیوەندیی بەلایەنەکانی ڕێکخستن و ڕاپەڕاندن و دارایی و کارگێڕی و بوارەکانی تەکنەلۆژیای زانیاری و کۆنتاکتەوە هەیە. لیژنەکە شێوەو ڕێوشوێنەکانی پەیوەندی و میکانیزمەکانی ئامادەکردنی چالاکیی هاوبەش لەڕێی دیدارە هاوبەشەکانی هەردو سەنتەرەوە ڕێکدەخا.

| بەڕێوەبەری | بەڕێوەبەری |
| --- | --- |
| سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان | ناوەندی نێونەتەوەیی لێکۆڵینەوەی ئایندەیی و ستراتیجی |
| فەرید ئەسەسەرد | د. عادل سلێمان |

٢٠٠٥/٩/٢٠

## زانكۆی سلێمانی گۆڤاری سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجی وەك گۆڤارێكی زانستی دەناسێنێ

ئەنجومەنی زانكۆی سلێمانی لەكۆبونەوەی ژمارە سی‌و حەوتدا كە لە١٠ی مانگی تەموزی ساڵی ٢٠٠٥دا بەسترا، گۆڤاری سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجی‌ی وەك گۆڤارێكی زانستی ناساندو لەم روەوە دكتۆر عەلی سەعید محەمەد سەرۆكی زانكۆی سلێمانی لەنامەیەكی رۆژی ٢٠٠٥/٧/١٨دا كەبۆ سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجی‌ی كوردستانی ناردبوو، وتی ((هیوای سەركەوتنتان بۆ دەخوازین‌و ئومێدەوارین ئەم دانپێدانانە هۆكارێك بێت بۆ زیاتر هاندان‌و بەگەڕخستنی لێكۆڵیارانی كوردستان)).

جێی ئاماژە پێكردنە كەلەم بارەیەوە لەنێوان زانكۆی سلێمانی‌و سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجی‌ی كوردستاندا گفتوگۆی تێروتەسەل كرابوو كەلەم سەروبەندەدا سەنتەر لەرۆژی ٢٠٠٥/٦/٩دا بەشێوەیەكی رەسمی پرۆژەو دیدی خۆی لەم روەوە پێشكەش بەئەنجومەنی زانكۆ كرد. سەبارەت بەم ناساندنەی گۆڤاری سەنتەر وەك گۆڤارێكی زانستی، یوسف گۆران جێگری بەرێوەبەری سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجی‌ی كوردستان رایگەیاند كە ((ناساندنی گۆڤارەكەمان وەك گۆڤارێكی زانستی لەلایەن زانكۆی سلێمانییەوە، لێی رادەبینرێ ببێ بەهاندەرێكی تر بۆ گەشەكردنی بزوتنەوەی زانستی‌و لێكۆڵینەوە لەكوردستاندا. ئاشكراشە كەپتەوكردنی پەیوەندیی نێوان سەنتەرو زانكۆ خزمەت بەرەوتی زانستی لەكوردستاندا دەكا)).

كوردستان

# كاريگەريى گەشەى شارستانىى دانيشتوان لەسەر تايبەتمەنديیە ديموگرافييەكانى شارى زاخۆ

د. خەليل ئيسماعيل محەمەد
زانكۆى سەلاحەددين

وەك ئاشكرايە دوورايىو بايەخى تايبەتمەندىيە ديموگرافييەكانى هەر هەرێمێك ياخود هەر ناوچەيەك بەبێ تاوتوێ كردنى قەوارەى دانيشتوانى ئەو هەرێمو ناوچەيەو بەبێ تاوتوێ كردنى ئەو فاكتەرانەى پەيوەندييان بە پەيدابوونو گەشەكردنى ئەو تايبەتمەندييانەوە هەيە، دەرناكەوێ. لەو سۆنگەيەشەوە كەمرۆڤ ئامانجى ئەم چەشنە توێژينەوانەى پەرەپێدان پێكدێنێ، گومان لەوەدا نامێنێ كەتوێژينەوەى لەو بابەتە بايەخى زۆرى هەيە بەتايبەتى كاتێك پسپۆڕان بەشێوەيەكى ئاسۆيىو ستوونى پەرەى پێ دەدەنو واى لێ دەكەن پانتايىو پارچەى ديكەى وڵات بگرێتەوە.

بەبۆچوونى ئەم لێكۆڵينەوەيە:

١ -لەشارى زاخۆ رەوەندێك هەيە بەرەو چڕبوونەوەى دانيشتوان دەچێو لەم بوارەدا كۆچ كردن رۆڵێكى ديارى لەقوڵ كردنى ئەم دياردەيەدا هەيە.

٢ -گۆڕانكارييە ديموگرافييە خێراكان رۆڵى خۆيان هەيە لەگەڵاڵە كردنى تايبەتمەندييە ديموگرافييە تازەكانى شارەكەدا.

ئەم لێكۆڵينەوەيە لەدوورايىى جوگرافيايىى ناوچەى لێكۆڵراو دەكۆڵێتەوەو بايەخى ئەو دوورايىيە لەپەيدابوونو گەشەكردنى شارەكەدا دەردەخاو رێ بۆ تاوتوێ كردنى گەشەى دانيشتوان لەماوەى نێوان ساڵانى ١٩٥٧و١٩٨٧ دا خۆش دەكا، ئەويش بەهۆى دوو توخمەكەى گەشەوە كەبريتين لەزيادەى سروشتىو بزاوتى

کۆچ و هەروەها لەو گۆڕانانەی پێکهاتەی تەمەن و جۆرو ئـابوری و کۆمەلاّیـەتی ی دانیشتوانیش دەکۆلّینەوە.

لەبەر رۆشنایی ی ئەمە، ئەم توێژینەوەیە مەبەستێتی لەو کاریگەرییە بکۆلّێتەوە کەگەشەی شارستانی ی دانیشتوان لەماوەی دەستنیشانکراوی ئەم لێکۆلّینەوەیەدا لەسەر تایبەتمەندییە دیمۆگرافییەکانی بەجێ هێشتووەو هەروەها لەو فاکتەرانەش دەکۆلّێتەوە کەرۆلّیان هەبو لەرەنگ رشتنی ئەو تایبەتمەندییانە تا دەگەینە دەستنیشان کردنی ئاماژەکانی گەشەی شارەکە لەئایندەدا.

## دوراییی جوگرافیایی ی شاری زاخۆ

شاری زاخۆ بەو هەلّکەوتەی لەنزیك سنوری عیراق-تورکیا-سوریا، یەکێ لەدەروازە سەرەکییەکانی رێگای نێودەولّەتی ی عیراقە لەلایەك و هەر یەك لەتورکیاو سوریا لەلایەکی ترەوە. ئەم شارە بەوەش کە کەوتۆتە ناوەڕاستی دەشتە بەپیت و بەرەکەتەکەی سندی، بۆتە بازاڕێکی بەرهەمی ناوچەی شاخاویی دەوروبەری خۆی. ئیدی ئەم شارە جگە لەوەی کەشارێکی دەروازەیە۱، شارێکی ساغکردنەوەی کالاّشە.

ئاشکرایە کەزۆربەی شارەکانی ناوچەی شاخاوی لەسەر بنەمایەکی کشتوکالّی-بازرگانی پەیدا بون و گەشەیان کردوە، سەرباری هەلّکەوتە جوگرافیایی یە تایبەتەکانیان وەك دەروازەیەکی ناوچە شاخاوییەکان یاخود وەك مەلّبەندێکی سەر سنور یاخود وەك وارێکی بەرگری. لەو سۆنگەیەوە شتێکی سەیر نابێ ئەگەر ئەم چەشنە شارانە بازاڕی دەوروبەری خۆیان بن و ببنە کۆکەرەوەی بەروبوم و کالاّی ناوچە شاخاوییەکان و بەروبوم و کالاّی ناوچە دەشتایی یەکان[۲]. پیشە بنەڕەتی یەکانی دانیشتوانی ئەم چەشنە شارانە بەشێوەیەك لەشێوەکان بەو خزمەتەوە بەستراونەتەوە کە شارەکان بۆ گەشتیارانی پێشکەش دەکەن و بریتین لەخزمەتگوزارییەکانی گواستنەوە، بازرگانی، پیشەسازیی ئامێری کشتوکالّی، سەرباری کارامەیی ی هەندێ لەدانیشتوان لەبواری کاروباری تایبەت بەکشتوکالّ و بەخێوکردنی ئاژەلّ. لەشاری زاخۆ بەهۆی هەلّکەوتە جوگرافیایی یەکەوە، سەرباری ئەوەی باس کرا، پەرەسەندنێك لەبواری

داموو دەزگا خزمەتگوزارییەکاندا بەدی دەکرێ ئەویش بەهۆی چالاکیی زیادی داموو دەزگاکانی بەرهەم هێنان‌و پرۆژە پیشەسازی‌و خزمەتگوزارییەکان کە وردە وردە پانتایی شاریان داگیرکردوو لەسەرەنجامدا جۆرەها ئەرکیان لەگەڵ خۆیاندا هێنایە پێش کە لەمەوبەر نمونەیان نەبو.

شارەکە ناوەندی قەزای زاخۆی گرتۆتە خۆی کەسەرباری ناحیەی ناوەند، هەردو ناحیەی سندی‌و گلیشی لەخۆ گرتوە. قەزاکە کەوتۆتە ئەوپەڕی باکوری رۆژئاوای پارێزگاکانی هەرێمی کوردستانی عیراق.

## گەشەی دانیشتوان لەشاری زاخۆ

شارەکان ئەو ناوەندانەن کەدانیشتوانیان تێدا کۆ بۆتەوەو چڕییەکەشیان بەرێژە چڕییەکی بەرزەو گوزارشت لەریتمی گەشەی بەرزی قەوارەی دانیشتوان دەکا بەو پێیەی کەناوەندن بۆ راکێشانی دانیشتوان بە بەردەوامی، چ ئەو دانیشتوانانە هی ناوچە لادێیی‌یەکان بن‌و چ هی ناوچە دراوسێ‌و نزیکەکان بن.

ئەم چەشنە گۆڕانکارییانە تاسەواری خۆیان لەسەر فراوانبونی ستونی‌و تاسۆیی‌ی ناوچە ئاوەدانەکانی شارو چەشنی ئەرکەکانی بەجێ دێڵێ[٣]. لێرەدا شتێکی بەسودە کەهەردو پرۆسەی((گەشەی شارستانی))و((پەلهاوێشتنی شارستانی)) لێك جودا بکەینەوە. دیارە واژەی یەکەم ئەو زیادبونەی قەوارەی دانیشتوانی شار دەگرێتەوە کە بەم سێ شێوەیە دێتە دی:

١-بەزیادبونی قەوارەی گەشەی سروشتی لەچاو گەشەی ناوچە لادێ نشینەکان.

٢-بەزیادبونی قەوارەی تێکڕای کۆچ کردن بۆ شار.

٣-بەئەنجامدانی پرۆسەی لەخۆگرتنی گوندو نشینگە دراوسێکان، واتە ئەوەی پێی دەوترێ((خۆسەپاندنی شارستانی‌یانە))[٤].

مەبەست لە((پەلهاوێشتنی شارستانی)) گۆڕانی هەیکەلی شارستانی‌ی شارە[٥]، لەکاتێکدا پرۆسەی((گەشەی شارستانی)) زۆربەی جار بەشێوەیەکی خێرا بەرێوە دەچێ،((بەشارستانی بون)) پرۆسەیەکە بەزیادبونی دانیشتوانی شار لەرێی گۆڕانی ژیانی لادێیی‌یەوە یاخود بەهۆی کۆچەوە لەلادێوە بۆ شار، دێتە

دی. بۆیە بەشارستانی بون پرۆسەی گۆڕانی شێنەیی‌و نەپساوەیە کەهاوتەریبە لەگەڵ کۆمەڵە گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی‌و ئابوری بەڕادەیەك کەدەبێتە مایەی ئاسانکردنی گونجانی دانیشتوانی لادێ لەگەڵ ژیانی نوێدا.

مەسەلەی ((بەشارستانی بون)) خۆی لەخۆیدا گیروگرفت نیە، بەڵکو دەشێ مەسەلەیەکی پێویست بێ ئەگەر بەشێنەیی بێتە دی بەڵام کاتێك قەوارەی دانیشتوان توانای شار تێدەپەڕێنێ‌و وا دەکات شار نەتوانێ خەڵکانی هاتو لەخۆ بگرێ، دەشێ گیروگرفتی لێ بکەوێتەوە، چونکە ئەم زیادبونەی ژمارەی دانیشتوان گۆڕانی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و دیموگرافی‌ی خێراو بەپەلەو نەویستراو لەگەڵ خۆیدا دێنێ.

بەپێی سەرژمێرەکانی عیراق، شاری زاخۆ لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٥٧-١٩٨٧دا خێرابونی ریتمی گەشەی دانیشتوانی بەخۆوە دیوە بەڕادەیەك کەقەوارەی دانیشتوان نزیکەی ٨ جار بەرامبەر بە ٢,٨ جار لەعیراقدا، زیادی کرد ، لەکاتێکدا زیادبونی قەوارەی دانیشوان لەپارێزگای دهۆك ١,٦ جار بوە. هەروەها لەکاتێکدا رێژەی زیادبونی دانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵراو لەساڵێکدا ٢٢٪ بوە، دەبینین ئەم رێژەیە لەقەزاکەدا ٢,٨٪ بوەو لەپارێزگاکەدا ١,٩٪ بوە. لەم روەوە بچۆوە بۆ سەر خشتەی ژمارە ١.

خشتەی ژمارە ١

دانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵراوو قەزای زاخۆو پارێزگای دهۆك (١٩٥٧-١٩٨٧) بەپێی گەشەی ساڵانە

| ماوە | شار | قەزا | پارێزگا |
|---|---|---|---|
| ١٩٥٧-١٩٧٠ | ٥,٥ | ٢,٥ | ٢,٤ |
| ١٩٧٠-١٩٧٧ | ١٧,١ | ٣,٤ | ٠,٤ |
| ١٩٧٧-١٩٨٧ | ١٠ | ١,٣ | ١,٧ |
| ١٩٥٧-١٩٨٧ | ٢١,٨ | ٢,٨ | ١,٩ |

سەرچاوە: سەرەنجامی سەرژمێرەکانی عیراق لەساڵانی ١٩٥٧، ١٩٧٠، ١٩٧٧، ١٩٨٧/ پارێزگای دهۆك.

تێبینی کراوە کە لەساڵانی حەفتاکاندا ڕێژەکانی گەشەی دانیشتوانی شاری زاخۆ ڕێژەی بەرز بـوەو لەسـاڵانی ١٩٧٠-١٩٧٧دا ئـەم ڕێژەیـە سـاڵانە ١٧٪ ی تێپەڕاندووە، لەکاتێکدا لـەنێو دانیشـتوانی قـەزای زاخـۆدا سـاڵانە ٣,٤٪ بـوەو لەپارێزگای دهۆك ٤,٠٪ بوە. لەماوەی دە ساڵەکەی نێـوان١٩٧٧-١٩٨٧ یـش، ڕێژەکە لەشاردا ١٠٪ بوە، لەکاتێکدا لەقەزاو پارێزگادا یەك لەدوای یەك ١,٣٪ و١,٧٪ بوە.

ئەم ڕێژانەی زیادبون لەو ناوچەیە وایان کردوە زیاتر نوێنەرایەتی‌ی سەرجەمی دانیشـتوانی قـەزای زاخـۆ یـان پارێزگـای دهـۆك بکـەن‌و لـەم ڕووەوە ڕێـژەی نوێنەرایەتی کردنی دانیشتوانی قەزاکە لەماوەی لێکۆڵینەوەکـەدا زیـادی کـردو لە١٧,٦٪ـە وە بوو بە ٧٢,٣٪، واتە نێونجی زیادەی سـاڵانە گەیشـتۆتە ١,٥٪ . هەروەها ڕێژەی نوێنەرایەتی کردنی سەرجەمی دانیشتوانی پارێزگاکـەش زیـادی کـردوەو لەهـەمان مـاوەدا لـە٤,٣٪ وە گەیشـتۆتە ٢٠٪، واتـە نێونجـی زیـادەی ساڵانە ٠,٥٪ بـوە. لـەم ڕووەوە بچـۆوە بـۆ سـەر خشـتەی ژمـارە ٢ کـە بەهۆیـەوە دەردەکەوێ کـە لەسـاڵانی حـەفتاکاندا(١٩٧٠-١٩٧٧) ڕێـژەی زیـادەی سـاڵانە تیایـاندا گەیشـتۆتە ٢,٦٪ ولـەماوەی نێـوان سـاڵانی ١٩٧٧-١٩٨٧دا گەیشتۆتە٣,٢٪، لەکاتێکدا لەهەردو ماوەی ناوبراودا لەپارێزگاکەدا ١٪ کەمتر بوە.

**خشتەی ژمارە ٢**

**ڕێژەی دانیشتوانی شاری زاخۆ لەچاو ڕێژەی دانیشتوانی قەزاکەو پارێزگای دهۆك**

| ساڵ | ٪ ی دانیشتوانی قەزا | ٪ ی دانیشتوانی پارێزگا |
|---|---|---|
| ١٩٥٧ | ١٧,٦ | ٤,٣ |
| ١٩٧٠ | ٢٢,٩ | ٥,٧ |
| ١٩٧٧ | ٤٠,٧ | ١٢,١ |
| ١٩٨٧ | ٧٢,٣ | ١٩,٩ |

سەرچاوە: سەرچاوەکانی خشتەی ژمارە یەك.

لەئاکامی ئەم گەشەیەی دانیشتوانی شاردا، شاری زاخۆ توانی بۆ ماوەی ساڵانێکی دورو درێژ بەردەوام بێ لەسەر منافەسەکردنی شاری دهۆک لە بەدەست هێنانی پلەی یەکەمدا لەماوەی لێکۆڵینەوەکەداو لەم روەوە تا ساڵی ١٩٧٠ شاری زاخۆ لەپێشی پێشەوە بوو ئەویش بەر لەوەی قەزای دهۆک بکرێ بەپارێزگاو بەر لەوەی شاری دهۆک ببێ بەناوەندی پارێزگاکە. بڕوانە خشتەی ژمارە ٣.

**خشتەی ژمارە ٣**

**رێژەی دانیشتوانی ناوەندە شارستانییەکانی پارێزگای دهۆک لەچاو سەرجەمی دانیشتوانی پارێزگاکە(١٩٥٧-١٩٨٧)**

| شار | ١٩٥٧ | ١٩٧٠ | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ | رێژەی زیادبون٪ |
|---|---|---|---|---|---|
| دهۆک | ٤,١ | ٧,٥ | ١٦ | ٣٧,٦ | ٣٣,٥ |
| زاخۆ | ٤,٣ | ٥,٧ | ١٢,١ | ١٩,٩ | ١٥,٦ |
| ئامێدی | ١,٨ | ١,٤ | ٢,٨ | ١,٦ | ٠,٢- |
| سەرسنک | ٠,٥ | ٠,٤ | ٣,١ | ١,٣ | ٠,٨ |
| سمێل | ٠,٣ | ١,٢ | ٣,١ | ٥,١ | ٤,٨ |
| سەرجەم | ١١ | ١٦,٢ | ٣٧,١ | ٦٥,٥ | ٥٤.٥ |

سەرچاوە: هەمان سەرچاوەکانی خشتەی ژمارە ١.

لەخشتەی ژمارە ٣ دەردەکەوێ کەرێژەی دانیشتوانی شارە سەرەکییەکانی پارێزگاکە لە١١٪ی سەرجەمی دانیشتوانەوە بۆتە دەوروبەری٦٦٪ لەماوەی ساڵانی نێوان ١٩٥٧-١٩٨٧داو بەم پێیە رێژەکە لەشاری دهۆک گەیشتۆتە ٣٣,٥٪ وپاش شاری دهۆک شاری زاخۆ دێ کەرێژەی زیادییەکە تێیدا گەیشتۆتە ١٥,٦٪ ئنجا پاشان بەپلەی سێیەم سمێل دێ کەرێژەکەی گەیشتۆتە ٤,٨٪.

بێگومـان ئـەم گۆڕانکارییانـــە رەنگدانـــەوەی جیـــاوازیی نێوانجـــی گەشـــەی دانیشتوانی ئەو ناوەندە شارستانییانەن‌و لەم ســـەروبەندەدا ئــەو نێوەنجە لەشــاری دهۆك لە٥٠٪ زیاتر بوو، لەکاتێکدا لەشاری ئامێدی کــەمتر بــوو لــە٢٪ و لــەم روەوە سەیری خشتەی ژمارە ٤ بکە.

خشتەی ژمارە ٤

ڕێژەکانی گەشەی دانیشتوانی ناوەندە شارستانییە سەرەکییەکانی پارێزگای دهۆك (١٩٥٧-١٩٨٧)

| شار | ١٩٥٧-١٩٧٠ | ١٩٧٠-١٩٧٧ | ١٩٧٧-١٩٨٧ | ١٩٥٧-١٩٨٧ |
|---|---|---|---|---|
| دهۆك | ١٠,٦ | ١٧,١ | ٢٠,٦ | ٥٠,١ |
| زاخۆ | ٥,٥ | ١٧,١ | ١٠,٠ | ٢١,٨ |
| ئامێدی | - | ١٥,٣ | ٣,٠ | ١,٥ |
| سمێل | ٣٢ | ٢٣,٥ | ١٠,١ | ٨٧,٩ |
| سەرسنك | ١,٨ | ٩١,٥ | -٤,٨ | ١٢,٤ |

شایانی باسە کەگەشەی خـێرای دانیشـتوانی شـار ئاسـەواری خۆی لەلایـەك لەسەر ئاستی بەشارستانی بونــی ناوچـەی لێکۆڵـراو بـەجێ هێشـتو لەلایـەکی ترەوە لەسەر ئاستی بەشارستانی بونی قەزاکـە بـەجۆرێك کـەرادەی گردبونـەوەی شارستانیی شارەکە زیادی کردو لە ٢٠,٨٪ی سەرجەمی دانیشتوانی قەزاکەوە بوو بەزیاتر لە٨٢٪ لەماوەی لێکۆڵینەوەکەداو بەم پێیە شاری زاخۆ وای لێ هات ٨٧٪ی سەرجەمی دانیشتوانی شارســتانی قەزاکـەو نزیکـەی ٢٨٪ی سـەرجەمی دانیشتوانی سەنتەرە شارستانییەکانی پارێزگاکەی گرتە خـۆ. لەسـەرێکی تـرەوە رێـژەی دانیشـتوانی لادێ لەهــەمان مــاوەدا چـەند دانیشــتوانی ســەنتەرە شارستانییەکان زیادی کرد، ئەویش ئەوەندە دابەزیو لــەم روەوە ســەیری خشـتەی ژمارە ٥ بکە کەئەم مەسەلەیە بەچاکی رون دەکاتەوە.

**خشتەی ژمارە ٥**
**دانیشتوانی قەزای زاخۆ بەپێی ژینگە**
**(١٩٥٧-١٩٨٧)**

| ساڵ | شارستان | لادێ |
|---|---|---|
| ١٩٥٧ | ٢٠,٨ | ٧٩,٢ |
| ١٩٧٠ | ٢٥,٩ | ٧٤,١ |
| ١٩٧٧ | ٥٣,٦ | ٤٦,٤ |
| ١٩٨٧ | ٨٣,٢ | ١٦,٨ |

سەرچاوە: هەمان سەرچاوەکانی خشتەی ژمارە(١).

سەرنج دراوە کەقۆناغی پاش ساڵی ١٩٧٠ خێراترین قۆناغە لەبواری زیادبونی رادەی گردبونەوەی شارستانیبیانە، ئەمەش لەگەڵ ئەو قۆناغەدا ریک دێتەوە کەتێیدا رێژەی گەشەی دانیشتوانی شارەکە رێژەیەکی بەرز بوە کەدیارە ئەمەش کاریگەریی لەسەر ئەم زیادەیە بەجێ هێشتوە.

هۆی گەشەکردنی دانیشتوانی هەر ناوچەیەك یاخود هەر هەرێمێك لەبنەرەتدا دەچێتەوە سەر بزاوتی سروشتی‌ی دانیشتوانو بزاوتی میکانیکی‌یانەی دانیشتوان(کۆچ)و لێرەدا بۆ زانینی رۆڵی هەر یەکێکیان لەگەشەی دانیشتوانی شاردا، یەك بەیەك تاوتوێیان دەکەین.

## زیادبونی سروشتی

ئەو زانیاری‌یەی کەئێمە سەبارەت بەزیادبونی سروشتی هەمانە، دەوەستێتە سەر ئەو ئەنجامەی کە لەسەرژمێرە سەرەکییەکان چنگمان کەوتوە، بەتایبەتی سەرژمێرەکانی تایبەت بە لەدایك بونو مردن. ئەم سەرژمێرانەش لەبەر ئەوەی زۆر کەسی تێدا تۆمار نەکراوە[٦]، زۆر جار کەموکوریی تێکەوتوەو بەنوقستانی گەیشتۆتە بەردەستمان. لەبەر ئەم هۆیە لێکۆڵیارانی ئەم چەشنە بوارانە هانا دەبەنە بەر پرۆسەی روپێوی مەیدانی بۆ وەدەست هێنانی ئەنجامی وردترو دروستتر. لەم روەوە دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە لەساڵانی حەفتای سەدەی

رابـردودا دەزگـای نـاوەندیی ئامـار روپێویکـی مـەیدانیی سـەبارەت بـەدیاردەی پیتیو چەند فاکتەرێکی گۆڕاوی دیمۆگرافی ئەنجامدا.[*]

ئیدی بۆ خۆلادان لەکەموکورییەکانی ئەو زانیارییانەو لەبەر دژواریی دەست گەیشتن بەداتاکانی زیادەی سروشتیی ناوچەی لێکۆڵراو بەهۆی هەلومەرجی نائاسایی ناوچەکە لەو ماوەیەی کەئەم توێژینەوەیە لێی دەکۆڵێتەوە، پشت بەزانیارییەکانی تایبەت بەزیادەی سروشتیی پارێزگای دهۆک و عیراق بەسترا، بەتایبەتی کەلەم بارەیەوە لێک نزیکبونەوەیەکی دیار لەنێوان نێونجەکانیاندا هەیە.[7]

لەپارێزگای دهۆک زانیارییەکانی دەزگای ناوەندیی ئامار ئاماژەیان بۆ ئەوە کردوە کە لەماوەی نێوان ١٩٧٨-١٩٨٨دا نێونجەکانی زیادەی سروشتی گەیشتۆتە لەهەزاردا ٢٢,٩، لەکاتێکدا لەعیراقدا گەیشتبوە لەهەزاردا ٢٢,١، ئەمەش لێک نزیکبونی ڕێژەییی نێوانیان دەردەخا[8]. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم چەشنە نێونجانە گوزارشت لەهەلومەرجی لەدایکبون و مردنی هیچ کامێکیان ناکەن. لەئاکامدا هەڵسوڕاوانی دەزگای ناوەندیی ئامار کەوتنە دەستکاری کردنیان. لەم ڕووەوە مەزندەکارییەکانی پسپۆڕی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد کەزیادبونی سروشتیی ژمارەی دانیشتوان لەعیراقدا کەوتۆتە نێوان ٢٧,٦-٣٢,٢ [9]، ئەمەش گوزارشت لەو جیاوازییە زۆرەی نێوان هەردوو سەرچاوە دەکا.

هەروەها لەبەر ڕۆشنایی ڕوپێوە مەیدانییەکانی وەزارەتی نەخشەدانان بۆ ماوەی نێوان١٩٧٥-١٩٨٠، دەرکەوتوە کە نێونجی لەدایکبون گەیشتۆتە لەهەزاردا ٤٧و نێونجی مردنیش گەیشتۆتە لەهەزاردا ١٣، ئیدی نێونجی زیادەی سروشتیش ساڵانە گەیشتۆتە لەهەزاردا ٣٤ [10].

لەئاکامی ئەم جیاوازییانەی نێونجی زیادەی سروشتیداو بەهۆی ئەوەی کەئامارەکان ورد نین، زیاتر سود لەنێونجی زیادەی سروشتیی عیراق وەك یەکێ لەئەلتەرناتیڤەکان وەرگیرا بۆ گەیشتن بەقەوارەی کۆچ و گەشەی سروشتیی

---

[*] لەو ڕوپێوانە، ڕوپێوی ساڵانی ١٩٧٣-١٩٧٤و ١٩٧٤-١٩٧٥و ١٩٧٥-١٩٨٠ کە لەسەر بنەمای((مشت نمونەی خەرمانە)) ئەنجام دران.

ناوچەی لێکۆڵراو بەو پێیەی کەئەم دو توخمە گەشەی دانیشتوان دەستنیشان دەکەن.

لەبەر رۆشنایی‌ی لێك نزیکی‌ی نێونجەکانی زیادبونی سروشتی لەهەر یەك لەپارێزگای دهۆك‌و عیراق‌و بەپشت بەستن بەسەرەنجامەکانی روپێوە مەیدانییەکان، دەتوانین بەم ئەنجامگیرییانەی خوارەوە دەرچین:

١-نێونجی گەشەی دانیشتوانی شاری زاخۆ لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٧٧-١٩٨٧دا ساڵانە ١٠٪ بوە. بروانە خشتەی ژمارە ٦.

٢-بەدەرکردنی رێژەی زیادبونی سروشتی کەساڵانە بە ٣,٤٪ مان مەزندە کردوە.

٣-رێژەی کۆچ کردن بۆ ناوچەی لێکۆڵراو دەبێتە:

١٠٪ - ٣,٤٪ = ساڵانە ٦,٦٪.

جگە لەوە، رێوشوێنێکی تر هەیە بۆ دەرهێنانی قەوارەی کۆچی تێکڕایی ئەویش بەدەرهێنانی جیاوازییە لەنێوان رێژەی گەشەی دانیشتوانی شارەکە کەساڵانە گەیشتۆتە ١٠٪و لەنێوان رێژەی گەشەی دانیشتوانی قەزای زاخۆ(١,٣٪)و لەئاکامدا قەوارەی کۆچ بریتی دەبێ لە:

١٠٪ - ١,٣٪ = ساڵانە ٨,٧٪

بەپشت بەستن بەم رێژانە، قەوارەی دانیشتوانی شاری زاخۆ وا مەزەندە دەکرێ کە بەپێی رێژەی گەشەی دانیشتوانی قەزاکە لەساڵی ١٩٨٧دا ٣٤١٧١ کەس بووبێ، ئەویش بەجیاوازیی ٢٦,٤٨١ کەس لەسەرەنجامی سەرژمێری ئەو ساڵە، ئەمەش رۆڵ‌و گرنگی‌ی کۆچ لەزیادبونی دانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵراودا دەردەخاو گۆڕانکارییە دیمۆگرافییەکانی تریش رون دەکاتەوە بەتایبەتی کەزۆربەی هەرە زۆری کۆچکەرەکان لەگروپە گەنجەکانی ١٥-٤٤ ساڵدان‌و زۆرینەشیان نێرینەن. بچۆوە سەر نەخشەی ژمارە ٧. رێژەی گروپی ناوبراو لەساڵی ١٩٨٧دا لە ٥٨٪ ی سەرجەمی کۆچکەرانی هاتوو بۆ پارێزگای دهۆك زیاتر بوو، هەروەك نێرینەکانیش دەوروبەری ٦٠٪ی سەرجەمی ئەو کۆچبەرانەیان پێکدەهێنا.

لەئاکامی بزاوتی کۆچ کردندا رێژەی جۆریش لەشارەکەدا زیادی کردو لە١٠٧,٧ـەوە بۆ هەر سەد مێینە بوو بە١١٠,٧ لەماوەی نێوان ١٩٥٧-١٩٨٧دا، واتە زیادەکە سێ ئەوەندەی تەواوی قەزاکە بوو. بچۆوە سەرخشتەی ژمارە ٨.

**خشتەی ژمارە ٦**

**دانیشتوانی شارو قەزای زاخۆ بەپێی ژینگە**

**١٩٥٧-١٩٨٧(٪)**

| ماوە | شار | قەزا |
|---|---|---|
| ١٩٥٧-١٩٧٠ | ٥,٥ | ٢,٥ |
| ١٩٧٠-١٩٧٧ | ١٧,١ | ٣,٤ |
| ١٩٧٧-١٩٨٧ | ١٠,٠ | ١,٣ |
| ١٩٥٧-١٩٨٧ | ٢١,٨ | ٢,٨ |

سەرچاوە: ئەنجامی سەرژمێرەکانی ساڵانی ١٩٥٧، ١٩٧٧، ١٩٨٧و سەرژمێری سەرەتایی ساڵی ١٩٧٠.

**خشتەی ژمارە ٧**

**هاتووەکان بۆ پارێزگای دهۆك بەپێی رەگەزو گروپی تەمەن(١٩٨٧)**

| گروپی تەمەن | نێرینە | مێینە | سەرجەم |
|---|---|---|---|
| ٠-١٤ساڵ | ٢٦,٢ | ٢٩,٢ | ٢٧,٦ |
| ١٥-٤٤ | ٦٠,٣ | ٥٦,٤ | ٥٨,٤ |
| ٤٥-٦٤ | ٩,٨ | ١٠,١ | ١٠,٠ |
| ٦٥ سەر بەرەو ژوور | ٣,٧ | ٤,٣ | ٤,٠ |
| سەرجەم | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ |

سەرچاوە: ئەنجامی سەرژمێری ساڵی ١٩٨٧/ پارێزگای دهۆك.

خشتەی ژمارە ٨

دانیشتوانی شارو قەزای زاخۆ بەپێی جۆر

١٩٨٧-١٩٥٧

| ساڵ | شار | قەزا |
|---|---|---|
| ١٩٥٧ | ١٠٧,٧ | ١٠٨,٤ |
| ١٩٧٧ | ١٢٠,٩ | ١٤٣,٦ |
| ١٩٨٧ | ١١٠,٧ | ١٠٩,١ |

سەرچاوە: سەرژمێرەکانی ساڵانی ١٩٥٧، ١٩٧٧، ١٩٨٧ی دانیشتوانی عیراق/ دهۆك.

لەبەر رۆشنایی‌ی ئەوەی باس کرا، دەشێ بگوترێ کەبزوتنەوەی کۆچ کردن بۆ ناوچەی لێکۆڵراو ئاسەوارێکی دیاری هەبوە نەك هەر لەسەر ریتمی گەشەی دانیشتوانەکەی بەڵکو هەروەها لەسەر چەندەها تایبەتمەندیی دیموگرافییانەی ئەو ناوچەیە.

شایانی باسە کەئەم جۆرە کۆچە نەبوە هۆی بەدی هاتنی هیچ گۆڕانێکی شارستانییانە لەبواری شێوازی گوزەران‌و پێکهاتەی کەلتوری‌و کۆمەڵایەتیدا بەشێوەیەك کەهاوتەریب بێ لەگەڵ قەبارەی ئەو کۆچەدا. لەئەنجامدا بەشێکی دانیشتوانی شارەکە تەنها بەحوکمی نیشتەجێ بون سیفەتی((شارستان))ی وەرگرت نەك لەسەر بناغەی ناوەڕۆکی شارستانییانەی وەدەستهێنراو. لەئاکامی ئەمەدا کۆمەڵێك ناکۆکی سەری دەرهێنا کەبونە مایەی هەست کردن بەبێ ئومێدی، چ بەنیسبەت ئەو ناوچانەی لێوەی کۆچ کراوەو چ بەنیسبەت ئەو ناوچانەی کۆچیان بۆکراوە. لەکاتێکدا کۆچکەرەکە نەیتوانیوە خۆی لەگەڵ ژیانی شاردا بسازێنێ بەو پێیەی کەژیانی شار چەشنێکی دیکەی ژیانەو لەرەفتارو هەڵسوکەوت‌و شێوازی بیرکردنەوەدا جیاوازە، بەچونی ئەو کۆچکەرە بۆ شار عادات‌و داب‌و نەریتی خۆیشی لەگەڵ خۆیدا برد، ئەمەش هەندێ لەلێکۆڵیاران وای گوزارشت لێ کردوە کەبریتی‌یە لەدیاردەی بەلادێ کردنی شار[١١].

هەمو کەسێك دەتوانێ لەزۆر شوێنی ناوچەی لێکۆڵراودا هەست بەم دیاردەیە بکات کەخۆی لەچەند دیاردەیەکدا دەنوێنێ وەك گەڕەکە کۆنەکانو ماڵە چەند نهۆمی یەکانو دامو دەزگاو کارگە جیاوازەکان، هەروەها لەهەندێ شتی تریشدا بەدی دەکرێ وەك شێوەی زمانو جلوبەرگو جۆری هەڵسوکەوتو چۆنێتی ی رەفتاری رۆژانە.

## ئەنجامگیری

ئەم توێژینەوەیە بەم سەرەنجامانە گەیشتوە:

١-بەرزبونەوەی ریتمی گەشەی دانیشتوانی شاری زاخۆ لەماوەی لێکۆڵینەوەکەدا بەتایبەتی لەساڵانی حەفتاداو ئەم گەشەیە لەگەشەی دانیشتوانی قەزاکەو پارێزگاکەدا زیاتر بوە.

٢-رێژەی گەشەی سروشتی هۆکەی ناگەڕێتەوە سەر کزیی ئەو رێژەیە لەقەزاکەدا یاخود لەپارێزگاکەدا بەڵکو دەچێتەوە سەر بزوتنەوەی کۆچ بۆ شارەکە.

٣-لەئاکامی بزوتنەوەی کۆچدا گۆڕانێکی زۆر بەسەر تایبەتمەندییە دیموگرافییەکانی دانیشتواندا هات بەتایبەتی سەبارەت بەپێکهاتەی دانیشتوانو تەمەنو ئابوریی دانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵراو.

٤-ئەم گەشە خێرایە کەکۆچ رۆڵێکی سەرەکیی تێدا گێڕا، ئەو هەڵەی بۆ دانیشتوانی هاتوو نەرەخساند کە لەڕوی شارستانییەوە تێکهەڵکێشی باقی دانیشتوان بنو لەئاکامی ئەمەدا دوالیزمێك لەبواری بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتو رەفتاری مرۆییدا هاتە کایەوە.

٥-لەلایەکی ترەوە ئەم ژمارە زۆرەی دانیشتوان بوە هۆی خولقاندنی هەلی یارمەتیدەر بۆ بزوتنەوەی پەرەپێدان لەناوچەکەداو هەروەها بوە مایەی هاندانی سەرمایەگوزاریی پیشەسازیو سەرمایەگوزاریی خزمەتگوزاری.

## راسپاردەکان

لەبەر رۆشنایی‌ی ئەم توێژینەوەیەدا لێکۆڵیار ئەم سەرنج و تێبینی‌یانەی خۆی جێگیر دەکا:

١-سود وەرگرتن لەتەوەرەی زاخۆ-برایم خەلیل-پاڤێل بۆ گەشەکردنی شارستانییانە بەمەبەستی کەم کردنەوەی بزاوتی کۆچ کردن بۆ ناوچەی لێکۆڵراو، بەتایبەتی کەئەم تەوەرەیە دەروازەیەکە لەسوریاو تورکیاوە بەرەو عێراق، جگە لەوەی کە بەناوەندێکی کۆبونەوەی بەرهەم و کەرەستەو کاڵای ناوچەی شاخاوی و ناوچەی دەشتایی دادەنرێ، سەرباری هەڵکەوتی جوگرافیایی‌ی تەوەرەی ناوبراو لەنزیك دەریاچەی موسل و بەنداوە گەورەکەی موسل.

٢-چاوگێڕانەوە بەنەخشەی بنچینەیی‌ی شارەکە بەرادەیەك کەگۆڕانە دیموگرافییە تازەکان لەبەرچاو بگرێ و سنورێك بۆ فراوانبونی ناڕێکی نیشتەجێ بون دابنێت.

٣-بایەخدان بەهەرێمی شارەکەو چاوگێڕانەوە بە پەرەپێدانی لادێیی بەجۆرێك کەخێرێکی زۆرتری بۆ لادێ لێ هەڵوەرێ و ببێتە هۆی ئەوەی کەلادێ زیاتر دانیشتوان بەلای خۆیدا رابکێشێ و زیاتر بەکەڵکی نیشتەجێ بون بێ.

سەرچاوەکان:

[1] ابراهيم شريف، الموقع الجغرافي للعراق واثره في تأريخه العام، الجزء الاول، مطبعة شفيق، بغداد، ص١١٢.

[2] بڕوانە: شاكر خصباك، العراق الشمالي، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٧٣، ص٣٠٧. هەروەها: خطاب العاني، جغرافية العراق، مطبعة جامعة بغداد، بغداد، ١٩٩٠، ص١٦٢.

[3] بڕوانە: صلاح الجنابي، مركز المدينة الاقتصادي واثره في المركب الحضري، مجلة الجمعية الجغرافية العراقية، العدد١٦، ١٩٨٥، بغداد،

4-Clarke, J.I, population Geography, pergamon, London, 1968.

[5] جامعة الدول العربية، المنظمة العربية للتربية والعلوم، الجزء الاول، القاهرة، ١٩٧٨، ص٨.

[6] بڕوانە سەر: احمد نجم الدين، جغرافية سكان العراق، مطبعة جامعة بغداد، بغداد، ١٩٨٢، ص٣.

[7] بڕوانە: الجهاز المركزي للاحصاء، المجموعات الاحصائية للسنوات ١٩٧٨-١٩٨٨.

[8] احمد نجم الدين، المصدر السابق، ص٦٧و٧٧.

[9] هەمان سەرچاوە، ل ١٠٨.

[10] الامم المتحدة، اللجنة الاقتصادية لجنوب غرب اسيا(المكتب السكاني)، الجمهورية العراقية، كراسة لدراسة احوال السكان، بيروت، ١٩٨١، ص١٤.

[11] صفوح خير، التحضر في الجمهورية العربية السورية، من كتاب((التحضر في الوطن العربي))، الجزء الاول، القاهرة، ١٩٧٨، ص٢٧٥.




# پرۆژەی گاپ و کاریگەریی لەسەر مەسەلەی کورد لەتورکیا

ئارام عەلی عەزیز*

ئەم لێکۆڵینەوەیە زیاترو پێش هەموو شتێك بۆ ئەوە تەرخان کراوە کەکاریگەریی پرۆژەی گاپ لەسەر مەسەلەی کورد لەتورکیا شی بکاتەوەو لەم سۆنگەیەوە ناچێتە سەر ئەو لایەنەی کەبەندە بەگرنگیی ئەم پرۆژەیەو کاریگەریی لەسەر ململانێی سیاسیی تورکیا لەگەڵ هەر یەك لەعیراق و سوریا کەپرۆژەکە وا دەکا تورکیا لەڕوی کۆنترۆڵ کردنی ئاوی هەردو روباری دجلەو فوراتەوە داشی بەسەریانەوە سوار بێ، بۆیە لێکۆڵینەوەکە ئەم لایەنە، سەرەڕای گرنگیی، فەرامۆش دەکاو زیاتر بایەخ بەو ئاماژە سیاسییە ناوخۆیییانە دەدا کە لەپشت دامەزراندنی پرۆژەکەوەن.

## ١-کورد: تێڕوانینێکی سیاسی-ئابوری

لەتورکیا نەتەوەی کورد لەڕوی ژمارەوە پاش نەتەوەی تورك دێ، بەڵام سەرژمێرەکانی دانیشتوان تائێستا داتاکانی ئەم پێکهاتەیان بەوردی دەرنەخستوەو تائێستا ژمارەی نەتەوەی کورد لەتورکیا پشت بەمەزەندەکاری دەبەستێ و مایەی مشتومڕیشە.

بەپێی مەزەندەکارییەکانی کۆمیسیۆنی کۆمەڵەی گەلان کەساڵی ١٩٢٥ بەتایبەت بۆ یەکلایی کردنەوەی چارەنوسی ویلایەتی موسل پێکهێنرا بوو، ژمارەی کورد لەتورکیا گەیشتۆتە ١,٥ ملیۆن[١]، لەکاتێکدا سەرژمێری ساڵی

* لێکۆڵیار لەسەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان.

١٩٢٧ی تورکیا کەدانیشتوانی لەسەر بنەمای زمانی دایك پۆلین کردوە، ژمارەی کوردی بە ١,١٨٤,٠٠٠ کەس، واتە دەوروبەری ٩٪ ی سەرجەمی دانیشتوان، مەزەنە کردووە[٢]. بەڵام سەرژمێرە فەرمییەکانی تورکیا لەم رووەوە جێی باوەڕ نین چونکە تورکەکان پاش سەرکوت کردنی شۆڕشەکەی ساڵی ١٩٢٥ ی شێخ سەعید پیران کەوتنە شێواندنی راستیە دیموگرافییەکانو زیادکردنی ژمارەی تورك لەناوچە کوردنشینەکاندا[٣].

بەڵام ئەمڕۆ زۆربەی سەرچاوە بێلایەنەکان سەبارەت بەژمارەی کوردی تورکیا ژمارەیەك دەخەنە بەرچاو کەکەوتۆتە نێوان ١٢-١٤ ملیۆن و[٤] کورد لانی کەم لەهەشت ویلایەتدا کەبریتین لەویلایەتەکانی ئاگری، بنگول، بتلیس، دیاربەکر، هەکاری، ماردین، سیرتو وان زۆرینەی رەهای دانیشتوان پێکدێنن[٥].

راگەیاندنی کۆماری تورکیا لەساڵی ١٩٢٣دا لەسەر دەستی مستەفا کەمالو دەست کردن بەپرۆسەی بەرۆژئاوایی کردنی تورکیاو مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵەکەی بەپێی سیاسەتی ناوخۆییو دەرەکیی مستەفا کەمالو جێ نشینەکانی، کاریگەرییەکی وەهای هەبو کەتەنها بەوە دانەکەوت کەتورکیاو تورکەکانی گرتەوەو وای کرد بکەونە نێوان رەگو ریشەی رۆژهەڵاتییانەو سیاسەتی بەرۆژئاوایی کردن، بەڵکو هەروەها کاریگەریی لەسەر کوردیش بەجێ هێشت چونکە ئەم سیاسەتە لەناوچەکانی رۆژهەڵاتی تورکیا ئێجگار بەسەختی لەلایەن خێڵە کوردەکانەوە بەرهەڵستی کرا[٦] بەتایبەتی کە کەمالیستەکان شتێکی وایان نیشان نەدا کەئاماژە بێ بەئامادەبونیان بۆ سەلماندنی مافە نەتەوەیییەکانی کوردو لەم بوارەدا مۆرکردنی پەیمانی لۆزان ساغی کردەوە کەتورکیای کەمالیست بەنیاز نیە مافەکانی کورد بسەلمێنێ.

یەکەم رەنگدانەوەی رەتکردنەوەی سیاسەتە تازەکەی تورکیا پاش مۆرکردنی پەیمانی لۆزان، لەساڵی ١٩٢٥دا دەرکەوت، کاتێك شۆڕشێکی بەربلاو بەسەرکردایەتیی شێخ سەعیدی پیران لەکوردستان هەڵگیرسا. ئەگەرچی ئاین رۆڵێکی دیاری لەم شۆڕشەدا هەبوو و گەڕاندنەوەی خەلافەتی ئیسلامی دروشمێکی سەرەکیی شۆڕشەکە بوو بەڵام ناکرێ نکوڵی لەرۆڵی هەستی

کوردایەتی لەهەڵگیرساندنی شۆڕشەکەدا بکرێ[7]. پاش سەرکوت کردنی شۆڕشەکە، هێزەکانی تورك کەوتنە وێزەی دانیشتوانی بێ گوناهو لەماوەی ساڵانی ١٩٢٥-١٩٢٦دا سەدان گوند وێران کران، هەزاران خانو گڕیان تێ بەردراو سەدان هەزار ژنو منداڵو پیر کوژران[8].

ئەگەرچی کورد لەتورکیا زۆرینەی دانیشتوانی ویلایەتەکانی ناوچەی باشوری رۆژهەلاتی ئەناتۆلیاو بەدرێژایی سنوری تورکیا لەگەڵ هەر یەك لەسوریاو عیراق‌و ئێران پێکدێنێ، بەلام ئەمە نەبوە رێگر لەبەردەم کەمالیستەکان بۆ ئەنجام دانی ئەم تەگبیرانە:

١-گوناهبارکردنی هەندێ گەل وەك کوردو عەرەب‌و ئەرمەن بەوەی کەبونەتە هۆی شکستی دەوڵەتی عوسمانی لەجەنگی یەکەمی جیهاندا[9].

٢-راگواستنی کورد لەئەناتۆلیاو ویلایەتەکانی رۆژهەلاتەوە بەرەو ویلایەتەکانی ناوەڕاست‌و رۆژئاوای ولات‌و گرتنەبەری سیاسەتێکی توندتر بۆ لەناوبردن‌و تواندنەوەی کورد لەساڵی ١٩٣٠ بەولاوە[10]. ئەمەش لەهەلومەرجێکدا رویدا کەتێیدا تورکیا ناوچە کوردنشینەکانی بەناوچەی قەدەغەکراو راگەیاندو رێگای بەکەس نەدا هیچ جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ کورددا دابمەزرێنێ[11].

تورکیا بۆ بەیاسایی کردنی مەسەلەی راگواستنی کورد، لەساڵی ١٩٣٤دا یاسایەکی تایبەتی دەرکرد کە بەهۆیەوە هەر کسێك کەزمانی زگماکی تورکی نەبێ، دەشێ لەبەر هۆکاری سەربازی یان سیاسی یان کەلتوری یان ئەمنی، رابگوێزرێ بۆ ناوچەی تر ئەگەر وەزارەتی ناوخۆ وای دانا کەئەم راگواستنە بۆ بەرژەوەندیی ولات شتێکی پێویستە[12].

٣-بەئەنقەست هێشتنەوەی ناوچە کوردنشینەکان بەدواکەوتویی، ئەویش لەبەر رۆشنایی‌ی ئەو تیۆرییەی کەگوایە چەند ئەو ناوچانە دواکەوتوو بن ئەوەندە هەستی خۆجیاکردنەوەیان تێدا کەم دەبێتەوەو زیاتریش بەناوچە پێشکەوتووە تورك نشینەکانەوە دەبەسترێنەوە. بەم پێیە، زۆربەی هەرە زۆری پیشەسازییە گرنگەکان لەناوچەکانی رۆژئاوا دامەزران بەرادەیەك کەتەنها لەچەند ناوچەیەکی

وەك ئەنقەرەو ئیزمیرو ئیستانبول‌و هاتای دەوروبەری ٤٠٪ ی بەرهەمی پیشەسازی جێگیر کران[١٣]. لەئاکامی ئەم سیاسەتەدا پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنانی دەرەبەگانە لەناوچە کوردنشینەکاندا رەگیان داکوتاو لەم سۆنگەیەوە تێکەڵەیەك لەکەلتوری خێڵەکی-دەرەبەگایەتی‌و تویژێکی زەویداری دەرەبەگ خۆی بەسەر ناوچە کوردنشینەکاندا سەپاند[١٤].

ئیدی تا کۆتایی‌ی ساڵانی هەشتای سەدەی رابردو هیچ گۆڕانێکی جەوهەری‌ی ئەوتۆ بەسەر هەڵوێستی فەرمیی تورکدا بەرامبەر بەکورد نەهات‌و هەروەها هیچ گۆڕانێکی ئابوریی جەوهەری بەسەر پەیوەندییەکانی کارو بەرهەم هێناندا لەنێو خودی کورددا نەهات. بێگومان ئەمەش لەسەر تەواوی ناسنامەی کورد لەتورکیا رەنگی دایەوە. تا ئەو کاتە دو هێڵی پێك نەگەیشتوی هاوتەریب، کەیەکێکیان هێڵی فەرمیی تورك بوو و ئەوی دیکەیان هێڵی کورد بوو، لەئارادا بوون‌و هەر یەکێکیان گوزارشتی لەهەڵوێستی خۆی لەدژی لایەنەکەی تر دەکرد بەبێ ئەوەی پێشبینی‌ی هیچ جۆرە سازش‌و ساتوسەوداو لێك نزیك بونەوەیەك لەنێوانیاندا بکرێ.

هێڵی فەرمیی تورك لەسەر هەڵوێستەکانی پێشوی خۆی بەردەوام بوو کەدرێژەپێدانی ئەو بۆچونە سواوە بون کەگوایە کورد لەتورکیا نیەو ئەوەی هەیە تورکی کێوییەو گوایە لەتورکیا مەسەلەیەك بەناوی مەسەلەی کوردەوە نیە. ئەم هەڵوێستەش هەم لەسەر ئاستی حزبی دەسەڵاتدار بوو هەم لەسەر ئاستی فەرمیی دەوڵەت‌و گوزارشتی لەدرێژەپێدانی سیاسەتی تواندنەوەی کورد لەناو بۆتەی تورکدا دەکرد. لەساڵانی سی‌ی سەدەی رابردودا رۆژنامەی ((تان)) سەبارەت بەهەوڵەکانی دەوڵەت بۆ تورکاندنی کوردی ناوچەی دەرسیم نوسیبوی ((مەسەلەی تورکاندنی خێڵە کوردەکان هێشتا لەقۆناغی سەرەتایی دایە بەتایبەتی کەدەستێوەردانی زۆر کەس تا رادەیەك مەسەلەکەی ئاڵۆز کردوە))[١٥].

حزبە گەورەکانی تورکیا زۆربەی هەرە زۆریان دیدی شۆڤێنیستی‌یان بۆ مەسەلەی کورد هەبوو و لەم روەوە دەشێ ئاماژە بۆ پرۆگرامی پارتی عەدالەت بکرێ کەباس لەوە دەکا کەئەندامەکانی ((دژی ئەو بزوتنەوانە دەوەستنەوە

کەدەڵێن گوایە گەلی تورکیا) لەڕوی ڕیشەی نژادیو کەلتورو دینو دابو نەریتی خۆماڵییەوە جیاوازیی تێدایە)) (خاڵی ٩) و لەبەر ڕۆشنایی نەتەوایەتیی تورك دا ئەم حزبە بانگەشە بۆ ((نەتەوەی مەزنی تورك)) دەکا (خاڵی ١١)[١٦].

هەر بەهەمان پێودانگ پارتی گەلی کۆمار کە لەسەردەمێکدا یەکێ لەگەورەترین حزبەکانی چەپی میانڕەو بوو، لەپرۆگرامەکەیدا دەیگوت ((پارتی گەلی کۆمار دان بەجیاوازیی ڕەگەزی لەنێوان هاوڵاتییە تورکەکاندا نانێو دژی ئەو بزاڤانە دەوەستێتەوە کەهەوڵ دەدەن بە مەبەستی لەق کردنی یەکپارچەیی نەتەوەییو یەکپارچەیی خاکی دەوڵەتی تورکیا، سود لەجیاوازییە ڕەگەزییەکانی وەرگرن))[١٧].

بەهەمان شێوە، پاش یەکەم کودەتای سوپا لەساڵی ١٩٦٠دا، جەنرال گورسیل رابەری تازەی تورکیا لەلێدوانێکدا بۆ ڕۆژنامەیەکی سویدی، سەبارەت بەجموجۆڵی کورد، وتی ((ئەگەر ئەو چیاییانە بۆ خۆیان ئارام دانەنیشن، سوپا هیچ کەمتەرخەمییەك لەلێدانی شارو گوندەکانیان ناکاو وەك ئەو کوشتارەی کە لەمەوبەر بەخۆیانو ولاتەکەیانەوە تارومار کردن، ڕوبەڕوی کوشتارێکی تر دەبنەوە))[١٨].

دیارە زۆربەی ڕەهەندە سیاسییەکان ترسێکی زۆریان لەجیابونەوەی کورد لێ نیشتوەو لەم ڕوەوە سلێمان دیمیریلی سیاسەتمەداری دێرینی تورکیا بەزێدەڕۆییەکی زۆرەوە وتویەتی کە ((ئەگەر کورد جیا ببنەوە، دەوڵەتی تورکیا هەرەس دێنێ))[١٩]. تەنانەت چەپە مارکسیستەکانیش دیدێکی دۆستانەیان بۆ مەسەلەی کورد نەبوەو لەم ڕوەوە محەمەد عەلی بایار، سەرۆکی پارتی کرێکارانی تورکیا، لەساڵی ١٩٦٧دا لەکۆنفرەنسێکی نێودەوڵەتیدا لەستۆکهۆڵم ڕایگەیاند کە ((مەسەلەی کورد لەتورکیا نیە))و تەنها پاش ئەوەی لەکۆتاییی ساڵی ١٩٦٩دا بایار لابراو کوردێك بەناوی محەمەد عەلی ئەسلانەوە چوە جێی، حزبەکە لەکۆنگرەی چواری ساڵی ١٩٧٠ دا دانی بەوەدا نا کە ((گەلی کورد لەناوچەکانی ڕۆژهەلاتی تورکیا هەیە)) بەلام سەرەڕای ئەم هەڵوێستە دۆستانەیە

حزبەکە سەبارەت بەمەسەلەی کورد بەو ئەنجامە نەگەیشت کەمافی چارەی خۆنوسین بۆ کورد بسەلمێنێ یاخود داوای ئۆتۆنۆی بۆ گەلی کورد بکا[20].

هێلەکەیتر هێلی کوردە کە بۆ بەدەست هێنانی مافە نەتەوەییە زەوتکراوەکان خەباتی کردوەو دەکاو خۆی لەچەند رێچکەو رێوشوێن و رەهەندێکدا دەنوێنێ، ئەویش بەجۆرە:

١-پێکهێنانی یانەی کۆمەلایەتی و گروپی رۆشنبیر بۆ بلاوکردنەوەی بیروباوەری نەتەوایەتی بەشێوەیەکی ئاشتییانە.

٢-پێکهێنانی حزبی سیاسیی نهێنی بۆ رێکخستنی هێزو تواناکانی گەلی کوردو بەکارهێنانی رێوشوێنی ئاشتیخوازانە بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد لەتورکیا.

٣-پێکهێنانی حزبی سیاسیی نهێنی و باوەڕ هێنان بەوەی کەتاکە رێوشوێن بۆ رزگاریی کوردستان بەکارهێنانی زەبروزەنگ و هەلگیرساندنی شۆرشە. گرنگترین و سەرەکیترین نوێنەری ئەم رەهەندەش پارتی کرێکارانی کوردستان (پەکەکە) بوو. لەم سۆنگەیەوە کەئەم حزبە زۆرترین کاریگەریی لەسەر مەیدانی سیاسیی کوردستانی تورکیا بەجێ هێشتوە، هەول دەدەین چەردەیەك زانیاریی لەبارەیەوە بخەینە بەرچاو.

یەکێ لەگرنگترین رەهەندەکانی ناو بزوتنەوەی کوردایەتی، رەهەندی چەپی رادیکالی مارکسیست بوو[21]. لەکۆتاییی سالی ١٩٧٨دا لەکۆبونەوەیەکدا لەگوندی فیس کەگوندێکە سەر بەقەزای لجێ لەویلایەتی دیاربەکر، پەکەکە لەسەر دەستی عەبدوللا ئۆجەلان دامەزرا[22]. پاش ئەوەی هێزەکانی تورك تەنگیان پێ هەلچنی، پەکەکە بریاری دا سەرکردایەتییەکەی بباتە سوریا.

لە ١٩٨١دا پەکەکە بریاری دا ریزەکانی یەك بخاتەوەو لەناوخۆدا چالاکی بنوێنێ. لەئابی ١٩٨٢دا لەدیمەشق دووەم کۆنگرەی گرێداو هەندێ لەئەندامەکانی خۆی بەشێوەی گروپی چەکدار بۆ ناو کوردستان ناردەوەو لەسالی دواتردا سەدان پێشمەرگەی لەهەرێمی بۆتان جێگیر کرد. ئیدی پاش ئەوەی لەخۆی دلنیا بوو، لە ١٥ی ئابی ١٩٨٤ هێزی رزگاریی کوردستانی پێکهێناو خەباتی چەکداری راگەیاند[23].

ئەو کاتەی پەکەکە دەستی بەخەباتی چەکدار کرد، تەنها دو سەد پێشمەرگەی هەبوو بەڵام تا گەیشتە ساڵی ١٩٩٣، بوو بەخاوەنی ١٠ تا ١٥ هەزار پێشمەرگە[٢٤]. لەمارتی ١٩٨٥دا پەکەکە رێکخراوێکی تری دروست کرد بەناوی ئەرتەشی رزگاریی گەل کە بەکردەوە بەباڵی سوپایی‌ی حزبەکە دادەنرا[٢٥].

بەپێی هەندێ سەرچاوە، لەئاکامی شەڕو پێکادانی کوردستانی باکوردا، تا مانگی مارتی ١٩٩٣ ژمارەی کوژراو گەیشتۆتە هەشت هەزار کەس لەتورکیا[٢٦]. ئەو جەنگەی کە پەکەکە لەدژی تورکیا هەڵیگیرساند، تەنگژەیەکی زۆری بۆ ئابوریی تورکیا پێك هێنا چونکە جەنگەکە ساڵانە هەشت ملیار دۆلار لەسەر تورکیا کەوت[٢٧].

پەکەکە لەرەوتی هەڵسوڕانی سیاسی‌یدا دوچاری هەڵەیەکی زۆر بوو، بەتایبەتی لەو روانگەیەوە کەئەم حزبە خۆی بەتاکە ئەلتەرناتیڤی هەمو گروپەکانی بزوتنەوەی کوردایەتی لەسەرانسەری کوردستاندا دادەناو هەندێ رێوشوێنی وای لەخەباتدا گرتە بەر کەدواتر بەهۆیەوە ناوی تیرۆریستی بەسەردا دابڕا، جگە لەوەی کەئەم حزبە پاش گیرانی سەرۆکەکەی لەساڵی ١٩٩٩داو پاش ئەوەی سەرۆکەکەی لەکاتی دادگایی کردندا ئەو خۆڕاگری‌و جەربەزەیی‌یەی نەنواند کە لێی چاوەڕوان دەکرا، وردە وردە لەبیروباوەڕەکانی خۆی پەشیمان بۆوەو ناوی خۆی گۆڕی‌و دواتریش توشی تەنگژەی ناوخۆیی‌ی دژوار هات.

## دووەم: پرۆژەی گاپ

کاتێك لەپرۆژەی گاپ دەکۆڵینەوە، دەبێ بایەخ بەدو دیدی سەرەکی بۆ ئەم پرۆژەیە بدەین.

یەکەمیان: دیدێکی دەرەکییەو پەیوەندیی بەکاریگەریی پرۆژەکەیە لەئایندەدا لەسەر ئایندەی داهاتی ئاوو کشتوکاڵ‌و نەخشەکانی پەرەپێدان لەسوریاو عیراق پاش بەئەنجام گەیشتنی پرۆژەکە لەتورکیا کە بەدەوڵەتی سەرچاوە دەژمێردرێ. ئەمە هەموی لەلایەك‌و کاریگەریی پرۆژەکە لەسەر ئایندەی بەرهەمی کشتوکاڵ‌و شێوەو سەرچاوەکانی بەکاربردن لەتەواوی ناوچەی

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لەلایەکی ترەوە. دیارە ئەم مەسەلەیە کاری بەسەر بابەتی سەرەکیی ئەم توێژینەوەیە نیە بەڵکو پەیوەندیی بەگیروگرفتێکی ئیقلیمیەوە هەیە کەدەکرێ لەتوێژینەوەیەکی سەربەخۆدا لێی بکۆڵرێتەوە.

دوەمیشیان، دیدێکە پەیوەندیی بەئاسەوارە سیاسیو دیموگرافیەکانی ناوخۆی تورکیاوە بەشێوەیەکی گشتی هەیەو ناوچەی پرۆژەکە بەشێوەیەکی تایبەت، بەتایبەتی کاریگەریی لەسەر ئایندەی مەسەلەی کورد. ئەمەش ئەو بابەتەیە کەئەم توێژینەوەیەی بۆ تەرخان کراوە.

ناوچە کوردنشینەکان لەزەمانی مستەفا کەمالەوە فەرامۆش کراون. لەتورکیا ((سیاسەتێك بۆ بەزۆر تورکاندنی کورد پەیڕەو کرا، کورد لەدنیای هەندەران جیا کرایەوەو ڕێ نەدرا هیچ گۆڕانێکی گرنگی کۆمەڵایەتی لەکوردستاندا ڕوو بدا چونکە تورکیا لەو بڕوایەدا بوو کەتورکاندنی گەلێکی نەزانو بەجێماوو پاشکەوتو لەتورکاندنی گەلێکی ڕوناکبیرو پێشکەوتو ئاسانترە. هەر لەسەر ئەم بنچینەیە، ناوچە کوردنشینەکان پشت گوێ خرانو بایەخ بەپەرەسەندنی ناوچەکانی ناوەندو ڕۆژئاوا درا))[28].

بەکارهێنانی ئابوری بۆ نەهێشتنی کوردایەتی کە لەلای ناسیۆنالیستە توندڕەوە تورکیستەکان ئامرازێك بوو بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد لەدیدی تورکیستیەوە، زیاتر بۆ سەردەمی حوکمڕانیی عیسمەت ئینونو دەگەڕێتەوە، کاتێك ئابدین ئۆزمانی پشکنەری گشتیی ناوچەی یەك لەڕاپۆرتێکدا بۆ وەزارەتی ناوخۆ سەبارەت بەپرۆسەی تواندنەوەو تورکاندنی کورد نوسیبوی ((پێویستە دەسەڵاتی ئابوری تەنها بۆ ئەو کەسانە بسەلمێنرێ کە بەیەکجارەکی وازیان لەکوردایەتی هێناوە))[29].

تا ساڵانێکی دورو درێژ تورکیا دانی بەوەدا نەدەنا کەگەلێك بەناوی گەلی کوردەوە لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتدا هەیەو ڕای فەرمی لەو دەورو خولە دەسوڕایەوە کەمەسەلەی کورد ڕوخسارێکی جوگرافی-ئیقلیمیی هەیەو کرۆکی مەسەلەکە مافی سیاسیی کورد نیە بەڵکو دواکەوتنی کۆمەڵایەتیە کەگوایە ئەم

مەسەلەیە بەتەرخان کردنی بەرنامەیەکی ئابوریی پوخت بۆ پێشخستنی ناوچەکە دەکرێ چارەسەر بکرێ.

ئەم بۆچونە خۆی لەخۆیدا پاشگەزبونەوەیە لەبۆچونە دێرینەکە کەوای دانابو هێشتنەوەی ناوچە کوردنشینەکان بەدواکەوتویی، کۆتایی‌ی بەمەسەلەی کورد دێنێ بەڵام دواتر دەرکەوت کەچەند ناوچە کوردنشینەکان بەدواکەوتویی بمێننەوە ئەوەندەش ناتوانن تێکهەڵکێشی تورکیای پێشکەوتوو بن‌و لەئەنجامدا دابڕانێکی شارستانی لەنێوان گەلی کوردو تورکیا پەیدا دەبێ‌و ئەمەش دەبێتە مایەی سەقامگیرکردنی هەستی جیاخوازی لەنێو کورددا.

لەم چوارچێوەیەدا تورگوت ئۆزال نەرمی‌یەکی زۆری بەرامبەر بەمەسەلەی کورد نواندو هەوڵی دا ڕێوشوێنی تر بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد جگە لەڕێوشوێنی سەرکوت کردن بگرێتە بەر. لەم ڕووەوە ئۆزال وتویەتی ((ئێمە پێمان وایە پڕۆژەی ئەناتۆلیای باشور-ڕۆژهەڵات لەڕوی کۆمەڵایەتی‌و سودی ئابوریی‌یەوە بایەخێکی زۆری هەیەو وای دەبینین کەئەرکی نیشتمانیمان ئەوەیە کەهەمو تەگبیرێکی پێویست بۆ جێبەجێ کردنی ئەم پڕۆژەیە لەکورتترین ماوەدا بگرینە بەر))[30].

لێرەدا دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ کە لەمەوبەریش هەندێ پڕۆژە بۆ پەرەپێدانی ناوچەکانی کوردستان لەلایەن ئەنقەرەوە دارێژرا بون بەڵام هیچیان بەقەد پڕۆژەی گاپ بایەخیان پێ نەدراوە.

ئاشکرایە کە تا ئێستا بەهۆی بایەخ نەدانی تورکیا بەناوچە کوردنشینەکان، ئابوریی ئەو ناوچانە بەچاکی تێکهەڵکێشی ئابوریی تورکیا نەبوە. لەسەرەتای ساڵانی حەفتای سەدەی ڕابردوودا تەنها ٤٪ ی دانیشتوانی کورد بەپیشەسازییەوە خەریك بون‌و ٩٠٪ بەکشتوکاڵ، لەکاتێکدا لەناوچەکانی تری تورکیا ٧٤٪ی خەڵکی خەریکی کشتوکاڵ‌و ١٠٪ خەریکی پیشەسازی بون‌و لەسەرانسەری ناوچە کوردنشینەکاندا تەنها ٦,٨٪ ی دامودەزگاکان یاسای کارکردنیان تێدا پەیڕەو کراوە[31].

لەزۆر بۆنەدا هەمیشە وا باس کراوە کەیەکێ لەهۆکانی پشتیوانیی دانیشتوانی ناوچە کوردنشینەکان لەخەباتی چەکدار لەدژی تورکیا ئەوەیە کەباشوری رۆژهەڵاتی تورکیاو ناوچەکانی رۆژهەڵات بەشی هەرە پاشەکەوتوی وڵاتن، لەکاتێکدا کەرۆژئاوای تورکیا وڵاتێکی پیشەسازییە لەچاو رۆژهەڵاتی تورکیا کەئاوێنەی بەرچاوی وڵاتێکی دواکەوتووە[32].

تورکیا پرۆژەی گاپی بە بەشێك لەو سیاسەتە دادەنا کەئامانجەکەی نەهێشتنی نارەزاییەیە لەنێو کورددا و هەر بەم پێیە وای دانابو کەگیروگرفتی کورد لایەنێکی ئابوریی هەیە کەئەگەر چارەسەر کرا، بەشێکی زۆری مەسەلەکەش لەگەڵیدا چارەسەر دەکرێ[33].

ناوچەی پرۆژەکە ٩ ویلایەت دەگرێتەوە کەئەمانەن: نادیەمان، باتمان، دیاربەکر، گازی عەنتاب، کیلیس، ماردین، سیرت، شانلی ئورفەو شیرناخ. دارایی‌ی گشتیی پرۆژەکە ٣٢ ملیار دۆلارە. روبەری پرۆژەکەش ٧٥٣٥٨ کیلۆمەتری دوجا دەبێ، واتە ٩,٧٪ ی روبەری تورکیا دەگرێتەوە[34].

پرۆژەکە بەتێکڕایی و بەهەمو داموو دەزگاکانییەوە، لە ٢١ بەنداوو ١٧ وێستگەی بەرهەم هێنانی وزەی کارەبا پێکدێ[35]. پرۆژەکانی ئاودێری کەبەهۆی گاپەوە پەیدا دەبن ١,٦ ملیۆن هکتار ئاو دەدەن، سەرباری ٢٠٠ هەزار هکتار لەئورفەو ٤٠٠ هەزار هکتار لەرۆژهەڵاتی نسەیبین. رێژەی تێکڕای ئەو زەوییەی کەپرۆژەکە ئاوی دەدا دەگاتە ٢٦,٩٪ ی ئەو زەوییەی کە لەتورکیا ئاو دەدرێ[36].

لەپرۆژەکەدا بەنداوی ئەتاتورك بەبڕبڕەی پشتی تەواوی پرۆژەکە دادەنرێ و لەم روەوە بەپێنجەم بەنداو لەجیهاندا دادەنرێ. هەروەها تونێلی ئورفە لەگرنگترین داموو دەزگاکانی بەنداوەکەیەو بەهۆیەوە ئاوی روباری فورات دەگەیەنرێتە دەشتەکانی ماردین و هاران کەکەوتونەتە دەرەوەی حەوزی فورات و لەم روەوە تونێلی ئورفە لەدوو تونێلی هاوتەریب پێکدێ کەدرێژیی هەر یەکێکیان ٢٨کلم دەبێ و بەمە بەدرێژترین دو تونێل لەجیهاندا دادەنرێن[37].

بەڵام دەبێ ئاماژە بۆ ئەوەش بکرێ کەهەندێ لەپرۆژەکان لەوانەی کەدواتر خرانە پاڵ پرۆژەی گاپەوە، لەساڵانی حەفتاوە دەست بەئەنجامدانیان کراوە وەك

بەنداوی کەبان کەساڵی ١٩٧٤ بەئەنجام گەیشتو بەنداوی ئەتاتورک کەساڵی ١٩٨٣ دەست بەکارکردن تێیدا کرا. سەبارەت بەبەنداوی ئەتاتورك، خەرجی‌ی مەزەندەکراوی ئەم بەنداوە بە ٤,٥ ملیار دۆلار دادەنرێ. ((ئەم پرۆژەیە لێی رادەبینرێ پەرە بەکشتوکاڵ بدا لەبەشە تورکیایی‌یەکەی میسۆپۆتامیاو ٧٢٠ هەزار هکتار زەوی ئاو بدات))[٣٨].

جگە لەو هەمو قازانجەی کەپرۆژەکە لێی دەکەوێتەوە، پرۆژەکە زیانیشی لێ کەوتۆتەوە. لەوانە ئەوەیە کەئەم پرۆژەیە بۆتە هۆی دورخستنەوەی پەنجا هەزار کەس لەگوندە بچوكو هەژارەکانی هەرێمی ئورفە کەزەوی‌و زاریان بەهۆی دروستبونی دەریاچەوە لەپانتایی‌ی ٩٤٠ کلم٢، کەوتە ژێر ئاوەوە[٣٩]. هەروەها لەناوچەی بەنداوی کەبان ٢٥ هەزار هاوڵاتیی کوردو لەناوچەی بەنداوی قەرەقایا کەساڵی ١٩٨٧ تەواو بوو، ١٧ هەزار هاوڵاتی راگوێزران، سەرباری ١١٧ گوند لەناوچەی شانلی-ئورفە[٤٠]. جگە لەوانە، بیست هەزار کەسی تر لەناوچەی بەنداوی قەرەباباو ٥٠ هەزاری تر لەدەریاچەی بەنداوی ئەتاتورك ئاوارە بون[٤١].

ئەو دەریاچانەی کە لەئەنجامی ئەم پرۆژەیەدا پێك هاتن، چەندین ناوچەی ئاوەدانی کوردنشینیان خستە ژێر ئاوەوە وەك شارۆچکەی سامساتو شارۆچکەی هسکیف[٤٢].

بەڵام سەرەڕای هەمو شتێ، دەبێ دان بەوەدا بنرێ کەقازانجی پرۆژەکە زۆر لەزیانەکانی زۆرترە.

## سێیەم: گاپ لەئامرازی هەڕەشەوە بۆ ئامرازی خزمەت

تا ساڵی ١٩٩١ پەیوەندیی نێوان کوردو حکومەتی ئەنقەرە پەیوەندییەکی بەزۆری گرژو نادۆستانە بوو بەڵام لە ١٩٩١ بەدواوە هەست بەسەرەتای گۆڕانێك بەرامبەر بەکورد لەتورکیا دەکرێ. لەنیسانی ئەو ساڵەدا پەرلەمانی تورکیا دو بڕیاری زۆر گرنگی دەرکرد:

یەکەمیان بڕیاری ئازادکردنی پێکهوەنانی حزبو لابردنی هەمو کۆتو زنجیرەکانی بەردەم پێکهوەنانی حزب بوو کەجاران لێ ندەگەڕا حزبی سیاسی لەسەر بنەمای ئاینی یان چینایەتی دابمەزرێ.

دوەمیشیان بڕیاری لابردنی قەدەغەی بەکارهێنانی زمانی کوردی بوو لە ٢٢ی نیسانی ١٩٩١دا کەبەسەرەتای کرانەوەی حکومەتی تورکیا بەرامبەر بەکوردو ڕێ خۆش کردن بۆ ئاسایی کردنەوەی پەیوەندیی نێوان کوردو تورکیا دادەنرێ.

هاوتا لەگەڵ ئەم دو بڕیارەدا، حکومەت هەزاران گیراوی کوردی ئازاد کرد کە لەئەنجامدا تورگوت ئۆزال ناوبانگێکی زۆری پەیدا کرد[٤٢].

هەروەها لەسەرەتای ئەم سەدەیەشدا لەسۆنگەی هەوڵی بێ وچانی تورکیا بۆ وەرگیران لەیەکێتیی ئەوروپاو ئامادەبونی بۆ پراکتیزەکردنی پێوەرەکانی کۆپنهاگن سەبارەت بەچارەسەرکردنی کێشەی کەمینەکانو لەسۆنگەی نەرمیی پارتی دادو پەرەپێدانەوە کەرەجەب تەیب ئەردوغان رابەرایەتیی دەکا، کورد لەسەر ئاستی یاسایی و کەلتوری و سیاسی دەستکەوتی زیاتری بەدەست هێناو ئومێد هەیە لەمەولاش دەستکەوتی زیاتر بەدەست بهێنێو گوزەرانێکی باشتر لەسایەی پەرەسەندنی دیموکراسیو چاکبونی باری ئابوریدا بەخۆیەوە ببینێ.

لەم سۆنگەیەوە، ئەستەمە تورکیا بەچاوی جاران سەیری پرۆژەی گاپ بکاو وای دابنێ کەپرۆژەیەکە زیاتر کوردی پێ تێکهەڵکێش دەکرێ لەگەڵ تورکو دەبێتە مایەی تورکاندنی.

ئەم پرۆژەیە جاران ترسی ئەوەی لەلای کورد پەیدا کردبوو کەدەشێ ببێتە هۆی گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی ناوچە کوردنشینەکانو وەك ئامرازێك لەلایەن حکومەتی تورکیا بەکار بهێنرێ بۆ نیشتەجێ کردنی ژمارەیەکی زۆری تورك لەناوچە کوردنشینەکاندا. بەڵام ئەو سیاسەتانەی کە لەسەرەتای ساڵانی نەوەدی سەدەی رابردووەوە لەتورکیا پیادە دەکرێن، لەگەوهەردا گوزارشت لەپەشیمانبونەوەی تورکیا لەهەوڵی تورکاندنی کورد دەکەن. بەم پێیە، ترسی

کورد لەم پرۆژەیە ڕەوبوەتەوەو ئێستا وەك پرۆژەیەك بۆ بوژاندنەوەی باری ئابووریی کوردستان تەماشا دەکرێ.

پرۆژەکە، بەو هەموو دەزگایەی لەسەر دجلەو فورات دامەزراون، دەبێتە هۆی بوژاندنەوەی ناوچەکەو لەڕووی بەرهەم هێنانی وزەی کارەباوە دەتوانێ ٧٥٥٧ میگاوات وزەی کارەبا بەرهەم بێنێ[44]. هەروەها پێشبینی دەکرێ ئاستی داهاتی ناوچەکە بۆ پێنج بەرابەر زیاد بکات. هەر لەم ڕووەوە هەندێ لەسەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن پرۆژەکە لێی رادەبینرێ توانای دابین کردنی هەلی کار بۆ ٣.٥ ملیۆن کەس ئەنجام بدات[45].

## کۆبەند

مەسەلەی کورد لەتورکیا مەسەلەیەکی دێرینە. سیاسەتی تورکیا سەبارەت بەهێشتنەوەی کوردستان بەدواکەوتویی سەرەنجامی خراپی لێ کەوتوە چونکە بەو مەبەستە نەگەیشت کەتورکیا دەیویست و کورد توانی سەرەڕای هەموو زەبروزەنگ و چەوسانەوەیەك خۆی ڕاگرێ و ناسنامەی نەتەوەیی خۆی لەدەست نەدات.

بەم پێیە، سیاسەتی دێرینەی تورکاندن کەپاش دامرکاندنەوەی شۆڕشی ١٩٢٥ی شێخ سەعید پیادە کرا، لەسەرەتای ساڵی ١٩٩١دا کۆتایی پێ هات، ئەویش بەگۆڕانی دیدی تورکیا بۆ مەسەلەکەو ڕێدان بە بەکارهێنانی زمانی کوردی.

ئەو تیۆرییەش کەبۆ ماوەی زیاد لەدە ساڵ بەگەرمی لەئارادا بوو کەگوایە مەسەلەی کورد لەتورکیا لەگەوهەردا مەسەلەی دواکەوتنی گشتییەو ئەگەر چارەسەری ئەو لایەنە بکرێ، مەسەلەکە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بەچارەسەر دەگات، جێی سیاسەتەکەی پێشوی گرتەوە کەبریتی بوو لەسیاسەتی بەئەنقەست هێشتنەوەی کوردستان بەدواکەوتویی.

تورکیا لەڕەوتی سیاسەتێکی نوێدا هەوڵیدا لەڕێگای پرۆژەی گاپەوە چارەسەری مەسەلەی کورد بکات، ئەوەش لەو دیدەوە کەچارەسەرێکی ئابووری بۆ

مەسەلەکە بدۆزرێتەوە. بەم پێیە، تورکیا بۆ ماوەیەك بەرەوی بەو تیۆرییە دا کە لەرێی پرۆژەی گاپەوە دەتوانێ باری دیموگرافیی ناوچە کوردنشینەکان بگۆڕێ‌و سەرکەوتو بێ لەگۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی کورد لەرێی فاکتەرە ئابورییەکانەوە.

تورکیا وای دانابو بەبوژاندنەوەی ناوچەکە لەروی ئابورییەوەو دەستخستنی هەلی کار بۆ بێکاران‌و پەرەدان بەکشتوکاڵی ناوچەکەو فەراهەم کردنی پێداویستی‌یەکانی کردنی ناوچەکە بەناوچەی گەشت‌و گوزار، دەتوانێ سوربون لەسەر ناسنامەی نەتەوەیی کوردانە کاڵ بکاتەوەو کورد بەرەو تێکهەڵکێشی بونی نەتەوەیی ببا. بەڵام سیاسەتی پەیڕەوکراوی تورکیا لەساڵی ١٩٩١ بەدواوە، چەوتیی ئەم بۆچونە دەسەلمێنێ چونکە بەدەرچونی بڕیاری نەهێشتنی قەدەغەی زمانی کوردی، دەوڵەتی تورکیا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پەشیمانبونەوەی خۆی لەهەوڵەکانی تورکاندن‌و تواندنەوەی کوردو سڕینەوەی ناسنامەی کوردانە ڕاگەیاند. دەبێ ئەوەش بگوترێ کەئێستا کوردستانی باکور بەقەد جاران دواکەوتوو نیەو وەك دوکو ئارکیل لەوتارێکی رۆژنامەی ((تورکیش دەیلی نیوز))دا وتویەتی، ئەو هەژارییەی کە دە ساڵ لەمەوبەر لەنێو کورددا باو بوو، ئەمرۆ نەماوە[٤٦].

لەم روانگەیەوە، ئەستەمە لێرە بەدواوە، بەتایبەتی لەسەردەمی ئەو ئاڵوگۆڕە سیاسییانەی کەتورکیای پیادا تێدەپەرێ، گاپ بەپرۆژەیەك بۆ هەڵسوڕاندنی مەسەلەی تێکهەڵکێش کردنی نەتەوەیی‌و سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوەیی کورد بژمێردرێ. ئەمرۆ لەسایەی ئەو ئاڵوگۆڕانەدا گاپ یەکێ لەو پرۆژە گەورە ستراتیجی‌یانە دەبێ کەکوردی تورکیا دەتوانێ لەروی ئابورییەوە سودێکی زۆری لێ وەرگرێ‌و بەم پێیە گاپ بەئامرازێکی گرنگی بوژاندنەوەی ئابوریی ناوچەکە دادەنرێ‌و تەنانەت بونی ناوچەی پرۆژەکە لەکوردستاندا دەشێ ببێ بەفاکتەرێکی هێز بۆ خەباتی کورد بۆ بەدەست هێنانەوەی ناسنامەی نەتەوەیی‌و شادبون بەمافە نەتەوەیی‌یەکان.

سەرچاوەكان:

[1] سي. جي، ادموندز، كرد وترك وعرب، ترجمة جرجيس فتح الله، مطبعة التايمس، بغداد، ١٩٧١، ص ٨.

[2] م.أ. حسرتيان، القضايا القومية في تركيا، ترجمة سيامند سيرتي، دمشق، ص ٧١-٧٢.

[3] الدكتور خليل علي مراد، القضية الكردية في تركيا ١٩١٩-١٩٢٥. فصل من كتاب: القضية الكردية في تركيا وتأثيرها على دول الجوار، تأليف مجموعة من الباحثين، مركز الدراسات التركية بجامعة الموصل، الموصل، ١٩٩٤، ص ٨.

[4] روبرت اولسن، المسالة الكردية في العلاقات التركية-الايرانية، ترجمة محمد احسان رمضان، دار أراس، اربيل، ٢٠٠١، ص ١١.

[5] م. أ. حسرتيان، المصدر السابق، ص ٥٤.

[6] جورج لنشوفسكي، الشرق الاوسط في الشؤون العالمية، الجزء الاول، ترجمة جعفر خياط، دار المتنبي، بغداد، ١٩٦٤، ص ١٧٣.

[7] دكتۆر عەبدولرەحمان قاسملو، كوردستانو كورد-لێكۆڵینەوەیەكی سیاسیو ئابوری، بنكەی پێشەوا، بەغدا، ١٩٧٣، ل ٥٩.

[8] جليلي جليل وأخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، دار الرازي، بيروت، ١٩٩٢، ص ١٤٩.

[9] الدكتور عبدالجبار عبد مصطفى النعيمي، اكراد تركيا وابعاد مشروع غاب. فصل من كتاب: القضية الكردية في تركيا وتأثيرها على دول الجوار، مصدر سابق، ص ١٦٧.

[10] دكتۆر عەبدولرەحمان قاسملو، سەرچاوەی پێشو، ل ٦٧.

[11] دكتۆر عەزیز شەمزینی، جوڵانەوەی رزگاریی نیشتمانیی كوردستان، وەرگێرانی فەرید ئەسەسەرد، چاپی سێیەم، سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجیی كوردستان، سلێمانی، ١٩٩٨، ل ٢٤٠.

[12] نادر نینتیسار، تیتنۆ نەتەوایەتی‌ی کوردی، وەرگێرانی عەتا قەرەداغی، بەڕێوەبەرایەتی‌ی خانەی وەرگێران، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٢٢٧.

[13] د. عبدالكريم كامل، الاقتصاد التركي، فصل من كتاب: تركيا المعاصرة، تأليف مجموعة من الباحثين، مركز الدراسات التركية بجامعة الموصل، الموصل، ١٩٨٧، ص ١٢٥.

[14] د. عماد احمد الجواهري، البنية الاجتماعية في تركيا، فصل من كتاب: تركيا المعاصرة، المصدر السابق، ص ١٤٧.

[15] دکتۆر عەزیز شەمزینی، سەرچاوەی پێشو، ل ١٣٦.

[16] م. أ. حسرتيان، المصدر السابق، ص ٥١.

[17] م.أ. حسرتيان، المصدر السابق، ص ٥٢.

[18] صبرية احمد لافي، الاكراد في تركيا، معهد الدراسات الاسيوية والافريقية بجامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٥، ص ١٠٩.

[19] صلاح سعدالله، المسألة الكردية في تركيا، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٩١، ص ٧٠.

[20] صبرية احمد لافي، المصدر السابق، ص ١١٠-١١١.

[21] الدكتور حامد محمود عيسى، القضية الكردية في تركيا، مكتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠١، ص ٣٠٤.

[22]Michael M. Gaufer; The
Press, Newyork. 1997, P 25-26.

[23] رعد عبدالجليل مصطفى الخليل، صراع الاستيعاب والانفصال دراسة في تجربة حزب العمال الكردستاني في تركيا، عن كتاب: الوحدة الوطنية ومشكلة الاقليات في العالم الثالث، بغداد، ١٩٨٩، ص ١١٦-١١٧.

[24] ئەریك رولو، ئەو گیروگرفتانەی روبەڕوی تورکیا بونەتەوە، وەرگێرانی عەلی هەورامی، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە ٢، ساڵی چوارەم، ١٩٩٥، ل ٧٥.

[25] رعد عبدالجليل مصطفى الخليل، المصدر السابق، ص ١١٨.

[26] رۆژنامەی (العراق) ٢٠/٣/١٩٩٣.

[27] د. محەمەد نورەددین، مەسەلەی کـورد سـالآنە ٨ ملیـار دۆلار لەسـەر تورکیـا کـەوتوە (چاوپێکەوتن)، گۆڤـاری سـەنتەری لێکۆڵینـەوەی سـتراتیجی، ژمـارە ٢، سـاڵی شەشـەم، ١٩٩٨، ل ١٥٣.

[28] فەرید ئەسەسەرد، گـاپو سـتراتیجی بادانـەوە بـەلای رۆژهـەلاتدا، گۆڤـاری سـەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە ٢، ساڵی یەکەم، ١٩٩٢، ل ٢٧.

[29] دکتۆر عەزیز شەمزینی، سەرچاوەی پێشو، ل ١٤٠. سەبارەت بەڕاپۆرتی نـاوبراو، بچـۆرە سەر لاپەڕە ١٣٦-١٤٤ ی کتێبی ناوبراو.

[30] الدكتور حامد محمود عيسى، المصدر السابق، ص ٣١٤.

[31] م. أ. گیسارۆڤو أ. رگوشین، کوردی تورکیا، وەرگێڕانی جەلال تەقی، وەزارەتی رۆشـنبیری، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٨٩-٩٠.

[32] خلیل ماگنۆس کاراوێلی، تورکیا: زلهێزێکی تیقلیمیی نوێی کـۆن، گۆڤـاری سـەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە ٤، ساڵی سێیەم، ١٩٩٥، ل ٩٥،

[33] کامەران فەهمی، گاپ: راپۆرتێکی گشتی، گۆڤاری سـەنتەری لێکۆڵینـەوەی سـتراتیجی (چاپی دووەم) ژمارە ١، ساڵی یەکەم، ١٩٩٢، ل ١٥.

[34] سایتی ئورفە WWW Urfa.Com.

[35] کامەران فەهمی، سەرچاوەی پێشو، ل ٥.

[36] جون كولارس، مشكلة الطاقة وضرورة اللجوء الى الموارد المائية، ترجمة صلاح سليم، نشرة اوراق تركية معاصرة، العدد ٤، الموصل، ١٩٨٧، ص ٧.

[37] عايدة العلي سري الدين، العرب والفرات بين تركيا واسرائيل، دار الافاق الجديدة، بيروت، ١٩٩٧، ص ٢٩.

[38] الدكتور عبدالجبار عبد مصطفى النعيمي، المصدر السابق، ١٧٣.

[39] عوني عبدالرحمن السبعاوي، ابعاد ومؤشرات مشروع غـاب (بحث مقدم الى نـدوة المياه والسدود في تركيا التي اقامها مركز الدراسات التركية بجامعة الموصـل في ١٠/١/١٩٨٨)، ص ٣.

[40] د. عماد الجواهري وصلاح سليم علي، سد اتاتورك ومستقبل العلاقات التركية-العراقية (بحث مقدم الى ندوة المياه والسدود في تركيا التي اقامـها مركز الدراسات التركية بجامعة الموصل) ص ١١.

[41] د. نصيف جاسم المطلبي، العلاقات العراقية-السورية-التركية في ضوء المياه المشتركة وافاقها المستقبلية، نشرة اوراق تركية معاصرة، العدد ٣/٤، الموصل، ١٩٨٩، ص ٢٤.

[42] كامەران فەهمی، سەرچاوەی پێشو، ل ١٤.

[43] الدكتور حامد محمود عيسى، المشكلة الكردية في الشرق الاوسط، مكتبة مدبولي، القاهرة، ١٩٩٠، ص ٢٨٣.

[44] خليل ابراهيم الناصري، التطورات المعاصرة في العلاقات العربية-التركية، مطبعة الراية، بغداد، ١٩٩٠، ص ١٧٧.

[45] سايتی ئورفە، سەرچاوەی پێشوو.

[46] دوكو تاركيل، اكراد تركيا واوربا، مقال مترجم عن صحيفة تركش ديلي نيوز، جريدة (الاتحاد)، ٥/١١/٢٠٠٤، ص ٦.




# ریشەی ململانێکانی
# ناو کۆنگرەی گشتیی چوارەمی تورکمانەکان

یوسف گۆران

پێشەکی:

لە کۆتایی مانگی نیسانی ئەمساڵ (٢٠٠٥) کۆنگرەی گشتیی چوارەمینی تورکمان لە کەرکوك بەسترا، ئەم کۆنگرەیە جیا لە کۆنگرەکانی پێشوتری بەرە مشتو مڕو و ململانێ و کێشمەکێشی زۆری لێکەوتەوە. ململانێکان ئەوەندە توند بوو کە سەرجەم کارەکانی کۆنگرەی توشی ئیفلیجبوون و پاشانیش شکست کرد.

دیارە دەرکەوتنی ململانێو گیروگرفتی توند لە نێو کۆنگرەی گشتیی چوارەمی تورکمان دیاردەیەکی لەپڕ نەبووە و پێشینەیەکی کۆنی لەنێو مێژووی بەرەی تورکمانی هەیە. گرفتەکان هەرچەند لەم کۆنگرەیەی دواییدا تەقیەوە بەڵام پێشتر رەگو ریشەی قوڵتریان لە نێو بەرەدا هەبوو.

بەرەی تورکمانی لەئەنجامی هەوڵێکی فراوانی تورکمانەکان بۆ یەکخستنی دەنگی خۆیانو بەهێزکردنی پێگەی سیاسییان لە کوردستانو عیراق هاتە کایەوە، بەڵام مێژووی دە ساڵەی بەرە ئەوەی نیشان دا کە ئەوەندەی لایەنە جیاجیاکانی ئەم بەرەیە سەرقاڵی مونافسەو تەکەتولاتی جوگرافی ( بەپێی شارەکان ) یان مەزهەبی بوون، ئەوەندە نەیانتوانیوە ببنە کەپرێك بۆ کۆ کردنەوەی سەرجەم تورکمانەکان. ململانێکانی ئەم دواییەی نێو کۆنگرەی گشتیی چوارەمی تورکمان تەواوکەری زنجیرەیەکی درێژی ململانێی دێرینترن،

بەڵام بەهۆی دۆخی تازەی ئێستای عیراق و کوردستان و ئەو گۆڕانکاری‌یانەی کە لە ناوچەکە دروست بوون چەندین رەهەندی فراوانتری بەخۆوە بینی.

## کۆنگرەی گشتیی تورکمان: کورتەیەکی مێژوویی

لە ٧-١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٧ یەکەمین کۆنگرەی گشتی‌ی تورکمان لە هەولێر بەسترا. ئەم کۆنگرەیە پاش هەوڵ و کۆششێکی زۆری ئەنکەرە بۆ رێکخستن و یەکریزی کردنی تورکمانەکان هاتە کایەوە، لەراستی‌دا بەستنی کۆنگرەیەك بۆ تورکمانەکان، یان وردتر بۆ تورکمانەکانی نێو بەرەی تورکمانی، رەنگدانەوەیەکی راستەوخۆی ئەو ململانێ‌و گرفتانەی بەرەی تورکمانی‌و پارتەکانی بوو.

هەرچەند خودی بیرۆکەی بەرەی تورکمانی بەمەبەستی رێگرتن لەبەرپابونی ململانێ‌ی ناوخۆی تورکمانەکان و یەکخستنیان لەبەرەیەکی یەکگرتو هاتە کایەوە، بەڵام لەماوەی نێوان راگەیاندنی بەرەی تورکمانی لە ٢٤/٤/١٩٩٥ و بەستنی یەکەمین کۆنگرەی گشتی تورکمان لە ٥-٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٧ ململانێ و کێشمەکێش لە نێو باڵە جیا جیاکانی بەرە رو لە زیاد بوون بوو. لەماوەی ئەو دوو ساڵ و چەند مانگەدا سێ جار سەرۆکایەتی‌ی بەرەی تورکمانی گۆڕانی بەسەردا هات لە دانانی تورهان کەتانە وەك یەکەمین سەرۆك بۆ بەرە پاشان دانانی سنان چەلەبی و پاشانیش لابردنی ئەوو دانانی مستەفا کەمال یایچلی بەوەکالەت.

سەرباری ئەو گۆڕانکاریانەی لەسەرۆکایەتی‌ی بەرە روویان دا لەو ماوەیەدا ململانێ‌ی نێوان تورکمانە کەرکوکی‌یەکان‌و تورکمانە هەولێریەکان لەپەرەسەندندا بوو، لادانی د. موزەفەر ئەرسەلان لەسەرۆکایەتی‌ی پارتی نیشتمانی‌ی تورکمان و لادانی د. تورهان کەتانە لەسەرۆکایەتی‌ی بەرەی تورکمانی‌و گرتن و دورخستنەوەی هەندێ لەکادێرە تورکمانە کەرکوکی‌یە باڵاکانی بەرە، بەشێك بوون لە سیناریۆیەکی بەردەوامی بەرتەسکردنی رۆڵی سیاسی‌ی تورکمانەکانی کەرکوك.

لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٩٧دا ململانێکانی نێوان باڵە جیاجیاکانی بەرە کەیشتنە قۆناخی تەقینەوە. پێشتر بنەماڵەی(( چەلەبی)) بە پاڵپشتی د.نیحسان دۆغرەمەچی دەستیان بەسەر بەرەدا گرتبوو، لەم ماوەیەدا دژایەتیی بنەماڵەی چەلەبی بەئاشکرا لەلایەن پارتەکانی نێو بەرەوە هەست پێدەکرا. لە ٣٠ی تەمووزی ١٩٩٧ فەرید چەلەبی بە نیمچە کودەتایەك لەسەرۆکایەتیی پارتی تورکمانە بێلایەنەکان دەرکراو کەنعان شاکر ئاغالی جێی ئەوی گرتەوە، پاشان لە ٦ی ئەیلولی ١٩٩٧ خودی سەرۆکی بەرە سنان چەلەبی لەسەرۆکایەتیی بەرە وەدەرنراو مستەفا کەمال یایچلی بەوەکالەت جێی ئەوی گرتەوە(١/٣٩). بەم شێوەیە ململانێ و کێشەکانی نێو بەرەی تورکمانی روو لەزیاد بون بوو و کەشوهەوای (( پاشقول لەیەك گرتن و بۆسەدانان))(١/٣٩) باڵی بەسەر سەرجەم دامودەزگاو پارتەکانی بەرەی تورکمانیدا گرت، لە ئەنجامدا سەرجەم دامودەزگاکانی بەرە توشی ئیفلیجبوون هاتن.

لە کەش و هەوایەکی واداو لە پێناوی دەربازکردنی بەرەی تورکمانی لەو قەیرانە یەك لە دوای یەکانەی کە توشی هاتبوو بیرۆکەی بەستنی کۆنگرەیەك بۆ سەرجەم تورکمانەکان هاتە کایەوە. ئەم بیرۆکەیە بە عەمەلی لە هەولێر لە رۆژانی ٧-١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٧ چووە قۆناخی جێبەجێکردنەوە.

لە ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٧ شەش لایەن و پارتی تورکمانی کە پێك هاتبوون لە پارتی نیشتمانی تورکمانی عیراق و پارتی تورکمانی ئیللی و پارتی بزوتنەوەی بێلایەنەکان و یانەی برایەتیی تورکمان و یانەی رۆشنبیری تورکەکانی عیراق ((دەرنەك)) کۆمەڵەی وەقفی تورکمان یەکەمین کۆنگرەی گشتیی تورکمانییان لە هەولێر بەست(٦)، ئەم کۆنگرەیە هەرچەند وەك لە ناوەکەی دیارە بڕیار بوو بۆ سەرجەم تورکمانەکانی عیراق بێت، بەڵام وەك دەرکەوت ئەم کۆنگرەیە تەنها تورکمانەکانی نێو بەرەی تورکمانی گرتەوە، پارتە تورکمانەکانی دەرەوەی بەرەو پارتە تورکمانە شیعەکان بەشدارییان تێدا نەکرد.

کۆنگرەی گشتیی تورکمان بە پێی مادەی ١٢ی پەیرەوی ناوخۆی بەرەی تورکمانی ((بالاترین دەسەڵاتە کە بڕیار لەسەر مەسەلە پەیوەندیدارەکان بە

کۆمەڵگای تورکمانەوە دەداو بەرنامەو هێڵە سیاسی یە گشتی یەکانی ئەو کۆمەڵگایە دیاری دەکات))(١/٤٠).

کۆنگرەی یەکەمی تورکمانەکان لەکەش و هەوایەکی تایبەتدا بەسترا کە تورکیا دەسەڵاتێکی رەهای لە نێو بەرەی تورکمانیدا هەبوو. لەگەڵ دروستبوونی ململانێی نێوان تورکمانە کەرکوکی یەکانو تورکمانە هەولێری یەکان ئەنکەرە لەوکاتەدا بەردەوام پشتگیری ی تورکمانە هەولێری یەکانی دەکرد، پێدەچوو تورکیا سیاسەتی خۆی بەرامبەر بەتورکمانەکانی عیراق بە شێوەیەك دارشتبێ کە پەیوەندی تایبەتی خۆی، بە تایبەتی ی ئابوری، لەگەڵ حکومەتی ئەوسای بەغدا تێکنەدا، بۆیە ئەنکەرە بەردەوام هەوڵی بەرتەسککردنی دەسەڵاتی تورکمانەکانی کەرکوکی دەدا چونکە پێی وابو دەسڕۆیی ئەوان لە نێو دامودەزگاکانی بەرە سەرئێشەیەکی بەردەوامی لە پەیوەندیەکانی بە حکومەتی بەغدا بۆ دروست دەکات. لەراستیشدا خودی حکومەتی بەغدا ئەوەندەی بە تورکمانە کەرکوکی یەکان هەستیار بوو ئەوەندە بایەخی بە تورکمانەکانی هەولێر نەدەدا، لە سۆنگەی ئەم راستی یەوە تورکیا سیاسەتی پاڵپشتیکردنی تورکمانەکانی هەولێری گرتبووە بەر.

لەکۆنگرەی یەکەمی تورکمانیدا تورکیا کەسایەتی یەکی نەناسراوی وەك ویداد ئەرسەلانی بەسەر سەرجەم سیاسەتمەدارە کۆنەکانی تری تورکمانەکان، بەتایبەتی ریاز ساری کەهیەو مستەفا کەمال یایچلی، سەپاند(١/٣٧)، ئەم سەپاندنە هەرچەند کاردانەوەیەکی سلبی راستەوخۆی لێنەکەوتەوە، بەڵام رۆڵێکی فراوانی لەقوڵکردنەوەی ململانێکانو ساردکرنەوەی پارتە تورکمانی یەکان لە خۆبەستنەوە بەسەرۆکایەتی ی بەرە گێرا.

لەیەکەمین کۆنگرەی گشتی ی تورکماندا کە لە ١٠ تشرینی یەکەمی ١٩٩٧ کۆتایی ی پێ هات، چەندین دامودەزگای نوێ لەنێو بەرە دامەزران، دروستبوونی شورای تورکمان (پەرلەمان)و دەستنیشان کردنی سەرۆکێکی نوێ بۆ بەرەو دامەزراندنی دەستەی باڵای بەڕێوەبردن ( یورتما) کە لە ٦ کەس پێکهاتبو، لە گرنگترین بڕیارەکانی کۆنگرەی یەکەمی تورکمانەکان بوو. لەبڕیارەکانی

یەکەمین کۆنگرەدا هاتبو کە پێویستە سێ (٣) ساڵ جارێك کۆنگرەی گشتیی تورکمان ببەسترێت و ئەم کۆنگرەیە بکرێتە باڵاترین دەزگای دەسەڵاتداری نێو بەرەی تورکمانی(٣).

لەماوەی نێوان یەکەمین کۆنگرە و دووەمین کۆنگرەدا( ١٩٩٧-٢٠٠٠ ) ململانێ و رکەبەرایەتیی نێوان پارت و باڵە جیاجیاکانی بەرە وەکو خۆی مایەوە، زۆربەی سەرکردەکانی پارتە تورکمانیەکانی نێو بەرە هیچ جۆرە پابەندبونێکیان بە سەرۆکایەتیو سەرۆکی بەرە نیشان نەدا. لەراستیدا هەندێ لەسەرکردەکانی تورکمان، وەکو ریاز ساری کەهیە سەرۆکی پارتی تورکمان ئیللی، بەئاشکرا رەخنەی لە ویداد ئەرسەلان دەگرت و بەکەسێکی شایستەی ئەو شوێنەی نەدەبینی. لەساڵانی ١٩٩٨و ١٩٩٩ کاتێك هێزەکانی ئاسایشی پارتی دیموکراتی کوردستان هەندێ بارەگای بەرەی تورکمانیان لە هەولێر داگیرو تاڵان کرد، سەرۆکی بەرە لە لایەن سەرکردە تورکمانەکانی نێو بەرەو تورکیاوە رەخنەی توندی لێ گیراو گوایە هەڵوێستێکی توندی بەرامبەر بەپارتی نەنواندوە، بەڵکو هەندێکیان ئەو تۆمەتەیان خستە پاڵ کە لەژێرەوە پەیوەندی بەپارتیەوە هەیە، بەڵگەشیان بۆ ئەم قسانە ئەوە بو کە تەنها بارەگاکانی پارتەکەی ئەو لەلایەن پارتیەوە داگیر نەکرا. بەم شێوەیە گوشارێکی مەعنەویو سیاسیی زۆر خرایە سەر سەرۆکی بەرە تاکو دەست لەکار بکێشێتەوە، بەڵام ئەو بەوە قایل نەبوو، ئیتر لەم دۆخەدا دووەمین کۆنگرەی گشتیی تورکمان لە هۆڵی میدیا لە هەولێر لە تشرینی دووەمی ٢٠٠٠ بەسترا(٥/٦٠).

سەرکردەکانی بەرەی تورکمانی لەسەر دانانی سەرۆکێکی تازە بۆ بەرە کۆك نەبوون، باڵی ریاز ساری کەهیە و مستەفا کەمال یایچلی کە بە کوتلەی تورکمانی کەرکوك ناو دەبران حەزیان دەکرد سەرۆکی بەرە لەوان بێت، هەرچی تورکمانەکانی هەولێرە، وەکو کەنعان شاکر ئەغالی هەولیان بۆ گەیشتن بە سەرۆکایەتی بەرە دەدا.

لەبەر ناتەبایی و ناکۆکیی باڵە جیاجیاکانی نێو بەرەی تورکمانی لەسەر پۆستی سەرۆکی بەرە کۆنگرەی دوەمی تورکمان بەرێنماییی راستەوخۆی

تورکیاو نوێنەرەکەی لە هەولێر بڕیار درا کەسایەتیەکی سەربەخۆی ناسیاسیو دور لە پارتەکانی بەرە بۆ سەرۆکی بەرە دەستنیشان بکرێ. هەر بۆیە پارێزەری ناودار سەنعان قەساب ئاغایان بۆ ئەم پۆستە دەستنیشان کرد. لە راستیشدا هەرچەند سەنعان کەسایەتی‌یەکی ناسیاسیو ناحیزبی بوو و خەڵکی هەولێریش بوو، بەڵام بەهۆی نەبوونی لە نێو ململانێکانی نێو بەرەی تورکمانی کۆدەنگی‌یەکی باشی لەسەر دروست بوو.

ماوەی نێوان کۆنگرەی دووەم و سێیەمی تورکمان (٢٠٠٠-٢٠٠٣) زیاتر بەماوەیەکی هێمن و دور لە ململانێ، بەبەراورد لە ساڵانی رابردوو، دەژمێردرێ. قەساب توانی ئەو ململانێ‌یە توندو کێشمەکێشەکانی جاران هێور بکاتەوە، بەڵام راستی‌یەکی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە لەگەڵ کەمبونەوەی ململانێی ناو بەرە زۆر لەپارتەکانی بەرە وەکو جاران گرنگیەکی ئەوتۆیان بە دامودەزگای بەرە نەدەدا. لە راستی‌دا دەکرێ قۆناخی بەڕێوەبردنی سەنعان ئاغا بۆ بەرە بەقۆناغی هێوربونەوەی ململانێ لەلایەك‌و کەمبوونی رۆڵی سیاسی‌ی بەرە لەلایەکی ترەوە پێناسە بکرێ.

قەساب تا رزگارکردنی عێراق و روخانی رژێمی سەدام لەسەرۆکایەتی‌ی بەرە مایەوە، بەڵام لەکۆنگرەی سێیەمی تورکماندا کە لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣ لە کەرکوك بەسترا د. فاروق عەبدوڵڵا عەبدولرەحمان وەك پێنجەمین سەرۆکی بەرە هەڵبژێردراو قەساب لەژیانی سیاسی‌ی تورکمانی‌دا کشایەوە(٦).

## کۆنگرەی سێیەمی تورکمان

کۆنگرەی سێیەمی توکمان لەناوەڕاستی ئەیلولی ٢٠٠٣ لە کەرکوك بەسترا. گرنگی‌ی ئەم کۆنگرەیە بۆ تورکمانەکان لەوەدا بوو کە پاش روخانی رژێمی سەدام حسێن هات و دوای ئەو گۆڕانکاری‌یە ناوخۆیی‌و دەرەکی‌یانەی لە پارسەنگی سیاسی‌ی هێزەکانی کوردستان وعێراق بەسترا. بەرەی تورکمانی بۆ ئەوەی رەهەندێکی نەتەوەیی بداتە ئەم کۆنگرەیە، سەرەڕای نائارامی‌ی دۆخی ئەمنی کەرکوك، بڕیاری‌دا کۆنگرەکە لە کەرکوك ببەستێت. هەڵبژاردنی

ئەر کوك وەك شوێنی بەستنی کۆنگرەکە گرنگی‌یەکی مەعنەوی زۆری لای بەرەی تورکمانی هەبوو. پاش روخانی رژێمی عیراق بەهۆی رزگارکردنی کەرکوك و سەرجەم شارەکانی تری کوردستان و عیراق، پێگەی تورکمانەکانی کەرکوك لە نێو بەرەی تورکمانیدا بەهێز بوو، لەگەڵ ئەوەی کە کەرکوك بەشی هەرە زۆری تورکمانەکانی کوردستانی لە خۆ گرتووە (نزیکەی ٨٠٪) (١٩٣/٧)پاش رووخانی سەددام سیاسەتی ئەنقەرە بۆ ئیحتواکردنی تورکمانەکانی کەرکوك گۆرانی بەسەردا هات، ئەم گۆرانکاری‌یانە لەبەرژەوەندیی تورکمانە کەرکوکی‌یەکانی نێو بەرەی تورکمانی بوو.

کۆنگرەی سێیەم بە ئامادەبوونی پێنج پارتی تورکمانی و ٤٠ رێکخراوی جوراوجۆری تورکمانی لە کەرکوك بەسترا. خەسڵەتی دیاری ئەم کۆنگرەیە لەوەدا بوو کە سەرکردەی نوێی لەکەرکوك هێنایە ریزی پێشەوەی سەرکردایەتیی بەرەو دامودەزگاکانی. پاش ئەوەی سەنعان قەساب سەرۆکی پێشوی بەرە دەستی لەکار کێشایەوە، چوار کەس خۆیان بۆ پۆستی سەرۆکی بەرە هەڵبژارد، کەسایەتی‌یەکان پێکهاتبوون لە پرۆفیسۆر سەعدەدین ئەرکیج و دکتۆر فاروق عەبدوللا و جەمال شان و مستەفا کەمال یایچلی، پاشان جەمال شان و مستەفا کەمال یایچلی لەهەڵبژاردنەکە کشانەوە و مونافسەکە لە نێوان سەعدەدین ئەرکیج و فاروق عەبدوللا مایەوە.

ئەرکیج پشتی بە کارکردنی وەك بەرپرسی رێکخستنە نهێنی‌یەکانی بەرەی تورکمانی لەکەرکوك بەستبو و کردبویە بەردی بناغەی کارەکانی، هەرچی فاروق عەبدوللاشە سەرباری دووریی لە ژیانی سیاسیی تورکمانەوە پشتی بە ناوبانگی باوکی، زەعیم روکن عەبدوللا عەبدولرەحمان، بەستبو، عەبدولرەحمان یەکێك بوو لە کەسایەتی‌یە ناودارەکانی تورکمان و ساڵی ١٩٨٠ رژێمی سەددام لەگەڵ دوو هاورێی خۆی بەتۆمەتی خزمەتکردنی بێگانەو پێکهێنانی رێکخراوێکی نهێنی لە سێدارەی دابوون(٢٤٢/٨).

پاش مونافسەیەكی توند لـە نێـوان عـەبدوڵڵاو ئـەركیج یەكـەمینیان ٢٦٤ دەنگـی لـەكۆی ٥٥٠ دەنـگ هێنـاو ئـەركێجیش ٢٠٢ دەنگـی بەركـەوت. بــەم شێوەیە فاروق عەبدوڵڵا وەك شەشەمین سەرۆكی بەرە هەڵبژێردرا(٩).

## توركمانەكان پاش روخانی رژێمی سەددام

شەڕی رزگاركردنی عـیراق و روخـانی رژێـمی سـەددام چارەنوسـی سیاسـی‌ی نەتـەوە جیاجیاكـانی عـیراقی بـردە قۆنـاغێكی تـازەوە. لــەم دۆخــەدا گروپــە نەتەوەیی‌و مەزهەبی‌یە جیاجیاكانی عیراق، بەپێی قورسایی‌و پێگەو پەیوەندی‌یە سیاسی‌یەكانیان سەرقاڵی دارشـتنی رۆڵـی نـوێی خۆیـان بـون لـەعیراقی پـاش سەدام.

توركمانەكان، بەسوننە و شیعەوە، دور نــەبوون لــەم گۆڕانكاری‌یــە مەزنانـەی عیراق، ئەم گۆڕانكاری‌یانە كارلێكـەری راسـتەوخۆیان لـەرۆڵ و پێگـەی سیاسـی توركمانەكان بەجێهێشت.

هەرچەند هەنگاوەكانی روخانی رژێمی سەددام لەلایەن ئەمریكاوە پێشـهاتی ئەوەی لەگەڵ خـۆی هێنـابوو كـە سـەرجەم لایەنـە سیاسـی‌و پارتـەكانی عـیراق، بـەكورد و عـەرەب و توركمـان‌و كلدۆئاشـورەوە، تیـایدا سـودمەند دەبـن، بـەڵام هەندێ لایەن، لەبەر چەندین هۆكـاری نـاوخۆیی و ئیقلیمـی، تیـایدا زەرەرمــەند بوون.

سـتراتیجی‌ی سـەرەكی بـەرەی توركمـانی لەسـەرەتای دروسـتبوونیەوە تــاكو هاتنی لەشكری ئەمریكا بۆ عــیراق لەسـەر (( هاوپـەیمانێتی)) و پشتبەسـتنی توند بە توركیا دارێژرابوو، بە شێوەیەك كە پەیوەندی‌یەكانی توركمـان- توركیـا لای بەرە و توركیا بەردی بناغەی سەرجەم پەیوەندی‌یەكانی تری لایەنەكانی تری عێراق بوو، بۆیە كاتێك كە گرژی‌و ئاڵۆزی باڵی بەسەر پەیوەندی‌یەكانی توركیا لەگەڵ لایەنە جیاجیاكانی پرۆسـەی رزگـاركردنی عـیراقدا كێشـا، بەشـێوەیەكی راستەوخۆ رەنگدانەوەی لەسەر توركمانەكان هەبوو.

شەڕی عیراق- ئەمریکا پەیوەندیی‌یەکانی ئەمریکا- تورکیای ئالۆز کرد، تورکەکان بەرگرتن لەبەردەم تێپەڕبوونی هێزەکانی ئەمریکا بەناو خاکی تورکیادا بۆ کردنەوەی بەرەی شەڕی باکور گورزێکی بەهێزیان لەپەیوەندیی ستراتیجیی ئەمریکا- تورکیا سرەواند.

پێش دەرچوونی بڕیاری رێپێنەدان بە گوزەرکردنی هێزی ئەمریکا بەخاکی تورکیادا لەلایەن پەرلەمانی تورکیاوە حکومەتی ئەمریکا چەندین کۆبونەوەی یەك لەدوای یەکی لەگەڵ سەرکردایەتیی کوردو تورکیاو بەریتانیا و نوێنەرانی بەرەی تورکمانی لە ئەنکەرە سازکرد. لەو کۆبونەوانەدا بەرەی تورکمانی وەك لایەنێکی سەرەکی بەشداریی کرد(١٠).

روداوەکان گەر بە رەوتی ئاسایی خۆی تێپەڕ بوایە سەنگی تورکمان‌و بەرەی تورکمانی لەهاوکێشە سیاسی‌یەکانی پاش روخانی سەددام بەهێزتر دەکرد، بەڵام پاش ئالۆز بوونی پەیوەندیی تورکیا- ئەمریکا بەرەی تورکمانی کەوتە بەرەی تورکیاوە و بەو شێوەیەش مامەڵەی لەگەڵ رووداوەکانی عیراقدا کرد.

بەرەی تورکمانی لەمەسەلەی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەمریکادا کەوتوە بەرەی تورکیا و هەندێ جاریش ئەم هەڵوێستە لەسەر حیسابی مەسەلە نیشتمانی‌یەکانی عیراق بووە، بۆ نموونە پاش کۆتاییی شەڕەکە و لە کۆتاییی ساڵی ٢٠٠٣ و سەرەتای ٢٠٠٤ کاتێك باس لە هاتنی لەشکری تورکیا بۆ عیراق لە ژێر سەرکردایەتیی ئەمریکا کرا بەرەی تورکمانی تاقە لایەنی عیراقی بوو کە خۆشحاڵیی خۆی بۆ هاتنی لەشکری تورك دەربڕی (١١).

لەهەمان کاتدا سەرانی بەرە راشکاوانە کەوتنە رەخنەگرتن لە سیاسەتی ئەمریکا و لەسەر لاپەرەی رۆژنامەکان سەرزەنشتی ئەمریکایان کرد ( ١٢). ئەم رەخنەیە لەلایەن هەندێ رۆشنبیری ناوداری تورکمانەوە دوبارە کرایەوە (١٠).

تورکمانەکانی نێو بەرە لەمەسەلەی هەڵبژاردنی پارێزگاری کەرکوك‌و هەڵبژاردنی نوێنەری تورکمانەکان بۆ ئەنجومەنی حوکم رەخنەی بەردەوامیان لەسیاسەتی ئەمریکا دەگرت و وایان نیشاندەدا کە ئەمریکا بەم کارە دەیەوێ تۆڵەی خۆی لە هاوپەیمانەکانی تورکیا لە عیراق بکاتەوە( ١٠). بەم شێوەیە

بـەرەی تورکمـانی رۆژ لـە دوای رۆژ لـە سیاسـەتی رەسمـی دەسـەلات دور دەکەوتەوەو لە بەرهەلستکارانی حکومـەت، بەتایبـەتی عـەرەبی سـوننە، نزیـك دەبۆوە.

## هەلبژاردنە گشتییەکانی عیراق و تورکمان

تێروانینی سەرانی بەرەی تورکمانی سەبارەت بەکێش و قورسایی‌ی سیاسـی‌ی بەرەی تورکمانی لەهەلبژاردنەکانی ۱/۳۱ ئەمساڵ زۆر لە قەبارەی راستەقینەی خۆی زیاتر بوو. سەرۆکی بەرە د. فاروق عەبدوللا لەچاوپێکـەوتنێکدا پێشـبینی ئەوەی کرد کە بەرەی تورکمانی ۲۵ کورسی لەپەرلەمانی عیراقی بەدەست دێنێ، کـەچی لەئـەنجامی هەلبژاردنەکـەدا بـەرەی تورکمـانی تەنـها ۳ کورسـی بەرکەوت(۱۳).

رەنگە ئەو ئەنجامە چاوەڕواننـەکراوەی بـەرە لەهەلبژاردنـەکانی عـیراق رونـترین و باشترین پێوەر بێ بۆ سەنگی راستەقینەی بەرە بـەدەر لەهاشوهوشـی ئیعلامـی، بەلام رەنگە سیاسەتی کەنارگیری بەرە لەگەل دەوروبەر، بەتایبەتی کورد، رۆلێکی فراوانتری لەکەمکردنەوەی سەنگی ئینتخابی‌ی بەرە گێرابێ.

ستراتیجی ئینتخابی‌ی بەرە لەسەر بنەمای دژایەتیکردنی پارتە سیاسیەکانی کوردستان دارێژرابوو. لـەکاتێکدا زۆر بـە ئاشـکرا عـێراق بەسـەر سـێ گروپـی مـەزن، شیعە- کـورد- سـوننە، دابـەش بـووە، بـەرەی تورکمـانی وەك نوێنـەرەی گروپێکی ئیتنی‌ی بچووك، نەیتوانی هاوپەیمانێتی‌یەکی ئینتخابی بەسود لەگەل هیچ یەکێ لەمانە دروست بکات.

لەلایەك کەوتە دژایەتیکردنی لیستی کوردستانی لە کاتێکدا بەرە دەیتوانی زۆرتریـن کـەلك لەهاوپـەیمانێتی‌ی کوردسـتان وەرگـرێ، لەلایـەکی تـرەوە لەنامـەیەکی ئاشکرای سیستانی‌دا بۆ تورکمانەکان ناوبراو داوای ئەوەی کرد کـە دەنگ بەو لیستە بدەن کە ئەو پشتگیری دەکات، سەبارەت بە سوننەش ئاشکرایە کە بەشداری‌یەکی چالاکانەیان لەهەلبژاردندا نەکرد. بەم شـێوەیە تورکمانـەکانی بەرە بێ پشتیوان و گۆشەگیر لە هاوکێشە ئینتخابی‌یەکان مانەوەو تەنها پشتیان بە سەنگی راستەقینەی خۆیان بەست.

رەخنە گرتن لە شێوەی بەڕێوەبەرایەتیکردنی سیاسەتەکانی بەرە لە نێو ڕوشنبیرو سیاسەتمەدارانی تورکمان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە پەرەسەندندا بو، بۆ نمونە نومێد کۆپرلو سەرنوسەری گۆڤاری (( تورکمان شانی ))سەبارەت بە بەرپرسانی بەرە دەنوسێ: (( پێویستە بیر لە قۆناخی دوای کۆنگرەی سێیەم بکەینەوە کە بە هۆی بەرپرسەکانمانەوە توشی بڕوا نەبوون و بێهیوایی بووین)) (١٤)، لە شوێنێکی تردا دەنوسێ (( ئەو سەرکردایەتییە سیاسییەی رابەرایەتیی ئێمە دەکرد ڕوحی مەعنەوی تورکمانی تێکشکاندو لە هەموو بوارەکاندا شکستی پێهێنااین))( ١٤).

پاش هەڵبژاردن سەرانی بەرەی تورکمانی بۆیان دەرکەوت کە دەلاقەی نێوان خەونە سیاسییەکانیان‌و قورسایی‌ی سیاسییان یەکجار زۆرە. بەڵام مەسەلەیەك کە بەتوندی کاری کردە سەر بەرە گۆڕانی هەڵوێستی هەندێ لایەنی ئیقلیمی بوو، بەتایبەتی تورکیا، کە سەنگی سیاسیی ڕاستەقینەی بەرەی تورکمانیی بۆ دەرکەوت.

پاش ڕاگەیاندنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن تورکیا کەوتە چاوخشاندنەوە بە سیاسەتی خۆی لە عیراقدا، ئەم چاوخشاندنەوەیە ڕاستەوخۆ بەرەی تورکمانیی گرتەوە، بۆیە لەو کاتەوە چەندین بانگێشی ئاشکرای تورکەکان ئاراستەی بەرەی تورکمانی کرا تا زیاتر خۆیان لەگەڵ دەوروبەردا بگونجێنن و هەندێ جاریش ڕەخنەی توندیان لەسیاسەتەکانی بەرەش دەگرت.

بۆ نمونە لە چاوپێکەوتنێکدا کە تەلەفزیۆنی NTVی تورکی لەگەڵ عوسمان کورۆتورك بەرپرسی فایلی عیراق لە وەزارەتی دەرەوەی تورکیای کرد، ناوبراو زۆر بەراشکاوانە داوای لەتورکمانەکانی عیراق کرد کە لەمەودوا (( پێویستە تورکمان خۆیان پێکهاتەی سیاسیی خۆیان پێك بێنن‌و دەستنیشانی ڕەوتی سیاسیی خۆیان بکەن))(١٥).

سیاسەتی ئینتخابیی بەرەی تورکمانی بەهۆی سەرۆکایەتیی د. فاروق عەبدوڵڵاوە کەوتبووە ژێر فشاری گوتاری سیاسیی سوننە توندڕەوەکانەوە، بۆیە بەرەی تورکمانی لەچەندین بۆنەی جیاجیادا هەرەشەی بەشدار نەکردنی لە

هەڵبژاردنەکاندا کردو هەندێ جاریش وای باس دەکرد کە بەرە هێشتا بڕیاری بەشداریکردنی هەڵبژاردنی نەداوە. ناڕوونیی هەڵوێستەکانی د. فاروق عەبدوڵڵا لە سەرکردایەتیکردنی هەڵمەتی ئینتخابیی بەرە ئەوەندەی تر کاری کردە سەر هەڵوێستە تەریك و گۆشەگیرەکانی بەرە.

شکست هێنانی بەرە لە گەیشتن بەو ئامانجانەی کە خەونیان پێوە دەبینی و باسیان دەکرد راستەوخۆ شکستێك بوو بۆ سەرۆکی بەرە د. فاروق عەبدوڵڵا، بۆیە پاش ئەم شکستە رەخنەو هێرشێکی توند ئاراستەی عەبدوڵڵا کراو بە ناکارامەو ناشایستە ناوزەد کرا(١٤).

پاش هەڵبژاردن ریاز ساری کەهیە کە سەرۆکی پارتی تورکمان ئیللییەو یەکێکە لەسەرکردە دیارەکانی نێو بەرەی تورکمان بەڕوونی داوای حیواری کوردی- تورکمانی کرد. ئەم بانگەشەیە لەلایەن چەندین کەسایەتی تری تورکمانی وەك د. موزەففەر ئەرسەلان و کەنعان شاکر ئاغالی دوپات کرایەوە(١٦).

وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا شکستی بەرە لە هەڵبژاردنەکانی عیراق شاڵاوی رەخنەی داباراندە سەر سەرانی بەرە، بەتایبەتی د. فاروق عەبدوڵڵا. لەڕاستیدا هەندێك لەو رەخنانە پەیوەندی راستەوخۆی بە هەڵبژاردنەکانەوە نەبوو و هی قۆناغەکانی پێشتر بوو، بەڵام ئەم شکستە دەرگای لەبەردەم رەخنەو خۆ پیاچوونەوەی تورکمانەکان کردەوە.

رەخنەو گرفتەکان تەنها لەیەك ئاستو یەك مەسەلە قەتیس نەمابوون بەڵکو چەندین لایەنو ئاستیان گرتەوە، دەکرێ هەندێ لە گرنگترین گرفتو کێشەکانی پێش بەستنی کۆنگرەی چوارەم دەستنیشان بکەین، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١-رەخنەی تورکمانەکانی دەرەوەی کەرکوك لە سەرۆکایەتیی بەرە کە پێیان وایە تەنها گرنگی بە تورکمانەکانی کەرکوك دەدات و ناوچەکانی تری، بەتایبەتی هەولێر و تەللەعفەر، پشتگوێ خستوە. رەخنەگران پێیان وابوە گرنگی نەدانی بەرە بەناوچەی تەللەعفەر یەکێ بووە لە هۆکارەکانی دەنگنەدانی ئەم ناوچەیەو لەدەستدانی دەنگی تورکمانەکانی ئەوێ.

تورکمانەکانی هەولێریش هەمان ڕەخنەیان لەسەرۆکایەتی بەرە گرتو نمونەی ئەوەیان هێنایەوە کە گوایە لە ٦٣ کەس کە بۆ هەڵبژاردنەکانی عێراق لەسەر لیستی بەرەی تورکمانی پاڵێورابوون تەنها یەك تورکمانی هەولێری تێدا بوو، بەپێی بۆچونی ئەمان گوێنەدانی سەرانی بەرەی تورکمانی بە تورکمانەکانی هەولێر بووە هۆی دەنگنەدانی تورکمانەکان بە لیستی بەرە لە هەولێر(١٧).

٢ گرنگترین مەسەلە کەپێش بەستنی کۆنگرە باسی لێوە دەکراو کێشەیەکی ئاشکرای دروست کردبوو چارەنوسی خودی بەرەی تورکمانی بوو، ئەم مەسەلەیە تورکیاو لایەنە جیاجیاکانی تری بەرەی تورکمانی لەسەری کۆك نەبوون.

تورکەکان پاش هەڵبژاردنەکان گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە شێوازی ئێستای پێکهاتەی بەرە پێویستی بە گۆڕانەو ناتوانێ بەو شێوەیەی ئێستا لەکارەکانیدا سەرکەوتو بێت. بۆچوونی تورکەکان بۆ ئایندەی بەرەی تورکمانی لەم چەند خاڵەدا کورت کرابۆوە:

١) هەڵوەشاندنەوەی بەرەی تورکمانی و سەرجەم پارتەکانی نێو بەرە.

٢) لابردنی د. فاروق عەبدوڵڵا لەسەرۆکایەتیی بەرە.

٣) پێکهێنانی پارتێکی تورکمانیی یەکگرتوو لەسەرجەم پارتەکانی نێو بەرەی تورکمانی لە ژێر ناوی (( پارتی بەرەی تورکمانی)).

٤) هاندانی ئەم پارتە بۆ زیاتر خۆگونجاندن لەگەڵ دۆخی تازەی عیراقو هێنانەوەی نمونەی تورکەکانی بولگاریا بۆ تورکمانەکانی عیراق وەك نمونەی ئەو سیاسەتە.

تورکمانەکان لە نێو خۆیاندا لە سەر چارەنوسی بەرەی تورکمانی یەکدەنگ نەبوون. سەرۆکی بەرە د. فاروق عەبدوڵڵا بە توندی دژی بیرۆکەی هەڵوەشاندنەوەی بەرە راوەستا و هەوڵی دا کە ئەم بیرۆکەیە نەچێتە بەرنامەی کاری کۆنگرەوە، هەر بۆیە لە ناوەڕاستی مانگی ئازاردا بە یاوەریی یاوز عومەر عادل سەرۆکی مەکتەبی بەرە لە کەرکوكو سوبحی سابیر راوێژکاری سیاسیی بەرە شاڵاوێکی فراوانی لە کەرکوكو ناوچەکانی تر بۆ کۆکردنەوەی

ئیمزا لەسەر مانەوەی بەرەی تورکمانی بەرپا کرد. بەڵام پێدەچوو ئەم هەوڵە لەلایەن پارتەکانی تری نێو بەرەوە بەربەرچ درابێتەوە.

پارتەکانی نێو بەرەی تورکمانیش، بەتایبەتی پارتی تورکمان ئیللی بەسەرۆکایەتی ریاز ساری کەهیەو پارتی بزوتنەوە بێلایەنەکان بە سەرۆکایەتی کەنعان شاکر ئاغالی، لەگەڵ ئەوەدا بوون کە بەرەی تورکمانی هەڵبوەشێتەوە و پارتە سیاسییە تورکمانەکانیش وەکو خۆیان بمێننەوە و بەسەربەخۆیی کاری خۆیان بکەن.

٣-مەسەلەی تورکمانی شیعە و تورکمانی سوننە لە نێو کێشەکاندا ئامادەییەکی بەردەوامی هەبوو. شیعە تورکمانەکان پێشتر بەهۆی کەمیی ژمارەیان لە ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستانی عیراق رۆڵێکی سیاسیی ئەوتۆیان نەبوو، بەڵام پاش روخانی رژێمی سەددام ناوچە شیعە تورکماننشینەکانی کوردستان، بەتایبەتی لە داقوق و تازە و دوز، چالاکییەکی زۆریان بەخۆوە بینی، سەرکەوتنی لیستی ئیئتلافی شیعەکان لە هەڵبژاردنەکانی عیراق ئەوەندەی تر باڵی تورکمانە شیعەکانی ئەستورتر کرد.

پاش هەڵبژاردن سەرانی بەرە کەوتنە رەخنە گرتن لە سەرکردە تورکمانە شیعەکان و تۆمەتی ئەوەیان خستە پاڵ کە گوایە گوێ بە سۆزی نەتەوایەتی نادەن، بۆ نمونە د. فاروق عەبدوڵلا لە کۆبونەوەیەکی فراوان کە رۆژی ٢/٣ لە بارەگای بەرە بەسترا راشکاوانە رەخنەی توندی ئاراستەی عەباس بەیاتیی سکرتێری یەکێتیی ئیسلامیی تورکمانەکانی عیراق کرد و بەوە تاوانباری کرد کە کەسێکی مەزهەبییەو نەتەوەکەی خۆی پشتگوێ خستەوە. ئەم رەخنەیە پاش سێ (٣) رۆژ لە هەڵبژاردنەکانی عیراق هات و نیشانەیەکی ئاشکرا بو بۆ باری دەرونیی سەرانی بەرەی تورکمانی(١٨ ).

لەلایەکی ترەوە تورکەکان رەخنەیان لەبەرەی تورکمانی گرت و بەوە تاوانباریان کرد کە زۆر دۆستانە مامەڵە لەگەڵ ئێران دەکا و لەگەڵ مامەڵەی شیعەکانی عیراق بۆ ئێران هیچ جیاوازییەك یان نییە. ئەم رەخنەیە پاش پێشنیارێکی سەرۆکی شورای تورکمان د. سەعدەدین ئەرکیج هات کە داوای

کردبوو تورکمانەکانی بەرە هاوپەیمانێتی لەگەڵ لیستی ئیئتلافی شیعە بکەن، رێگرتنی تورکیا لەم داوایە بوە هۆی لەبار چوونی ئەم هەوڵەی ئەرکیج.
٤-مامەڵە کردن لەگەڵ پارت و لایەنە کوردییەکان خاڵێکی تری دروستبونی ململانێ و کێشە بوو لە نێو سەرانی بەرە.

ئەنجامەکانی هەڵبژاردن و مانەوەی تورکمانەکانی بەرەی تورکمانی وەك هێزێکی بچوك و ناکاریگەر مەسەلەی چاوخشاندنەوە بە ستراتیجی پەیوەندییە دووقۆڵییەکانی بەرەی خستە بەر باس و لێکۆڵینەوە. هەندێ لەسەرانی بەرە پێیان وابو سیاسەتی بەرە لەگەڵ کوردەکان زۆر سلبی بووە، بەهیچ شێوەیەك لەبەرژەوەندیی تورکمانەکان نەبووە، تورکمانەکانی هەولێری نێو بەرەی تورکمانی و ریاز ساری کەهیە و جەمال شان بەرجەستەترین کەسان و لایەنی ئەم بیرکردنەوە تازەیەی تورکمان بوون. کەهیە لە چەندین بۆنەی جیاوازدا بانگەشەی بۆ نزیکبونەوەی کورد و تورکمان کردو رەخنەی لە سیاسەتی پێشووی بەرە گرت.

قوڵبوونەوەی ئەم کێشانە بە شێوەیەکی ترسناك کاری کردە سەر جێبەجێکردنی ئەرکەکانی بەرەی تورکمانی و بەهۆی ئەو رەخنە توندانەی کە ئاراستەی سەرۆکی بەرە سەبارەت بە هۆکارەکانی شکستی ئینتخابیی بەرە کران و لە ئەنجامی بانگەوازی بۆ دانوستاندن لەگەڵ کوردەکان و بە لەبەرچاوگرتنی رەخنەو ئامۆژگارییەکانی تورکیا پێگەی سەرۆکی بەرە لەنێو بەرەی تورکمانیدا لەق و کز بوو. ئەم دۆخە پاڵی بەسەرکردە نارازییەکانی نێو بەرە نا کە بانگەشە بۆ بەستنی کۆنگرەیەکی گشتیی تورکمان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بکەن. لە راستیدا بەپێی پەیرەوی ناوخۆی بەرەی تورکمانی کۆنگرە سێ (٣) ساڵ جارێ دەبەسترێ، واتە دەبوایە کۆنگرە لە کۆتاییی ساڵی ٢٠٠٦ ببەسترێت، بەڵام لەبەر زۆربونی رەخنە و ململانێ دژ بە سەرۆکی بەرە و دەرکەوتنی چەندین باڵی سیاسیی جیا جیا بڕیاری پێشخستنی وادەی بەستنی کۆنگرەی چوارەمی تورکمانی درا.

## کۆنگرەی گشتیی چوارەمی تورکمان:

لەبەر رۆشنایی‌ی ئەو هەلومەرجە نالەبارەی توشی بەرەی تورکمانی ببوو بەهۆی ئەو ململانێ و گیروگرفتانەی هاتبونە پێش سەرانی بەرە کۆنگرەی گشتیی چوارەمی تورکمان لە ٢٢ی نیسانی ئەمساڵ (٢٠٠٥) لە هۆڵی (شەهید ئیبراهیم ئیسماعیل تۆفیق) لە بەڕێوەبەرایەتی چالاکی خوێندنگاکان لە کەرکوك بەسترا(١٩).

وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا ئەنجامەکانی هەڵبژاردنەکانی ١/٣١ رۆڵێکی سەرەکی‌یان لە تەقاندنەوەی کێشەکانی بەرەی تورکمانی گێڕا، ئەم کۆنگرەیە وەك وێستگەیەکی چارەنوسساز بۆ رێکخستن‌و چاککردنی باری شلۆقی بەرەی تورکمانی سەیر دەکرا.

لە سەرەتای بەستنی کۆنگرە بەرەی تورکمانی توشی یەکەمین شکست بوو کاتێك دوو پارتی سەرەکی بەرەی تورکمانی، پارتی تورکمان ئیللی و بزوتنەوە بێلایەنەکانی تورکمان کشانەوەی خۆیان لە تەشکیلاتی بەرەی تورکمانی راگەیاند، هەرچەند پارتی تورکمان ئیللی وەك حیزبێکی سەربەخۆی دوور لەبەرە بەشداری‌ی لەکۆنگرەکە کرد، بەڵام بزوتنەوەی بێلایەنە تورکمانەکان (مقاطعة)ی کۆنگرەکەی کرد.

کشانەوەی ئەو دوو پارتە لەبەرەی تورکمانی لەکاتی بەستنی کۆنگرەکەدا گورزێکی مەعنەوی‌و مادی‌ی توند بوو کە توشی رێکخەرانی کۆنگرەکە بوو.

یەکەمین رۆژی کۆنگرەکە هەست بە بێسەروبەرییەکی زۆر لەمەسەلەی رێکخستنی کاروباری کۆنگرە دەکرا ،کۆنگرەکە بەبێ هیچ خۆئامادەیی‌یەکی ئیعلامی‌ی پێشوەخت کرا و بۆ زۆربەی لایەنی تورکمانیش کت و پڕ بو (٢٠). ئیش و کاری نێو هۆڵی کۆنگرەکە زۆر بە خراپی بەڕێوە دەچوون و کەس ئاگای لە دەنگی وتاربێژەکان نەدەبوو. هەروەها نەبوونی ئامرازێکی فێنکی لەهۆڵەکەدا ئەوەندەی تر کەش و هەوای ناو کۆنگرەی ئاڵۆزتر کرد.

لەکەش و هەوایەکی ئاڵۆزدا پێنج لایەنی سەرەکی‌ی بەرەی تورکمانی کە پێکهاتبون لە پارتی نیشتمانی‌ی تورکمانی عیراق و پارتی تورکمان ئیللی و

پارتی بزوتنەوەی بێلایەنە تورکمانەکان‌و بزوتنەوەی ئیسلامیی تورکمانی عیراق و یەکێتیی عەشایرە تورکمانەکان بەشدارییان لەم کۆنگرەیە کرد، بەڵام لەیەکەمین رۆژی کۆنگرەدا پارتی تورکمان ئیللی و بزوتنەوەی بێلایەنی تورکمان کشانەوەی خۆیان لەبەرە راگەیاند.

جگە لەو پارتانەی نێو بەرە چەند پارتێکی تر بەشداریی کۆنگرەی تورکمانییان کرد، وەك پارتی عەدالەت و رزگاریی تورکمان‌و بزوتنەوەی نەتەوەیی تورکمان و بزوتنەوەی وەفای تورکمانی عیراق‌و یەکێتیی ئیسلامیی تورکمانی عیراق‌و کۆمەڵەی ناسیۆنالیستە تورکمانەکان(٢).

پاش تەواو بوونی تاقی بەیانیی یەکەم رۆژی کۆنگرە کەبۆ میوان و قسەی پرۆتۆکۆلی تەرخان کرابوو، ئێوارەی رۆژی یەکەم، واتە ٢٢ی نیسان بەشداربوان دیوانی کۆنگرەیان بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی کۆنگرە هەڵبژارد، دیوان پێکهاتبوو لە: د. موزەفەر ئەرسەلان سەرۆکی دیوان و دوو یاریدەدەر بەناوی مستەفا زیائی و عیسام تەرزی باش.

بەشداربووانی کۆنگرە هەر لەسەرەتاوە رەخنەیان لە شێوەی بەڕێوەبردنی کۆنگرە گرت، بۆ نمونە تورکمانە شیعەکان باسی ئەوەیان کرد کە هەندێ کەسانی نێو بەرە، وەك د. سەعدەدین ئەرکیج، بەبێ پرسی کەس مافی بەشداریکردن لە کۆنگرەی داوە بەهەندێ کەس و ئەو مافەی لەخەڵکی تر سەندۆتەوە و ئەرکیج بەوە تاوانبار کرا کە ژمارەی سوننەکانی بەرامبەر بەشیعەکان زۆر زیاد کردوە بەشێوەیەك کە ژمارەی تورکمانە سوننەکان گەیشتۆتە ٣٥٠ کەس لەکۆی ٤٣٠ کەس کە سەرجەم بەشداربووانی کۆنگرەکە بوون، ئەم رەخنەیە کێشەیەکی گەورەی لە نێو تورکمانە شیعە و سوننەکان دروست کرد(٢١ ).

کێشەی نێوان تورکمانەکانی کەرکوك‌و هەولێر جارێکی تر لەم کۆنگرەیەدا رەنگی دایەوە، تورکمانەکانی هەولێر رەخنەی ئەوەیان لەکۆنگرە گرت کە کەسایەتی‌یەکی سیاسیی تورکمانی هەولێری تێدا نی‌یە، تەنها ئازاد کورەچی نەبێت ئەویش پاش نەخۆشبوونی کەسێکی کەرکوکی بانگهێشت کرا (٢٠).

رۆژی دووەمی کۆنگرەکە پاش هەڵبژاردنی سەرۆکی دیوانی کۆنگرە بە شێوەیەکی باشتر بەڕێوە چوو (١٩). ئامادەبوان هەندێکیان رەخنەو هەندێ تریش پێشنیاری تازەیان پێشکەش کرد.

سەرۆکی پارتی ئیللی تورکمانی ریاز ساری کەهیە رەخنەی لە کۆنگرەکانی پێشووی بەرە گرت و داوای کرد کە ئەم کۆنگرەیە درێژەپێدەری ئەو کۆنگرانە نەبێت و بتوانێت مالّی تورکمانەکان یەکبخات(٢١)، مەسەلەیەك کە کەهیە راشکاوانە باسی لێوە کرد کرانەوە بوو لەسەر سەرجەم لایەنەکانی تری عیراق، وەکو کورد، داوای بەستنی حیوارێکی کوردی- تورکمانی کرد. بڕیار بوو کۆبونەوەکان ٣ رۆژ (٢٢-٢٤/ نیسان) بخایەنێت بەڵام پاش تەواو بوونی ماوەکە ئاشکرا بوو کە بەشداربوان نەیانتوانی کۆدەنگی‌یەکیان لەسەر بەرنامەو پۆستی سەرۆکی بەرە دەسکەوێ.

مەسەلەی یەکخستنی بەرەی تورکمانی لەیەك پارتو هەڵوەشانەوەی سەرجەم پارتەکانی تری بەرە کە یەکێك بوو لە گرنگترین کارنامەکانی کۆنگرە سەری نەگرتو ئەندامانی کۆنگرەو نوێنەرانی پارتەکان رازی نەبوون لەسەر هەڵوەشانەوەی پارتەکانیان، بەم شێوەیە بیرۆکەی دروستبونی پارتێکی سیاسی‌ی یەکگرتوی تورکمانی لەبار برا( ٢٠).

تورکمانەکانی هەولێر بەهۆی پشتگوێ خستنیان لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی کۆنگرەوە هەڵوێستێکی توند و یەکلاکەرەوەیان نواند کاتێك لە رۆژی دووەمی بەستنی کۆنگرەو لەگەرمەی ئەو ململانێو گفتوگۆیە توندانەی لە نێو بەرە بەڕێوە دەچوو ئیعلانی کشانەوەی بەشێکی زۆری ئەندامانی بەرەی تورکمانییان، بەسەرۆکی فەرعی هەولێر عەبدولقادر بازرگانو سباح کورەچی‌ی بەرپرسی ناوچەی باشوری بەرە لەبەرەی تورکمانی راگەیاند(٢٦)، هۆی کشانەوەی بازرگان و کورەچی ، وەکو لە دوو بەیاننامەی جیادا باسیان لێوە کرد، بۆ ئەوە بو کە سەرکردایەتی‌ی بەرە ناوچەکانی تری تورکماننشینی پشتگوێ خستوە و تەنها گرنگی‌ی بە کەرکوك داوەو هەروەها تۆمەتی ئەوەیان خستە پاڵ بەرە کە دژایەتی‌ی نەتەوەکانی تر دەکات (٢٥).

بەڵام سەرەکیترین مەسەلە کەکاری کردە سەر سەرجەم کارەکانی بەرەو بووە هۆی دواخستنی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بەرە بۆ کاتێکی نادیارو شکستهێنانی عەمەلی‌ی کۆنگرە مەسەلەی هەڵبژاردنی سەرۆکێکی نوێ بوو بۆ بەرە، ئەم مەسەلەیە چارەنوسی سیاسی‌ی بەرەی تورکمانی‌ی خستە مەترسی‌یەوە.

لەسەرەتای کردنەوەی دەرگای خۆ پاڵاوتن بۆ سەرۆکایەتی‌ی بەرە کۆدەنگی‌یەك لەسەر کەسێکی دیاریکراو نەبوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە مونافەسە لەسەر کورسی‌ی سەرۆکی بەرە ئەوەندە توند بو کە نزیکەی ((٢٠)) کەس بەرەسمی خۆیان بۆ پۆستی سەرۆکی بەرە پاڵاوت(٢٠).

لە نێو ئەو ٢٠ کەسەی کە خۆیان بۆ سەرۆکایەتی‌ی بەرە پاڵاوتبوو چوار کەسایەتی‌ی بەهێزی تیادا بەدی دەکرا، ئەو چوار کەسایەتی‌یە پێك هاتبوو لە د. فاروق عەبدوڵڵا سەرۆکی ئەوکاتەی بەرەی تورکمانی و د. سەعدەدین ئەرکیج سەرۆکی شورای تورکمانی(پەرلەمان) د.رەشاد مەندان عومەر وەزیری زانست و تەکنەلۆجیا لە حکومەتی عەللاوی‌و عەلی مەهدی سەرۆکی فراکسیۆنی تورکمانی لە ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك.

بیرو بۆچونی ئەم چوار پاڵێوراوە تا ئاستێکی دیار لەگەڵ یەك جیاواز بوو، سەرۆکی بەرە د. فاروق لە نێو بەرەدا بە کەسێکی نزیك لە پارتە عەرەبە سوننەکان لەقەڵەم دەدراو رەخنەیەکی زۆری لەسەر هەبوو، لەراستی‌دا عەبدوڵڵا تەنها پشتی بەناوبانگی باوکی، زەعیم روکن عەبدوڵڵا عەبدولڕەحمان بەستبوو کەرژێمی سەدام ساڵی ١٩٨٠ لە سێدارەی دابوو، عەبدولڕەحمان لە نێو تورکمانەکاندا رێزێکی تایبەتی هەبووە.

رەنگە د. سەعدەدین ئەرکیج لە سێ کەسەکەی تر زیاتر پێگەی لەنێو بەشداربوانی کۆنگرە بەهێزتر بوبێ، چونکە سەرەڕای ئەوەی ئەرکیج یەکێك بوو لە هەڵسوڕێنەرە سەرەکی‌یەکانی رێکخستنی نهێنی‌ی تورکمانی لەکەرکوك، ئەم کەسایەتی‌یە بەهۆی سەرۆکایەتی کردنی ئەنجومەنی شورای تورکمانەوە لە نێوان ٢٠٠٣-٢٠٠٥دا توانی لایەنگرێکی زۆر بۆ خۆی لە کەرکوك پەیدا بکات‌و پاشان بیاغزێنێتە نێو کۆنگرەوە. ئەرکیج لەروی شەخسی‌یەوە بە کەسێکی

پراکتیکی ناسراوه و خاوەن بۆچونی تایبەتە سەبارەت بەچۆنیەتیی پێکەوەژیانی نەتەوەکان لەکەرکوک.

سەبارەت بە د. مەندانیش کەسێکی تەکنۆکرات بوو و ئەزمونێکی ئەوتۆی سیاسیی نەبوو. کەسایەتیی چوارەم عەلی مەهدییە کە تورکمانێکی شیعەی سەر بە پارتی تورکمان ئیللییەو لەڕوی سیاسییەوە کراوە و پراکتیکییە، بەلاّم بەهۆی کەمیی ڕێژەی تورکمانە شیعەکان لە کۆنگرە و هەڵوێستی پارتی تورکمان ئیللی لە مانەوە لەبەرە چانسێکی ئەوتۆی لەبەردەمدا نەبوو.

ڕۆژی سێیەمی کۆنگرەکە بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی بەرە و دەستەی بەڕێوەبردنی بالاّی بەرە ( یورتما) تەرخان کرا، لە کاتی هەڵبژاردنەکەدا مونافسەیەکی توند لە نێوان پالێوراوان، بەتایبەت نێوان د. فاروق عەبدوللاّو د. سەعدەدین ئەرکیج پەیدا بوو بەشێوەیەك کە مەسەلەکە گرژیی لیّ کەوتەوە، پاش تەواو بونی ماوەی دیاریکراو دەرکەوت کە کۆنگرە ناتوانێ کارەکانی خۆی لەکاتی خۆیدا تەواو بکات، بۆیە بەناچاری کۆنگرە بۆ ڕۆژی دواتر درێژ کرایەوە.

سەرباری درێژ خستنەوەی ماوەی کۆنگرە دەنگدەران بەهۆی((زۆریی جیاوازیو نەبوونی کۆ دەنگی))(٢٢) بۆ چەندین جار شکستیان لە هەڵبژاردنی دەستەی سەرۆکایەتیو سەرۆکی بەرە هێنا، هەرچەند چەندین کەسایەتیی ناوداری تورکمان، وەکو د. موزەفەر ئەرسەلان، و تورکەکان هەوڵی زۆریان بۆ یەکخستنی رایەکان دا، بەلاّم پێدەچوو ململانێکان زۆر توند بن، بۆیە لەڕۆژی پێنجەمی کۆنگرەی تورکمانیدا د. موزەفەر ئەرسەلان راگەیاندنێکی بەناوی دیوانەوە بلاّوکردەوە و تیایدا شکستهێنانی کۆنگرەی لەهەڵبژاردنی سەرۆکی بەرەی راگەیاند(٢٤).

سەرباری زمانە نەرم و نیان و دبلۆماسییەکەی ئەرسەلان لەباسکردنی کاروبارەکانی کۆنگرە، ئەرسەلان نەیتوانی ئەم شکستهێنانەی بەرە بشارێتەوە ، ئەرسەلان لە وتەکەیدا نیگەرانیی خۆی بۆ پاشەڕۆژی بەرە نیشان دا.

لەدێڕێکی راگەیاندنەکەدا هاتووە (( ... بەهۆی نەبوونی یەکبۆچوون و نەبوونی ئیتفاقێك لەسەر ناوی پالێوراوەکان و لە پێناوی رێگرتن لە هەندێ

داری دلتەزێن و پاراستنی مەسەلەی تورکمان ناچار بوون دانیشتنی تایبەت بە هەڵبژاردنی پێکهاتەی بەرە دوا بخەین))( ٢٤).

بە هۆی تەقینەوەی ململانێکانی نێو بەرەوە ترسی ئەوە هاتە ئاراوە کە دووبەرەکی و، تەنانەت پێکدادان، لە نێوان باڵە جیاجیاکانی بەرە دروست بێت، بۆیە دەبینین کە ئەرسەلان راشکاوانە ئاماژەی بەو نیگەرانییە دا کاتێک لە دێرێکی راگەیاندنکە نوسیبوی(( لە پێناوی رێگرتن لە رووداوی دلتەزێن و بڕیارماندا بوار لە بەردەم بەستنی هەر کۆڕو کۆبونەوەیەکی نارەسمی بگیرێت کە دەبێتە هۆی دروست بوونی تەکەتولاتی لاوەکی کەکەس ناتوانێ پێشبینیی ئایندەی بکات)(٢٤).

بەم شێوەیە لە راگەیاندنێکی رەسمیی دیوانی کۆنگرەی گشتیی تورکمانیدا کە تاقە دامەزراوی رەسمیی بەرە بوو لە کاتی بەستنی کۆنگرە مەسەلەی دانپیانانێکی ئاشکرا بە بوونی ململانێ و گیروگرفت نراو داوا لە تورکمانەکان کرا کە یەکگرتو بن وخۆ لە کۆڕو کۆبونەوەی لابەلا بپارێزن. هەرچەند لە راگەیاندنەکەی دیوانی کۆنگرەدا ئەوە روون نەکرا بووەوە کە دواخستنی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی تا کەی دەبێت بەڵام لەو کۆنگرە رۆژنامەنوسییەی بۆ مەسەلەی راگەیاندنی دیوان تەرخان کرا د. ئەرسەلان رایگەیاند کە دواخستنەکە بۆ ماوەی (١) مانگ تێنایەڕێ و پێویستە لەو ماوەیەدا (٢٥/٤-٢٥/٥) هەڵبژاردنی سەرۆکی بەرە بکرێت.

پاش شکستهاتنی کۆنگرەی گشتیی چوارەمی تورکمان لە گەیشتن بەو ئامانجەی کە پێشتر بۆ خۆی دەستنیشانی کردبو و دوای ئەوەی کە کۆنگرە نەیتوانی سەرکردایەتییەکی نوێ هەڵبژێرێ باری سیاسیو رێکخراوەییی بەرە بە بەراورد لەگەڵ جاران روو لە خراپتر بوو.

لە ٢٠٠٥/٥/٣، پاش هەشت رۆژ لە تەواو بوونی کاروبارەکانی کۆنگرە پارتی نیشتمانیی تورکمانی عێراق کەپارتێکی سەرەکیی بەرەو سەرۆکەکەی(جەمال شان) ئەندامی پێشووی سەرۆکایەتی بەرە بوو بەیاننامەیەکی لە کەرکوك بلاوکردەوە، لە بەیاننامەکەدا داوای لە

تورکمانەکانی کەرکوک کرد کە خۆپیشاندان دژ بە فاروق عەبدوڵلا و سەعدەدین ئەرکیج بەرپا بکەن چونکە وەك لە بەیاننامەکە هاتووە(( ئێمە دەمانەوێ کسێك ڕێز لە تورکمان و برایەتی‌ی کەرکوك بگرێت و نامانەوێت دوژمنایەتی لەنێوان نەتەوەکان دروست بکەین))(٢٦).

بۆ ڕێگرتن لەبەردەم زیاتر هەڵوەشاندنەوەی بەرە و لە پێناوی ئیحتوا کردنی ناکامەکانی جیابونەوەی بەشی هەولێری بەرەی تورکمانی وەفدێکی بەرەی تورکمانی ڕۆژی ٤/٥/٢٠٠٥ بەسەرۆکایەتی‌ی سەرۆکی بەرە د. فاروق عەبدوڵلا سەردانی هەولێری کرد. سەرەتا سەردانی عەبدولقادر بازرگانی کردو داوای گەڕانەوەیان بۆ ناو ریزەکانی بەرە لێکرد، بەڵام بازرگان رازی نەبوو بگەڕێتەوە ناو بەرە. پاش سەردانی کردنی حکومەتی هەولێر و نوێنەرانی تورکیا لە هەولێر وەفدەکە بەدەست بەتاڵی گەڕایەوە کەرکوك.

زنجیرەی کشانەوەو جیابونەوە لەبەرە تا ناوەڕاستی مانگی ئایار بەردەوام بوو کاتێك جێگری سەرۆکی پارتی نیشتمانی‌ی تورکمانی عیراق دڵشاد هۆجا و سکرتێری مەکتەبی سیاسی‌ی هەمان پارت (( مەلا قارەچی)) دەست لەکارکێشانەوەی خۆیان لەپارتی نیشتمانی‌ی تورکمانی عیراق و بەرەی تورکمانی ڕاگەیاند. لە بەیاننامەی دەست لەکارکێشانەوەکەدا هاتبوو کە (( بەرەی تورکمانی دژی برایەتی‌ی تورکمان و نەتەوەکانی ترە) ( ٢٧).

پاش تێپەربوونی ماوەی دیاریکراو بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك ئاسۆیەکی رون لەبەردەم هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بەرە نەبوو.

بەهۆی هەوڵەکانی ڕاوێژکاری سەرۆك کۆماری عیراق بۆ کاروباری تورکمان د. موزەفەر ئەرسەلان بۆ یەکخستنی ریزەکانی بەرە، لەبەر رۆشنایی‌ی ئەو راستی‌یەی کە سەرۆکی بەرە د. فاروق عەبدوڵلا پێگەی سیاسی‌و مەعنەوی‌ی خۆی لە نێو بەشێکی زۆری تورکمانەکان‌و تورکیا لەدەست داوە، ڕۆژی ٦/٨ بەسەرپەرشتی‌ی د. موزەفەر ئەرسەلان و سەرۆکی ئەنجومەنی شورای تورکمان کۆبونەوەیەکی فراوانی ئەنجومەنی شورای تورکمان ( پەرلەمان) بەڕێوە چوو و تیایدا نۆ ئەندامیان بۆ لیژنەی راپەڕاندنی بەرەی تورکمانی هەڵبژارد. بەهۆی

سەرۆکایەتی د. ئەرکیج بۆ شورای تورکمان زۆربەی ئەندامانی دەستەی باڵای هەڵبژێردراوی بەرە لایەنگری ئەو بوون. لەم کۆبونەوەیەی شورای تورکمانی بڕیار درا کە لە ٧/٨ سەرۆکی بەرە دەستنیشان بکرێت، بەڵام بەهۆی ئەو گوشارە ناوخۆیی‌و ئیقلیمی‌یانەی خرانە سەر سەرۆکی بەرە رۆژی ١٢/٦ د. فاروق عەبدوڵڵا خۆی لەسەرۆکایەتی‌ی بەرەی تورکمانی کێشایەوە، بەم شێوەیە سەرۆکایەتی‌ی فعلی بەرە، بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی بەرە، کەوتە دەستی د. سەعدەدین ئەرکیج، ئەرکیجیش هەر لە هەمان کۆبونەوەدا بەرەسمی بوو بە سەرۆکی حەوتەمی بەرە*.

## کۆبەند

بەرەی تورکمانی لەسەرەتاوە بۆ ئەوە دروست بوو کە باڵ‌و پارتە سیاسی‌یە جیاجیاکانی تورکمان لە نێو یەك بەرەی یەکگرتودا یەك بخات. لەسەرەتای پێکهێنانی بەرە لە ٢٤ی نیسانی ١٩٩٥ تاکو روخانی رژێمی سەددام لە ٩ی نیسانی ٢٠٠٣ ململانێ‌و گیروگرفتەکانی نێو بەرە زیاتر لەنێوان تورکمانەکانی کەرکوك‌و تورکمانەکانی هەولێر بوو، ئەم ململانێیە بەشێوەیەك توند بوو کە بوە هۆی دروستبونی پێکدادانی چەکداری لە نێوان ئەم دوو گروپە و پاشان دەستێوەردانی تورکیا لە ململانێکە بۆ بەرژەوەندی‌ی تورکمانەکانی هەولێر.

پاش روخانی رژێمی سەددام تورکمانەکانی کەرکوك لە بەر چەندین هۆ داشیان بەسەر تورکمانەکانی هەولێر سوار بوو، ئەوە بۆ خۆی بەڵگەیە کە دوای روخانی سەدام بە ((٥)) مانگ لە کۆنگرەی سێیەمی تورکماندا بەرەی تورکمانی بەتەواوی گۆڕانی بەسەردا هات‌و تورکمانەکانی کەرکوك دەستیان

---

* پاش دە رۆژ لەهەڵبژاردنی ئەرکیج و لە ٢٠٠٥/٦/٢٢ هەوڵێك بۆ تیرۆرکردنی ئەرکیج لە کەرکوك درا، ئەرکیج تیایدا سەلامەت بوو، بەڵام پاسەوانەکانی توشی زەرەر بوون. هەرچەند ئێستا دەرنەکەوتووە کێ لە پشت هەوڵی تیرۆرکردنی ئارکیجەوەیە بەڵام کاتی روداوەکە کە پاش ١٠ رۆژ لە هەڵبژاردنی ئارکیج بۆ سەرۆکایەتی بەرە دێت پاش ئەو ململانێیە توندەی لەسەر سەرۆکایەتی‌ی بەرە بەرێوە چوو، مەسەلەی پەیوەندی‌ی ئەم هەوڵە بە ململانێ‌یە ناوخۆکانی بەرەوە بە دور نازانرێ.

بەسەردا گرت. ئیتر لەو کاتەوە ململانێو کێشمەکێش زیاتر کەوتە نێو خودی تورکمانەکانی کەرکوك.

ململانێکانی نێو کۆنگرەی چوارەمی گشتی تورکمان لەژێر کاریگەریی چەندین هۆکاری ئیقلیمیو ناوخۆیی‌دا دروست بوو، لێرە دەتوانین ئەو هۆکارانە بەم شێوەیەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

١-شکستهێنانی سەرۆکایەتی بەرە لەبەڕێوەبردنی کاروباری ئێستای تورکمان: لەم دۆخە تایبەت و ناسکەی ئێستای عێراق تێیدا تێپەر دەبێت سەرکردایەتیی بەرەی تورکمانی لە ماوەی نێوان هەردوو کۆنگرەی سێو چواردا (٢٠٠٣-٢٠٠٥) نەیتوانی بەشێوەیەکی کارامە مامەڵە لەگەڵ مەسەلە سیاسییەکانی عێراق بکات و لەبەرژەوەندیی تورکمان بەڕێوەی ببات. ئەم سەرکردایەتییە بەردەوام لەلایەن تورکمانەکانەوە رەخنەی لێدەگیرا کە ناپسپۆرە و مەسەلەی تورکمانی بەشکست هێناوە، رەخنەکان زیاتر جەختیان کردبوە سەر شکستەکانی بەرەی تورکمانی لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوكو پەرلەمانی عێراق.

٢-ئەنجامەکانی هەڵبژاردنە سەرتاسەرییەکەی عێراق لە ٣١/١ی ئەمساڵ کە تیایدا بەرەی تورکمانی تەنها ٩٣ هەزار دەنگی دەستەبەر کرد ئاماژەیەکی روون و ئاشکرا بوو بۆ سەنگی راستەقینەی تورکمان، ئەم ئەنجامانە پاڵیان بە تورکیاوە نا کە بەشێوەیەکی ریشەیی چاو بە رۆڵی، تەنانەت پێکهاتەی، بەرەش بخشێنێتەوە. گۆڕینی شێوازو پەیرەو و پرۆگرامی بەرە یەکێك بوو لە خاڵە سەرەکیەکانی بەرنامەی کاری کۆنگرە.

٣-بەهۆی پاوانکردنی زۆربەی هەرە زۆری پۆستە سەرەکیەکانی بەرە لەلایەن تورکمانەکانی کەرکوکەوە دەنگی نارەزایی لە نێو تورکمانەکانی نارچەکانی تر، وەکو هەولێرو تەللەعفەر و دوز، بەرزبۆوە، تورکمانەکانی دەرەوەی کەرکوك سەرانی بەرەیان بەوە تاوانبار کرد کە تورکمانەکانی دەرەوەی کەرکوکیان پشتگوێ خستوەو هیچ بایەخێکی پێنادەن. بۆیە دەبینیت بەشێك لە تورکمانەکانی هەولێر، لەکاتی کۆنگرەو پاش کۆنگرەش کشانەوەی خۆیان لە بەرەی تورکمانی راگەیاند.

٤ -مەسەلەیەك كەپێشتر جێی مشتومڕو ململانێ نەبو، لەم كۆنگرەیەدا سەرەتی خۆی نواند ئەویش مەسەلەی توركمانە شیعەكانە. پێش رزگاركردنی عێراقە شیعە توركمانەكان بەهۆی دابەشبونیان لەناوچەكانی ژێر دەسەلاتی سەددام و بەپێی بوونی توركیای عیلمانی و سوننە مەزهەب وەك پاڵپشتی سەرەكیی بەرە رۆڵێكی ئەوتۆیان لە نێو بەرەی توركمانیدا نەدەگێڕا. بەلام پاش ٩ی نیسان ئەو هاوكێشەیە بەتەواوی گۆڕا بەتایبەتی كە شیعەكانی عێراق وەك هێزێكی سەرەكیی عێراق هاتنە مەیدان و پەیوەندیی بە هێزیشیان لەگەڵ توركمانە شیعەكان هەبوو. ئەم هۆكارانە باسكی توركمانە شیعەكانی ئەستور كرد و پاڵی پێوەنان كە هەوڵی رۆڵێكی فراوانتر بدەن، ئەو هەوڵەی كە بێ گرفت و ململانێ بەڕێوە نەچوو.

٥ -مەسەلەی پەیوەندیی برایانە لەگەڵ نەتەوەكانی تر، بەتایبەت كورد، گرفتێكی تری ئەجندەی سیاسیی كۆنگرە بوو كە مشت و مڕێكی زۆری نایەوە. لە كۆنگرەكانی تردا ئەم مەسەلەیە گرنگیەكی پرۆتۆكۆلی و ئیعلامیی هەبو، بەلام بە پێچەوانەوە لەم كۆنگرەیەدا وەك مەسەلەیەكی چارەنوسساز باس كراو هەندێ باڵی نێو بەرە راشكاوانە بانگەشەیان بۆ حیواری كوردی- توركمانی كرد.

كۆنگرەی گشتیی چوارەمی بەرە زۆر مەسەلەی هێنایە ئاراوە كە پێشتر بەرەی توركمانی خۆی لێدەدزییەوە و فەرامۆشی دەكرد. هەرچەند ئەم كۆنگرەیە كاریگەریی دیاری لەسەر لاوازكردنی سەنگی سیاسیی(ناوخۆیی و ئیعلامی) بەرە هەبوو، بەلام بەهۆی ئەو دانوستاندن و گفتوگۆیە توندانەی لەكات و پاش بەستنی كۆنگرە هاتە كایە پێدەچێ بەرەی توركمانی زیاتر لە جاران هەوڵی خوێندنەوەی واقعیی رووداوەكان بدات، رەنگە ئەم گۆڕانكارییانە ببنە مایەی لاواز كردنی هەر سیاسەتێكی توندڕەو. پێدەچێ بەرە ئێستا، لە هەموو كاتێك زیاتر، هەوڵی خۆگونجاندن لەگەڵ دەوروبەرو بەهێزكردنی پەیوەندی لەگەڵ سەرجەم هێزە سیاسیە كوردیەكاندا بدات، هەوڵێك ئەگەر سەرانی بەرە تیایدا جددی و سەركەوتوو بن بە قازانجی زۆر بۆ مەسەلەی توركمان و سەرجەم گروپە ئیتنییەكانی تری كوردستان دەگەڕێتەوە.

**سەرچاوەکان:**


١-گۆران، یوسف : مێژوی سیاسی تورکمان پاش ساڵی ١٩٩١، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە ١،ساڵی حەوتەم، شوباتی ١٩٩٩

٢-رۆژنامەی (المدی) ٢٠٠٥/٤/٢٢.

٣-Temel ilkeler deklasasyounu بڵاوکراوەی تایبەت بە یەکەمین کۆنگرەی گشتی ی تورکمان بەزمانی تورکی.

٤-رۆژنامەی تورکمان ئیللی ( زمانحاڵی بەرەی تورکمانی)، ١٢ی ئابی ٢٠٠١.

٥-حقائق عن الترکمان في العراق، منشورات الرابطة الترکمانیة العراقیة لحقوق الانسان في السوید.

٦-بڵاوکراوەی نوێنەرایەتی بەرەی تورکمانی عیراق لە تورکیا دەربارەی سێیەمین کۆنگرەی گشتی تورکمانی لە کەرکوك ( بە زمانی عەرەبی).

٧-تالیب، جەزا تۆفیق. بایەخی جیۆپۆلەتیکی ی دانیشتوانی هەرێمی کوردستانی عیراق بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٩.

٨-صمانجي، عزیز قادر: التاریخ السیاسي لترکمان العراق، دار الساقي، بیروت ١٩٩٦.

٩-مردان، نصرت: مؤتمر الجبهة الترکمانیة، دلالات و نتائج، جریدة ( الزمان) تاریخ ٢٠٠٣/٩/٢٩.

١٠-مردان، نصرت: لماذا تأخذ امریکا ترکمان العراق بجریرة علاقاتها السیاسیة مع ترکیا؟ مجلة ترکمان العراق، الموقع www.memberslycos.nl.kirkuk.

١١-رۆژنامەی تورکمان ئیللی، ٢٤ی ئابی ٢٠٠٣.

١٢-رۆژنامەی تورکمان ئیللی ٢٠٠٣/٨/٢٨.

١٣-رۆژنامەی (المستقبل)ی لوبنانی رۆژی ٢٠٠٤/١١/٢٩.

١٤ كوبرلـــو، اوميـــد: المؤتمـــر التركمـــاني العـــام الرابـــع، الموقـــع www.syriamirror.net/modules/news تأريخ ٢٤/٤/٢٠٠٥
١٥ الاطرابية، صبري: الابعاد الخفية لمحاولات تقويض الجبهة التركمانية، جريدة الشرق القطرية، يوم ٣/٥/٢٠٠٥.
١٦ رۆژنامەی (( تورکمان ئیللی)) ٢٨/٤/٢٠٠٥.
١٧ انشطار في الجبهة التركمانية، موقع (( المنظار)) www. Almendhar.com تاريخ ٣٠/٥/٢٠٠٥.
١٨ گـۆران، یوسـف: کوردسـتان و مەسـەلەی پێکـەوەژیانی نەتـەوەکان، کەرکوك وەك نمونـە، موحازەرەیەکە پێشکەش بە رێکخسـتنەکانی ی ن ك لە کەرکوك کراوە لە ٢١/٢/٢٠٠٥ و بە رۆنیۆ چاپکراوە، ل ٤.
١٩ کوبرلو، امید، هەمان سەرچاوەی پێشو.
٢٠-القصـاب، نبيـل: يوميـات المؤتمـر التركمـاني العـام، الموقـع www. Iraqiwriter.com.
٢١-رۆژنامەی تورکمان ئیللی ٢٤/٤/٢٠٠٥
٢٢-رۆژنامەی (المدی) ٣٠/٤/٢٠٠٥
٢٣-کوبرلو، امید: هەمان سەرچاوەی پێشو.
٢٤-بەیانی دیوانی گشتی کۆنگرەی تورکمـان کـە لـە ٢٦/٤/٢٠٠٥ لەلایەن د. موزەفەر ئەرسەلانەوە خوێندرایەوە.
٢٥-کوبرلـو، امیـد: ایـن الحقیقـة في ازمـة اربیـل للجبهـة الترکمانیـة. مجلـة تورکمن شاني العراقية.الموقع www.kitabat.com
٢٦-بەیاننامەیـەك بـەناوی پـارتی نیشـتمانی تورکمـانی عـیراق سـەبارەت بەکێشەکانی بەرەی تورکمانی کە لە کەرکوك لە ٣/٥/٢٠٠٥ بلاوبۆتەوە.
٢٧-بـەیانێکی رۆژنامـەوانی لـە ژێـر نـاوی (( نخبـة المنـاضلين التركمـان)) بەعەرەبی لە هەولێر لە بەرواری ٢٣/٤/٢٠٠٥ بلاوکراوەتەوە.






# هەوڵەکانی ئێران بۆ بەدەست هێنانی تەکنەلۆژیای ئەتۆم و هەڵوێستی نێودەوڵەتان

فەیسەڵ عەلی*

پێشەکی:

ئاشکرا کردنی بەرنامە ئەتۆمییەکەی ئێران لەلایەن پارتێکی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانەوە، کە بەنهێنیی و بێدەنگی‌یەکی دوورودرێژ دەستی پێ کردبو، سەرنجی کۆمەڵی نێودەوڵەتی سەبارەت بەمەترسی بەکارهێنانی سەربازی بەرنامە ئەتۆمییەکەی بەلای خۆیدا راکێشا، بەتایبەتیش کەئێران لەم چەند ساڵەی دواییدا چەند تاقیکردنەوەیەکی موشەکی دورهاوێژی ئەنجامدا کەتوانای هەلگرتنی کلاوەی ئەتۆمییان هەیە. بەر لەئاشکرا کردنی بەرنامەکەی ئێران ئەمریکا لەهەوڵەکانی ئێران بۆ بەدەستخستنی تەکنەلۆجیای ئەتۆمی بەگومان بو، بەلاّم ئەوروپییەکان بیروبۆچونێکی جیاوازیان لەوەی ئەمریکا هەبو، ئەوروپیەکان پشتیان بەراپۆرتەکانی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی دەبەست کەهیچ ئاماژەیەکی بەبونی بەرنامەیەکی ئەتۆمی لەئێران نەدابو کەئەگەری بەکارهێنانی سەربازی لێوە بخوێندرێتەوە. بەلاّم لەکاتی ئاشکراکردنی بەرنامە نهێنییەکەی ئێراندا ئەوروپی‌یەکان هاتنە سەر خەت و هەڵوێستیان لەئەمریکیەکان نزیك بوەوە بەتایبەتی دوای ئەوەی پشکنەرانی ئاژانسی وزەی ئەتۆمی راستیی قسەکانی ئۆپۆزسیۆنی سەلماند. مکوڕبونی تاران لەسەر بەردەوامبون لەسەر بەرنامەکەی و درێژەدان بەهەوڵەکانی گومانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی لەئایندەی بەرنامە ئەتۆمی‌یەکەی زیاتر کردو بوە هۆی کردنەوەی

* لێکۆڵیار لەسەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی‌ی کوردستان.

مائلی توانا ستراتیجی‌یه‌کانی ئێران به‌تایبه‌تیش فایلی ئه‌تۆمی‌یه‌که‌ی له‌لایه‌ن ئه‌مریکاوه.

ئه‌مریکا له‌گه‌ڵ هه‌ر پێشکه‌وتنێکی ئێران له‌بواری ته‌کنه‌لۆجیای سه‌ربازییدا نارِه‌زایی له‌به‌رامبه‌ر روسیاو چین ده‌رده‌بڕێت، چونکه ئه‌وان هاوکاری سه‌ره‌کیی ئێرانن له‌و پێشکه‌وتنه‌یدا. سه‌رنج‌و بایه‌خپێدانی کۆمه‌ڵی نێوده‌وڵه‌تی به‌به‌رنامه ئه‌تۆمییه‌که‌ی ئێران بۆ قورسایی ئه‌قلیمی وشوێنه سیاسی‌و کلتورییه‌که‌ی له‌خۆرهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاستدا ده‌گه‌ڕێته‌وه.

خۆرئاوا کار بۆ ئه‌وه ده‌کات که‌ناوچه‌ی که‌نداو ئارام بێ له‌ئاشوب‌و گرژی دور بێت، به‌تایبه‌تیش دوای نه‌مانی رژێمی سه‌دام حسێن، چونکه به‌سه‌رچاوه‌یه‌کی سه‌ره‌کی دابینکردنی نه‌وتی جیهان داده‌نرێت‌و زیاتر له‌نیوه‌ی نه‌وتی جیهانی تێدا کۆبوه‌ته‌وه.

ئێرانیش له‌لای خۆیه‌وه‌و له‌سه‌رزاری زۆربه‌ی به‌رپرسه‌کانیدا ئامانجی ئاشتیانه‌ی به‌رنامه ئه‌تۆمییه‌که‌ی، په‌یتا په‌یتا، دوپات ده‌کاته‌وه‌و به‌هیچ کلوجێك ئاماده نیه. ده‌ستبه‌رداری بن، زۆر له‌به‌رپرسانی تاران جه‌خت له‌سه‌ر فه‌تواکه‌ی رابه‌ری کۆماری ئیسلامی ئێران ده‌که‌نه‌وه که‌به‌کارهێنانی چه‌کی ئه‌تۆمی حه‌رام کردوه بۆیه هه‌ر وه‌کو حه‌مید ره‌زا ئاسه‌فی وته‌بێژی وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی ئێران ده‌ڵێ به‌هۆی فه‌توای رابه‌ره‌وه که‌س له‌وڵاتی ئێمه بیر له‌به‌ده‌ست هێنانی چه‌کی ئه‌تۆمی ناکاته‌وه، هه‌رچی قسه‌ی له‌م جۆره‌شه لای خۆرئاوا به‌هه‌ند وه‌رناگیرێت‌و داوای ده‌ست به‌جێ راگرتنی ته‌واوی به‌رنامه ئه‌تۆمییه‌که‌ی لێ ده‌که‌ن‌و ئه‌گه‌ر راشی نه‌گرێ ده‌بێ چاوه‌ڕوانی سزای زیاتری نێوده‌وڵه‌تی بکات.

## سه‌ره‌تاکان:

ریشه‌ی به‌رنامه‌ی ئه‌تۆمیی ئێران بۆ کۆتاییی په‌نجاکانی سه‌ده‌ی رابردو ده‌گه‌ڕێته‌وه، کاتێك محه‌مه‌د ره‌زا شا هه‌وڵه‌کانی خۆی بۆ دامه‌زراندنی پێگه‌یه‌کی ئه‌تۆمیی بۆ وڵاته‌که‌ی ده‌ست پێکرد. سه‌ره‌تاکه‌ی به‌کردنه‌وه‌ی ناوه‌ندی توێژینه‌وه‌ی ئه‌تۆمی زانکۆی تاران بو له‌ساڵی ١٩٦٠، دوای ئه‌وه‌ی شا

توانیی رێکتەرێکی ئەتۆمی(مفاعل نووی) بۆ ناوەندی توێژینەوەی ئەتۆمیی ئەمیر ئابادی زانکۆی تاران لەئەمریکا بکڕێت[1]. هەرچەندە دامەزراندنی ئەو رێکتەرە نزیکەی حەوت ساڵی پێچو، بەڵام بوە سەرەتای لەدایکبونی بەرنامەی ئەتۆمی لەتاران. ئێران بۆ پێشخستنی بەرنامەو هەوڵە ئەتۆمییەکانیان چ لەرێگەی داهێنانو پەرەدان بەکادرو پسپۆرەکان، چ بەراکێشانی پسپۆرو شارەزایانی ئەتۆمیی بیانی بۆ کارکردن لەبەرنامەکەیاندا، لەساڵی ١٩٧٠ رێکخراوی ئەتۆمیی ئێرانی پێکهێنا، ئەمەش بوە سەرەتای هەنگاونانی بەرەو دامەزراندنی رێکتەری ئەتۆمیی قەبارە گەورە لەئێران[2].

رێکخراوی وزەی ئەتۆمیی ئێران، کەئەرکی راپەراندنو بەرەو پێشبردنی چالاکییە ئەتۆمی‌یەکانی ئێرانی لەئەستۆ گرت، لەساڵی ١٩٧٤ بەرەزامەندیی ئەمریکا توانی لەگەڵ کۆمپانیای(سمنس)ی ئەڵمانیای خۆرئاوا رێککەوتنێك بۆ دامەزراندنی دوو رێکتەری ئەتۆمی لەوێستگەی بوشەهر لەباشوری ئێران ئیمزا بکا[3]. ئەم کۆمپانیایە تا ساڵی ١٩٧٩ توانی ٨٥٪ی یەکێکیان تەواو بکات. ئەم رێکخراوەی ئێران توانی چەندین رێککەوتنی هاوکاریی ئەتۆمیی لەگەڵ هەریەك لەئەمریکاو ئەڵمانیاو فەرەنسا ئیمزا بکات. لەساڵی ١٩٧٤ شای ئێران رێککەوتنێکی ئەتۆمی لەگەڵ فەرەنسادا ئیمزا بکات، بەپێی ئەو رێککەوتنە ئێران بوە هاوبەشی فەرەنسا لەپرۆسەی پیتاندنی یۆرانیۆمدا[4].

لەساڵی ١٩٧٦ ئێران رێککەوتنێکی نهێنیی لەگەڵ وڵاتی ئەفریقیای باشور بۆ کڕینی هەویری ئەتۆمیی(کێکی زەرد)بە(٧٠٠)ملیۆن دۆلار ئیمزا کرد، هەروەها توانی رێککەوتنێکی تریشی لەگەڵ ئیمزا بکا بۆ ئەوەی ساڵانە هەزار تەن لەو کێکی زەردەی پێ بدات. شای ئێران تا بەر لەروخانی لەساڵی ١٩٧٩ شەش رێککەوتنی نهێنی بۆ دامەزراندنی شەش رێکتەری ئەتۆمی ئیمزا کردو هەوڵی کڕینی(١٢) رێکتەری ئەتۆمی لەگەڵ وڵاتانی خۆرئاوادا[5] داوە. لەساڵی ١٩٧٨ فەرەنسا دەستی بەدانانی رێکتەرێکی ئەتۆمیی لەناوچەی(دارخوین)ی هەرێمی خوزستان کردو ١٠٪ یبەشە کۆمپانیای(یۆردیف)ی فەرەنسای کڕی کە کارگەکانی بەرهەمهێنانی

بلۆنیۆمی دادەمەزراند، ئێران لەڕێگەی ئەم کۆمپانیایەوە توانی پەرە بە پیشەسازی پیتاندنی یۆرانیۆم بدات[٦].

پرۆژەو بەرنامە ئەتۆمییەکەی ئێران لەگەڵ هەڵایسانی شۆڕشی ئێران‌و دروستبونی کۆماری ئیسلامی ئێران لەساڵی ١٩٧٩ پەکی کەوت. دوای ئەوەش هەڵگیرسانی جەنگی عیراق- ئێران نسکۆیەکی تری بەرنامە ئەتۆمییەکەی ئاران بوو، چ بەوەی ڕێگەی لەتەرخانکردنی دارایی پێویست بۆ بەرنامە ئەتۆمییەکەی گرت، کەدەبو بۆ بەرگریکردن لەوڵاتەکەی تەرخان بکا، چ بەوەی لەعیراق توانی ویستگەی بوشەهر(ڕێکتەری-١) کە بەشادەماری بەرنامە ئەتۆمییەکەی ئێران دادەنرا، وێران بکا[٧].

پاش برانەوەی جەنگ‌و درێژەدان بەپرۆژەی ڕێکتەری ئەتۆمیی، ئێران بۆ بەدەستهێنانی تەکنەلۆجیای ئەتۆمی‌و پەرەپێدانی توانا ئەتۆمییەکەی دوو ڕیگەی گرتە بەر:

یەکەم/ وەرگرتنی یارمەتی‌و هاوکاری لەو وڵاتانەی کەتوانای ئەتۆمییان هەیەو پەیوەندی پتەویان لەگەڵ ئەمریکادا نیە، وەك، روسیا، چین، کۆریای باکور.

دووەم/ بەنهێنی لەرێگەی هاوردنی پسپۆڕانی بیانی بۆ کارکردن لەرێکتەرەکانی ئێران نمونەی پسپۆڕانی کۆریای باکور کە لەئێران کار دەکەن، هەروەها کڕینی زانیاری لەو دەوڵەتانەی پەیوەندی ئاشکرایان لەگەڵ ئێراندا نیە، جگە لەوانەی کە لەبازاڕی ڕەشی ئەتۆمییەوە بەدەستی دەهێنا، کە لەدوای هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێتەوە برەوی سەندبو.

کۆتایی هاتنی جەنگی هەشت ساڵەی عیراق- ئێران بەسەرەتای دەستپێکردنەوەی هەڵپەکانی ئێران بۆ دوبارە بنیاتنانەوەی بەرنامە ئەتۆمییەکەی دادەنرێت، بەتایبەتی بەهاوکاری روسەکان، کاتێك کەهەردولا ڕێککەوتنێکی سەربازییان ئیمزا کرد، بەهاکەی بە ٤-٦ ملیار دۆلار مەزەندە دەکرا، بەڵام بەندەکانی تایبەت بە بەرنامەی ئەتۆمی کەبەشێکی گرنگی ئەو ڕێکەوتنە بون درێژەیان کێشاو بە تەواوی جێبەجێ نەکران[٨].

لەساڵی ١٩٩١ ئێران بڕی(١،٨) تەن یۆرانیۆمـــی لـەچین کـڕی، هـەروەها توانی ژمارەیەك لەپسپۆڕانو شارەزایانی کۆریای باکور لەدامەزراوەکانی خـۆی کار پێ بکات[٩]. جگەلەوەی کەتوانی سودێکی زۆر لەزانای ئـــەتۆمی پاکـستان عەبدولقەدیر خان وەربگرێت، ئەمە جگـــە لـەوەی کەپاکـستان بـەدوەم وڵاتـی هاوکــاری ئــێران لەهـــەناردەی تەکنـــەلۆجیای ئـــەتۆمیو لەپـــەرەپێدانی تەکنەلۆجیای سەرەکی بۆ دروستکردنی ماتۆری سەنتەر ڤیوج ناسراوە[١٠].

دوای نـەمانی یـەکێتی سـۆڤێت، ئـێران توانـی روسـەکان رازی بکـا بـۆ درێژەدان بە رێکەوتنەکانی سەردەمی سۆڤێتو هاوکاریکردنیان لەبـەرەو پێـش بردنی بەرنامە ئەتۆمی‌یەکـەی. دوای ئـەوە لەسـاڵی ١٩٩٤ رێککـەوتنێکیان ئیمزا کرد بۆ تەواوکردنی رێکتەری بوشـەهر، کڕینـی دوو رێکتـەری ئـەتۆمی کـــــەدەبوو لەســـــاڵی ٢٠٠٤ لەبوشـــــەهر کاربکـــــات کـــــەتوانای بەرهەمهێنانی(١٠٠٠)مێگا وات کارەبای هـەبێت بـەو مەرجـەی بـۆ ئـاینده تواناکەی زیاتر بکرێت[١١].

ئێران لەسەرەتای هەڵپەکانیدا بۆ بەدەسـتهێنانی تەکنـەلۆجیای ئـەتۆمیو پێشخستنی توانی چەند سەنتەرێك بۆ پەرەپێدانی توانای کادرو بەرنامـــەکانی دامەزرێنێت، گرنگترین سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوەی ئەتۆمی لەئێران ئەمانەن:

١-ســەنتەری لێکۆڵیـنـەوەی ئـەتۆمی لـەتاران، زۆربـــەی کاروچـــالاکیو توێژینەوەکانی لەسەر ئەو رێکتەرە(٥ مێگاوات)یە دەکرێ کە لەژێر چـاودێری ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی‌یە.

٢-سەنتەری تەکنەلۆجیای ئەتۆمی لەئەسفەهان.

٣-سەنتەری لێکۆڵینەوەی ئەتۆمی کشتوکاڵیو پزیشکی لەکەرەج.

٤-فەرمانگەی ئەتۆمی لەشاری یەزد[١٢].

## هۆکارەکانی بەدەستهێنانی تەکنەلۆجیای ئەتۆمی

لەگەڵ ئەوەی ئێران بەبەردەوامی جەخت لەســەر مـــەرامی ئاشـتیخوازانەی بەرنامە ئەتۆمی‌یەکەی دەکاتـەوە، پابـەندبونی خـۆی بـۆ بـەندەکانی پـەیمانی

فەدەغەکردنی بڵاوبونەوەی چەکی ئەتۆمی دەکاتەوەو لەژێر گوشاردا پرۆتۆکۆلی باشکۆی پەیمانەکەشی وەك نیاز پاکی ئیمزا کرد، بەڵام کۆمەڵێك هۆکار هەن پاڵیان بەئێرانەوە ناوە بۆ ئەوەی هەڵپەی بەدەستهێنانی تەکنەلۆجیای ئەتۆمی بکات کەبۆ ئاینده وەکو دەوڵەتانی ئەتۆمی ناوچەکەیش ببێتە خاوەنی چەکی ئەتۆمی، لەوانە:

ا-پارسەنگی ستراتیجی:

ئێران لەهەوڵەکانیدا بۆ دروستکردنی پارسەنگی ستراتیجی لەناوچەکەو ئەمنی قەومی خۆی بپارێزێت، هەڵپەی دروستکردنو پەرەپێدانی توانا تەکنەلۆجیەکانی خۆیەتی بەئامانجی دروستکردنی چەکی ئەتۆمی، تاقیکردنەوە موشەکییە دور هاوێژەکانی کەتوانای هەڵگرتنی کڵاوەی ئەتۆمییان هەیە ئەو ئامانجەی ئێران دەسەلمێنن. ئێران جگە لەم ڕێگەیە هیچی دیکەی لەبەردەمدا نیە، چونکە گوشارەکانی ئەمریکا بۆ سەر دەوڵەتانی دراوسێی بوەتە کۆسپێکی گەورەی بەردەمی بۆ چونە ناو هەر هاوپەیمانێتێکی ئەقلیمییەوە کەبتوانێت لەڕێگەیەوە ئەمنی قەومی خۆی بپارێزێت.

ب-ڕەوشی ناوخۆیی:

هۆکارە گەلێکی ناوخۆیی هەن پاڵ بەئێرانەوە دەنێت بۆ بونە خاوەنی تەکنەلۆجیای ئەتۆمی، هەر لەهەوڵەکانی دەسەڵاتدارانی حکومیو سەربازیی تا دەگاتە بەرپرسانی ناوەندەکانی توێژینەوەی ئەتۆمی کەدەیانەوێ لانی کەم هەوڵەکانیان بێنە دی، لەلایەکی تریشەوە، ئێران بۆ ڕەواندنەوەی ترسی خۆی لەکەمینەکانی وڵاتەکەی کە لەپرۆسەی سیاسیی دور خراونەتەوە. لەبەرئەوە بونی ناوەندێکی بەهێزو خاوەن توانای تەکنەلۆجیای ئەتۆمی لەلایەك ڕەوشی ناوخۆیی تۆکمەتر دەکاتو مەترسی هەڕەشە ناوخۆییەکان کەم دەکاتەوە، لەلایەکی تریشەوە بەربەستێك لەبەردەم هەوڵو نیازەکانی وڵاتانی دراوسێو غەیرە دراوسێ دروست دەکات گەر بیانەوێ دەست بخەنە نێو کاروباری ناوخۆیی ئێرانەوە.

ج-بونی هێزی ئەتۆمی لەناوچەکە:

یەکێك لەهۆکارە سەرەکییەکانی هەڵپەکردنی ئێران بۆ بەدەست هێنانی تەکنەلۆجیای ئەتۆمی، بونی دو هێزی ئەتۆمی رکابەری یەکدی(هیندستان و پاکستان) لەباشوری خۆرهەڵاتیەوە،لەولاتریشەوە کۆماری چین لەخۆرهەڵات و روسیاش لەباکورەوە، لەخۆرئاوایشیەوە هەر یەك لەعێراق کەتوانا ئەتۆمی‌یەکەی لەدوای ساڵی ۱۹۹۱وە لەلایەن پشکنەرانی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی‌یەوە لەناوبرا، ئیسرائیل کەخاوەنی توانایەکی ئەتۆمی گەورەیە(خاوەنی جبەخانەیەکی ئەتۆمی زەبەلاحە کە بە ۱۵۰ تا ۲۰۰ کڵاوەی ئەتۆمی مەزەندە دەکرێت) ناکۆکی گەورەی لەگەڵدا هەیەو هەر یەکەو ئەویتر بەسەرچاوەی هەڕەشەو مەترسی بۆ سەر ئەویتر دەزانێت[۱۲].

د-پێگە قایمکردن:

ئێران لەناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست قورساییەکی سیاسی و دینی و کلتوری بەرچاوی هەیە. بۆ پتەوکردنی ئەو قورساییەی خۆی پێویستی بەزیادکردنی توانا سەربازییەکانی خۆی هەیە. بەتایبەتیش توانای ئەتۆمی. ئەمەش لەو روانگەیەوەیە کەتوانای سەربازی وڵات پێگەی وڵات لەناوچەکەدا بەهێزترو قایمتر دەکات. لەمەوە ناوەندە سیاسی و ستراتیجیەکانی ئێران داوای بەرەو پێشبردنی بەرنامە ئەتۆمی‌یەکەی وڵاتەکەیان دەکەن بۆ ئەوەی پێگەی ئقلیمی خۆیان لەنەخشەی وڵاتە سەرەکیەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەرزبکەنەوە.

٥/هۆکاری ئایدۆلۆجی:

وڵاتی ئێران خاوەن دیدوبۆچونێکی ئیسلامییەو دیدێکی جیاوازی لەسیاسەتی نێودەوڵەتییدا هەیە، بەتایبەتیش هەڵوێستەکانی لەکێشەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەوانە هەڵوێستی لەپرۆسەی ئاشتی نێوان عەرەب ئیسرائیل و پشتگیریکردنی لەحزب و گروپە ئیسلامیەکانی وەك حزبوڵڵای لوبنان و حەماس و جیهادی فەلەستینی دەکات کەهەڵقوڵاوی دیدوبۆچونی ئێرانە لەبەرامبەر خۆرئاوا. ئەم هۆکارە هانی ئێران دەدات بۆ هەڵپەکردن

لەپیناو بەدەستهێنانی تەکنۆلۆجیای ئەتۆمیی بۆ بتوانێ پشتگیری لەو هەڵوێستە جیاوازانەی خۆی بکات.

**لەمپەرەکانی بەردەم ئێران بۆ بەدەستهێنانی تەکنەلۆجیای ئەتۆمی:**

ولاتانی پێشکەوتو بۆ پاراستنی پێشکەوتنی خۆیان لەبواری تەکنەلۆجیای ئەتۆمیداو رێگرتن لەولاتانی جیهانی دواکەوتو بەتایبەتی ئەوانەی کەسستمی سیاسیان ناجێگیرەو ئەگەری روودانی کودەتای سەربازیی تێدا هەیە، پەیمانی قەدەغەی بلاوبونەوەی چەکی ئەتۆمییان بەزۆربەی ئەو ولاتانە ئیمزا کردو ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمیشیان بۆ پابەندکردنی ئەو ولاتانە بەو پەیمانەو جێبەجێکردنی ناوەرۆکەکەی دامەزراند، کە بەهۆی چاودێریکردنی بەردەوام و پشکنینی لەناکاوی ئەو ولاتانەی گومانی سەرپێچی کردنیان لێ دەکرێت، چاودێری یەکە ئەتۆمیی و چالاکییەیەکانیان بکەن.

ئێران بەوەی کەلایەنێکی ئەو پەیمانەیە کە لەساڵی ١٩٦٨دا ئیمزای کردوە، بەپێی بەندەکانی ئەو پەیمانە بەمافی خۆی دەزانێ وزەی ئەتۆمی بۆ مەرامی ئاشتیانە بەکاربهێنێ و یۆرانیۆم بپیتێنێ و پەرە بەبەرنامە ئەتۆمییەکەی خۆی بدات[١٤]. ئەمەی ئێران بەپێی برگەو مادەکانی پەیمانەکە راستە، ئەم خاڵەیە کەوا لەزۆربەی لێکۆڵیارانی بواری ئەتۆمی بکا بگەنە ئەو بروایەی کەئەم پەیمانە کەلێنی تێدایە، ئەگەر هاتو ولاتێك ئامادەیی خۆی بۆ پشکنین و چاودێریکردن لەلایەن پشکنەرانی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی نیشان بدات، ئەوە مافی خۆیەتی بەپێی ئەو پەیمانە دەست بەپیتاندنی یۆرانیۆم بکا لەژێر ناوی بەکارهێنانی وزەی ئەتۆمی بۆ مەبەستی بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا (نمونەی ئێران)، دواتریش رایبگەیەنێت کەهەلومەرجەکە گۆراوە لەپەیمانەکە بکشێتەوەو ئەمەش دوای ئەوەی دەبێتە خاوەن توانای بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆم لەماوەیەکی کورتدا[١٥].

ئەم کەلێنە پەیمانی قەدەغەکردنی بلاوبونەوەی چەکی ئەتۆمی بایەخی پەیمانەکەی وەك لەمپەرێکی بەهێز بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی کەم دەکاتەوە، چونکە ولاتان بەسودوەرگرتن لەو کەلێنە هەوڵدەدەن بەئاشکرا یان بەنهێنی

درێژە بە بەرنامە ئەتۆمی‌یەکانیان بدەن. وڵاتانی خۆرئاوا بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنەو روبەڕوبونەوەی هەر سەر پێچییەکی لەو جۆرە پەنایان بردۆتە بەر چەند رێوشوێنێکی‌تر برد تا بەهۆیەوە بتوانن وڵاتانی ئەندامی پەیمانەکە کۆنترۆڵ بکەن[١٦].

## گفتوگۆ و دانوستان بۆ راگرتنی بەرنامە ئەتۆمی‌یەکان:

وەك یەکەم هەنگاو بۆ راگرتنی بەرنامەی ئەتۆمی ئێران وڵاتانی خۆرئاوا پەنایان بۆ رێگەی گفتوگۆ برد، بۆ ئەوەی دور لەهەر هەڕەشەو پەلامارێکی سەربازی رێگە لەهەر هەوڵێك بگیرێ کە بەنیازی دانانی رێکتەری ئەتۆمی بێ‌و دواتر چەکی ئەتۆمی لێوە بەرهەم بهێنرێت، نمونەی ئەوەی کەچەندساڵێکە لەگەڵ کۆریای باکور پیادە دەکرێت.

دوای بڵاوکردنەوەی راپۆرتێکی پارتێکی ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی لەئابی ٢٠٠٢دا کەپەردەی لەسەر بەرنامەیەکی نهێنی ئەتۆمی ئاشکرا کرد، پاشان راستی ئەو راپۆرتە لەلایەن پشکنەرانی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی‌یەوە سەلمێندرا. لەژێر گوشارەکانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی بەتایبەتی ئەمریکا ئێران ناچار کرا بەگفتوگۆ کردن سەبارەت بە بەرنامە ئەتۆمییەکەی‌و راگرتنی هەوڵەکانی پەرەپێدانی بەرنامەکانی لەگەڵ ترۆیکای ئەوروپی(سێ دەوڵەتە بەهێزەکەی ئەوروپا، ئەڵمانیا، فەرەنساو بەریتانیا) کەئەرکی گفتوگۆی ئەم مەسەلەیەیان لەئەستۆگرت.

سەرەتای کۆبونەوەکانیان بەداوایەکی ترۆیکای ئەوروپی دەستی پێکرد، کەداوای راگرتنی هەموو چالاکیەکی بەرنامە ئەتۆمی‌یەکەی، ئێران دوای هەڕەشەی هەناردنی دۆسیە ئەتۆمی‌یەکەی بۆ ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی کەئەگەری سەپاندنی سزای ئابوری لێدەکەوێتەوە، ئەمەش وای کرد ئێران رازی بێ بەهەڵپەساردنی بەرنامە ئەتۆمی‌یەکەی تا ئەو کاتەی کۆبونەوەکانی نێوانیان یەکالا دەبێتەوە.

## دانوستانی نێوان ترۆیکای ئەوروپایی و ئێران

ترۆیکای ئەوروپایی و ئێران پتر لەدوو ساڵە لەگفتوگۆیەکی درێژخایەندایە بۆ قایلکردنی ئێران بەدەست هەڵگرتن لەبەرنامــە ئەتۆمییەکـەی و وازهێنـان لەپرۆسەی پیتاندنی یۆرانیـۆم و هـەوڵی بەرهەمـهێنانی سـوتەمەنی ئـەتۆمی بەوەی کەدەکرێ دوو لایەنە سودی لێ وەربگیرێت چ بـۆ بەرهەمـهێنانی کارەبـا هەر وەك ئێران بانگەشە بۆ بەرنامەکەی دەکات، چ وەك ئەوەی ئـەمریکا دەڵـێ ئامانجی سەربازی لەپشت بەرنامــە ئەتۆمی‌یەکـەی ئێرانەوەیـە، ئـێرانیش لای خۆیەوە دەیـەوێت بـۆ ترۆیکـای ئـەوروپی و کۆمـەڵی نێودەوڵـەتی بیسـەلمێنێ لەبەنیا ئامانجی لەبەرنامەکەی بۆ مەبەستی بەرهەمـهێنانی کارەبایـەو هیـچ ئامانجێکی سەربازی لەپشتەوە نییە، بەڵام تاقیکردنەوە موشـەکیەکانی ئـێران سەرچاوەی سەرەکی ئەو گومانانەی کۆمەڵی نێودەوڵەتیین، بەتایبـەتی زۆربـەی ئەو موشەکانە توانای هەڵگرتنی کڵاوەی ئەتۆمییان هەیە.

ترۆیکای ئەوروپایی بۆ ئـەوەی ئـێران بـە تـەواوی واز لەهـەموو چـالاکی و بەرنامــە ئەتۆمی‌یەکــەی بــهێنێ بــەپیتاندنی یۆرانیۆمیشـــەوە، پاشـــان دوپاتکردنەوەی ئەو وازهێنانە، لەبەرامبەر ئامادەیی ئەوروپا بۆ هاوکاریکردنی ئێران لەپێشخستنی بەرنامە ئەتۆمی‌یەکــەی کـەبۆ بەرهەمـهێنانی کارەبایـە لەگەڵ بونی چاودێریەکی توند لەلایەن ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمییــەوە بەپێی خاڵەکانی ڕێکەوتنامەی پرۆتۆکۆلی پاشکۆی پەیمانی قەدەغــەی چـەکی ئەتۆمی، کە لەماوەی بەڕێوەچونی گفتوگۆکانداو لەژێر فشاری ئەواندا ئیمزای کردوە[17].

١-ڕێگـەدان بـەکۆمپانیا تایبەتـەکانی ئـەوروپا بـۆ پێدانـی کەلوپــەل و پێداویستی تەکنەلۆجیای ئەتۆمی پێویست بۆ بیناکردنی ڕێکتـــەری ئـەتۆمی کە بەئاوی سوك کار بکات بەمەبەستی بەرهەمهێنانی کارەبا، لەگەڵ پێدانــی زەمانەت بۆ دابینکردنی وزەو سوتەمەنی پێویست بۆ کارکردنی ئەو ڕێکتەرە.

٢-ئەوروپییەکان بەڵێنی خۆیان بۆ کۆتـایی هێنـان بـەو دابڕانـە سیاسـی و ئابوریەی کەئێرانی تێدایە دوپـات دەکەنـەوە لەڕێگـەی بەئـەندام وەرگرتنـی

لەرێکخراوی بازرگانی نێودەوڵەتی بەلادانی ئـەو هۆکارانـەی کەواشـنتۆن بـۆ رێگرتن لەوەرگرتنی ئێران داینراوە، کەزیاتر لەدە جـارە داوای بـون بەئـەندامی پێشکەش بەو رێکخـراوە کـردوە بـەلاّم بـەهۆی گوشـارەکانی ئـەمریکاوە ئـەو داوایانەی رەتکراوەتەوە.

٣-دەست کردن بەدانوستاندن بۆ ئەنجامدانی رێکەوتنامەی بازرگانی ئازادو هاریکاری ئابوری‌و ئەمنی لەنێوان یەکێتی ئەوروپاو ئێراندا.

٤-کارکردنی ئەوروپا بۆ رێگرتن لەهـەناردنی فـایلی ئـەتۆمی ئـێران بـۆ ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی ئەگەر هـاتو ئـێران پابـەند بـوو بـەراگرتنی تەواوی هەموو چالاکی‌یە ئاشکراو نهێنی‌یەکانی بەرنامە ئەتۆمییەکانی.

ئێرانیش لەبەرامبەر ئەو داوایانەی ترۆیکای ئەوروپیدا، بـەردەوام مـەرامی ئاشتیانەی بەرنامە ئەتۆمییەکەی خۆی دوپات کردەوەو بـەمافی خـۆی دەزانـێ کەخاوەنی تەکنەلۆجیای ئەتۆمی بێ‌و بەهیچ کلۆجێك ئامادە نیە دەستبەرداری ئەو بەرنامەیەی بێ کەتوانایەکی مادی بەشـەریی زۆریـان بـۆی خـەرجکردوە، هەروەها وەفدی ئێرانی لەگفتوگۆکانیاندا هەوڵدەدا کـەلانی کـەم(٢٠)ئـامێر لەهەڵپەساردن بەدەر بێت کە لەپرۆسەکانی سەنتەر ڤیوجدا بـەکاردەهێندرێت تاوەکو بتوانن بۆ ئامانجی توێژینەوەی زانستی سـودیان لێ وەربگـرن، هـەروەها چالاکیە ئەتۆمی‌یەکانیان بەکامێرا چاودێری بکرێ لەبری ئەوەی بەمۆمی سور خەتم بکرێن[١٨].

داخوازیەکانی ئێران لەلایەن ترۆیکـای ئـەوروپایی‌و ئاژانسـی نێودەوڵـەتی وزەی ئەتۆمییەوە رەتکراوەتەوە، ئەم دوو داوایە جیاوازەی هـەردولاو سـوربونیان لەسەر راکانیان هۆکاری درێژبونەوەی گفتوگۆکانی نێوان هەردولان.

### گەمارۆی تەکنەلۆجیا

تەکنەلۆجیا زیاتر لەدەوڵەتانی تـر رۆڵێکـی گـەورەی لەسیاسـەتی دەرەوەی ئێراندا گێڕاوە، بەتایبەتی دوای شۆڕشی سـاڵی ١٩٧٩، چونکـە لـەدوای ئـەو مێژووەوە لەلایەن ئەمریکاوە سزای یەکلایەنەی بەسەردا سەپاندوە، دوای ئـەوەش جەنگی هەشـت سـاڵەی عـێراق ئـێران رۆڵێکـی گـەورەی لـەتێکدانی توانـا

..ـەلوجی‌و ئابوریـەکانی ئـێراندا هـەبو، لەبەرئـەوە بـۆ سـەر لـەنوێ ...ادسانەوەی توانا ئابوری‌و سەربازیەکانی پێویسـتی زۆری بـە تەکنـەلۆجیای ... هەبو.

سیاسەتی ئەمریکا لەسەپاندنی سزاکانی بەسەر ئـێراندا بـۆ پەکخستنی ... ئـابوری‌و تەکنەلۆجیاکانیـەتی‌و رێگرتنـە لـەو هەوڵانـەی ئـێران بـۆ ...پێشـبردن‌و چارەسـەرکردنی کێشـەو ناکۆکییـە ئابوریـەکانی وڵاتەکـەی ...ـەك، لـەلایکی تریـش بـۆ بەرەوپێشـبردنی توانـای تـەکنیکی هـێزە ...ربازییەکانی.

..ەشێکی دیاری سیاسەتی دەرەکی ئێران تـەرخان کرابـو بـۆ هـەوڵدان بـۆ ...ستهینانی تەکنەلۆجیا چ مەدەنی بێ یان سەربازی، بەتایبەتی لەو وڵاتانەی ...ەیوەندی بەهێزیان لەگـەڵ ئـەمریکادا نییـە. ئـەمریکا لـەپێناو کۆنـترۆڵ ...دنی تەکنەلۆجیا گوشارەکانی خۆی بۆ سەر ئێران زیـاتر کـردوە، هەرچـەندە ...م کوشارانە زیانی ئابوری بەکۆمپانیاکانی وڵاتەکەی خۆی دەگەیەنێت.

دەکرێ بگوترێ، سیاسەتی گەمارۆی تەکنەلۆجی ئەمریکی لەسـەر ئـێران ...مکـە لەبێبەشـکردنی ئـێران لەتەکنـەلۆجیای تـازە زیـانێکی گـەورەی ...ـە کومپانیاکانی خودی ئەمریکا گەیاندوە، بەپێی هەندێك راپۆرتی ئـەمریکی ...گە لە(٦٧٠) کۆمپانیای ئەمریکی گیاوە لـەوەی لـەو وڵاتانـە کـار بکـەن ...لەئەمریکا گەمارۆی خستۆتە سـەریان، ئـێرانیش لەناویاندایـە، کەبەهۆیـەوە ...ەمریکا ساڵانە(١٩) ملیـار دۆلاری لەدەسـت دەچێـت لەبـەرژەوەندی وڵاتـانی ...ەوروپی ئەوروپاو خۆرهەڵاتو باشوری خۆرهەڵاتی ئاسیا[١٩].

روسیاش ئەم هەلەی بۆ خۆی قۆستۆتەوەو تارادەیەك بۆتە تاکـە سـەرچاوەی ...بدانـی پێداویسـتی‌ی تەکنـەلۆجیای ئـەتۆمی بـەئێران. روسـەکان ئێرانیـان ...ەباشترین بازاری فرۆشتنی تەکنەلۆجیای سەربازی بەئەتۆمیشەوە دادەنێـن بـۆ ...ەوەی قەرەبوی بازاری عیراقی پێ بکەنـەوە کـە بـەهۆی سـەپاندنی ئابلۆقـەی ...یودەوڵەتییەوە لەساڵی ١٩٩١ دا لەدەستیان دا.

لەم بارەیەوە رۆژنامەی شۆرشی ئیسلامی لەرۆژی ٢٠٠٢/٥/٣٠ باس لەیەکێك لەو داوایانەی ئەمریکییەکان دەکات کە لەیەکێك لەدانیشتنە نهێنییەکانی نێوان هەردولادا ئەنجام دراوە، کەئامادەیی خۆیان بۆ گێرانەوەی پەیوەندی دبلۆماسیو ئابوری لەگەڵ تاران نیشان داوە ئەگەر هاتو واز لەو بەرنامە ئەتۆمییەکەیان بهێنن، بەلام ئێرانیەکان سورن لەسەر بەردەوامی دان بە بەرنامە ئەتۆمییەکەیان، ئەم هەڵوێستەی تاران وای لەئەمریکا کردوە جگە لەگەمارۆکانی خۆی لەسەر ئێران هانی ولاتانی هاوپەیمانی خۆی بدات بۆ هاوکاری نەکردنی ئێران لەروی ئابوریو سەربازییەوە.

## گوشار خستنە سەر ولاتانی تر بۆ سەپاندنی ئابلۆقە بەسەر ئێراندا

ئەمریکا بۆ پەکخستنی هەوڵەکانی ئێران لەدەسکەوتنی تەکنەلۆجیای ئەتۆمی سەرەرای گوشارەکانی تر، بیری لەپەیرەوکردنی گوشارو ئابلۆقەی ناراستەوخۆ کردۆتەوە. ساڵی ١٩٧٩ دوای سەرکەوتنی شۆرشی ئێران بەهۆی گوشارەکانی ئەمریکاوە کۆمپانیای سمنس ی ئەڵمانیا پرۆژەی رێکتەری بوشەهری پەکخستو تەواوی نەکرد، سەرەرای ئەوەی ٨٠٪ ئەو پرۆژەیەی تەواو کردبو. هەروەها ئەو هەولانەی ئێرانی پەکخست کەدەیوست تەکنەلۆجیای دروستکردنی سوتەمەنی ئەتۆمی لەئەرجەنتین بکرێت، هەولێکی تری ئێرانیشی لەباربرد کە بەنیازی کرینی رێکتەری ئەتۆمی بۆ توێژینەوە لەهەر یەك لەئەرجەنتینو هیندستانو کۆماری چین بو[٢٠].

ئەمریکا ئەو پەیوەندیانەی نێوان ئێرانو هەریەك لەئەڵمانیاو سویسرا کەبۆ بەدەستهێنانی تیشکی لێزەر دەستیپێکردبو شکت پێهێنا. هەروەها توانی ئۆکراینو کۆماری چیك پەشیمان بکاتەوە لەو بەڵێنەی بەروسیایان دابو بۆ پێدانی ئەو پێداویستیانەی کەبۆ تەواوکردنی رێکتەری بوشەهری ئێران گەرەکی بو[٢١].

لەساڵی ١٩٩٣دا چین رەزامەندی خۆی بۆ دامەزراندنی دوو رێکتەری ئەتۆمی لەشاری(ئیستقلال)نزیك بوشەهر نیشاندا بەلام بەهۆی گوشارەکانی ئەمریکاوە چین ئەو رێککەوتننامەی جێبەجێ نەکرد[٢٢].

لەساڵی ١٩٩٤دا روسیاو ئێران ڕێکەوتننامەیەکیان بۆ تەواوکردنی ... بوشەهر ئیمزا کرد کەدەبو بۆ کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤ ئەو ڕێکتەرە ... بەرهەم بهێنێ بەڵام بەهۆی گوشارەکانی ئەمریکاوە دواکەوت، ئەم ... ەش هەردو حکومەتی ئێرانو روسیای توشی نیگەرانی کردووە.

**ئاژانسی نێودەوڵەتیی وزەی ئەتۆمی**

... لەبەرچاوگرتنی هەڕەشە ئەتۆمی‌یە روو لەزیادەکانی مەترسی ساڵانی ...دا، کەچەندین جار کۆمەڵی نێودەوڵەتی لەلێواری جەنگێکی نەخوازراوی ... نزیك کردۆتەوە. بەرەچاوکردنی ئاکامی خراپی پەرەسەندنی ئەو چەکە ... ان ئەو وڵاتانەدا کەلێهاتوییو تەکنیکی پێویستی سودلێ وەرگرتنی ئەو ... یان بۆ پاوانکردنی تەکنیکی ئەتۆمی نییە، بەتایبەتی تەکنیکە ... ەرباریبەکەی کە لەدەست زلهێزە پیشەسازییەکاندایەو بۆ ڕێگرتن لەبڵاوبونەوەی چەند بنەمایەکی نێودەوڵەتیان داناوە[23].

ئێران یەکێکە لەو دەوڵەتانەی کە لەساڵی ١٩٦٨ پەیمانی قەدەغەکردنی بڵاوبونەوەی چەکی ئەتۆمی ئیمزا کردوە لەساڵی ١٩٩٢وە ئێران ڕێگەی بەئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی داوە پشکنینو چاودێری بەرنامەو چالاکیە ئەتۆمی‌یەکانی بکەن، لەو ساڵەوە تا ئابی ٢٠٠٢ پشکنەرانو چاودێرانی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی هیچ ئاماژەیەکیان نەداوە کەئێران سەرپێچی لەبڕگەکانی ئەو پەیمانە کردبێت، ئەوەشیان نیشان داوە کەبەرنامە ئەتۆمییەکەی بۆ مەرامی ئاشتیانەیەو دورە لەئامانجی سەربازی تا ئەو کاتەی پارتێکی ئۆپۆزیسیۆنی ئێران بەراپۆرتێك ئاشکرای کرد بۆ ماوەی بیست ساڵ دەبێت بەنهێنی لەژێر زەمین خەریکی دامەزراندنی کارگەیەکی پیتاندنی یورانیۆمە لەشاری ناتانز کە ١٣٠ میل لەتارانەوە دورە. بە بڵاوبونەوەی ئەم هەواڵە ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی لێکۆڵینەوەکانی خۆی لەئێران دەست پێکردەوەو، بۆی دەرکەوت کەئێران سەرپێچی‌ی لەو پەیمانە کردوە کەئیمزای کردوە ئەویش بەوەی کەخەریکی بەرنامەیەکی نهێنییە بۆ بەرهەمهێنانی ئەو کەرەستانەی توانای دولەتبونیان هەیەو پرۆسەی پیتاندنی

ئاست بەرزە، کەدەکرێ بۆ بەرهەمهێنانی چەکی سەربازی سودی لێ وەربگیرێت[24] .

لەتشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٣ وە لەژێر گوشاری ئاراستەکردنی تۆمەتی پابەندنەبونی بەپەیمانی قەدەغەکردنی بڵاوبونەوەی چەکی ئەتۆمی لەلایەن ئەنجومەنی پارێزەرانی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمییەوەو رەوانەکردنی فایلەکەی بۆ ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، ئێران ناچاربو لەکۆبونەوەی لەگەڵ وەزیرانی دەرەوەی ترۆیکای ئەوروپی هەمو چالاکیو بەرنامە ئەتۆمییەکانی خۆی بەپرۆسەی پیتاندنی یۆرانیۆمیشەوە هەڵپەسێرێت تا ئەو کاتەی گفتوگۆکانی لەگەڵ ترۆیکای ئەوروپا بەناکام دەگات.

لەکۆتایی ٢٠٠٣دا جارێکی تر رەوشەکە گرژیو ئاڵۆزی تێکەوتەوە، کاتێك ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی ئاماژەی بەراپۆرتێکی ئێرانی کرد کەرەوانەی ئاژانسەکە کرابو، هیچ ئاماژەیەکی بەئامێرەکانی سەنتەر ڤیوج(p-٢)و بەرهەمهێنانی پلۆتۆنیۆمی نەکردبو کەبۆ تەقاندنەوەی ئەتۆمی بەکاردێت، هەروەها لەبری ئەوەی بەرنامەی پیتاندنی یۆرانیۆم بەتەواوی رابگرێت، هەندێك چالاکی ئەتۆمی ئەنجام داوە کە بەلای ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی‌یەوە قەدەغەیە. جگەلەوەی کەئامادە نەبو دەست بەجێ دەست لەدروستکردنی ئامێرەکانی سەنتەر ڤیوج هەڵبگرێت، بە بەهانەی ئەوەی گوایا ناتوانێ پەیوەستنامەکانی خۆی لەگەڵ کۆمپانیا تایبەتەکانی وڵاتەکەیدا هەڵبوەشێنێتەوە[25] .

**هەڕەشەی سەربازی**

وەك دوا هەنگاو بۆ رێگرتن لەپەرەپێدانی تەکنیکی ئەتۆمی لەئێران وڵاتانی رۆژئاوا پەنایان بردە بەر هەڕەشەی پەلاماری سەربازی بۆ تێکدانی دامەزراوە ئەتۆمی‌یەکانی. تا ئێستا ئێران تەنیا لەلایەن عیراقەوە کەئەویش بەدەستخۆشی رۆژئاوا لەماوەی جەنگی عیراق ئێراندا بەباڵا دەستی هێزی ئاسمانیەکەی چەندین جار هێرشی کردە سەر رێکتەری بوشەهرو زیانێکی گەورەی پێگەیاند.

ئەمریکا بەردەوام لەسەر زاری بەر پرسەکانی کۆشکی سپیەوە ئەگەری هێرش و پەلاماری سەربازیی بۆ تێکدانی دامەزراوە ئەتۆمییەکانی ئێران رەت نەکردۆتەوەو بەدوری نازانێ[٢٦]. لەگەڵ ئەوەشدا چاوەڕێی ئەنجامی گفتوگۆکانی نێوان ترۆیکای ئەورووپی و ئێرانن، هەرچەندە چ ئەمریکا وچ ئێرانیش بەمەبەستی جیاواز هاوڕان لەوەی کەدەبێ ئەو کۆبونەوانەی نێوان هەردولایەتی ئەورووپی ئێرانی هێندە درێژە نەکێشن، هەرچی ئەمریکایە بۆ ئەوەیەتی کەئێران سود لەدەرفەتی ماوەی گفتوگۆکان بۆ درێژەدان بە بەرنامەکەی وەرنەگرێ، ئێرانیش بۆ ئەوەیەتی ماوەی هەڵپەساردنی هەمو چالاکییە ئەتۆمییەکانی لەوە زیاتر درێژە نەکێشێ و ماوەی بەگەڕخستنی رێکتەری بوشەهر لەوە زیاتری پێ نەچێت و سود لەو هەلومەرجە نێودەوڵەتییە وەربگرێت کە بەهۆی پرۆسەی ئازادی عیراقەوە ناتەباییەکی تێکەوتوە.

ئیسرائیلیش لەلای خۆیەوە وەشاندنی گورزی سەربازی بۆ وێرانکردنی دامەزراوە ئەتۆمییەکەی بەدور نازانێ و چاوەڕێی کۆتایی هاتنی گفتوگۆکانی نێوان ترۆیکای ئەورووپی و ئێرانە، بەرپرسانی ئیسرائیل بونی چەکی ئەتۆمی لەئێران بەگەورەترین مەترسی بۆ سەر ئەمنی قەومی خۆیان دەزانن بەتایبەتی کەئێستا ئێران خاوەنی چەندین جۆری موشەکی دورهاوێژەو توانای هەڵگرتنی کڵاوەی ئەتۆمی هەیەو دەتوانن ئامانجەکانی خۆیان لەناو ئیسرائیل بپێکن. هەر ئەمەش وای کردوە کەئیسرائیلیەکان زیاتر لەئەمریکا لەبەرنامە ئەتۆمییەکەی ئێران بترسن، بۆیە بەردەوام هێرشێکی لەو جۆرەی کە لەساڵی ١٩٨١دا کردیانە سەر وێستگەی ئەتۆمی تەموزی عیراق لەخەیاڵدایەو ئەوەش ناشارنەوە کەجیاوازییەکی زۆر لەنێوان ئەو رەوشەی کەتیایدا بۆردومانی وێستگەکەی عیراقیان کرد لەگەڵ رەوشی ئەمڕۆ، جگە لەوەی کەوەك ئیسرائیلیەکان خۆیان دەڵێن فراوانی روبەری ئێران و دابەشبونی رێکتەرەکانی ئێران بەسەر ناوچە جیاجیاکانیدا، کە لەتوانای سەربازییاندا نییە هەموی وێران بکەن، ئەمە سەرەڕای ئەوەیە کەباش دەزانن ئێران خۆی بۆ ئەگەرێکی لەم جۆرە ئامادە کردوەو وەکو عیراقی کاتی بۆردومانەکەی١٩٨١ لەشەردا نیە[٢٧].

## کۆبەند

نزیکەی نیو سەدەیە ئێران بەڕێگەی ئاشکراو نهێنی بەگرتنەبەری هەمو شێوازێك هەوڵەکانی خۆی خستۆتەگەر، بۆ بەدەستهێنانی تەکنەلۆجیای ئەتۆمی بەسودوەرگرتن لەئەزمونی هەمو وڵاتان، توانیویەتی لەو هەوڵانەیدا بەپشت بەستن بەو سیاسەتەی کە لەدوای هاتنە سەرکاری ڕەفسنجانییەوە گرتویەتییە بەر، تارادەیەکی دیار بە بەراورد بەو گوشارە نێودەوڵەتییەی کە لەسەریانە، بەتایبەتیش لەلایەن ئەمریکاوە سەرکەوتن بەدەست بهێنن.

ئێران بەسود وەرگرتن لەهەلومەرجی ئاڵۆزی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کەزۆربەی وڵاتان، بەتایبەتی ئەمریکا بەعیراقەوە خەریك بون، ئەمە جگە لەناژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی کەئەمیش بەرۆڵی خۆی بە لەناوبردنی چەکە کۆمەڵ کوژەکانی عیراقەوە خەریك بو، هەروەها بەپشت بەستن بەو روبەرە فراوانەی هەیەتیو بەلەبەر چاوگرتنی پێشکەوتنی تەکنەلۆجیا ئەگەری جیاکردنەوەی پارچەی موشەكو چەکە ئەتۆمییەکانو شاردنەوەیان لەهەلومەرجی ئاساییو مۆنتاج کردنیان لەهەلومەرجە قەیراناویەکاندا، لەلایەکی تریشەوە بەسودوەرگرتن لەباری نائاسایی وڵاتانی تازە دروستبوی پاش هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیێتو دروستبونی بازاڕی ڕەشی ئەتۆمی، ئەمانەو چەندینی تر، هاوکارێکی زۆر باشی ئێرانیان کرد بۆ سەر لەنوێ بیناکردنەوەی بەرنامە ئەتۆمییەکەی بەهۆی ئەو چەند هێرشە سەربازییەی عیراق لەماوەی جەنگی هەشت ساڵەی نێوانیان کردبویە سەر وێستگە ئەتۆمییەکەیو بوشەهر، ئەو زیانە زۆرەی چ لەڕوی ئابوریو تەکنەلۆجیو سەربازیەوە لەو جەنگەدا لێی کەوتبو، پێشبینی دەکرا زۆر بەزەحمەت بتوانێ بەو خێراییە پرۆسەی بەرنامەکەی دەست پێبکاتەوە.

پێشکەوتنی ئێران لەبەرنامە ئەتۆمییەکەیدا لەکاتێکدایە کەتواناکانی چاودێریکردنی دەربارەی دامەزراوە ئەتۆمییەکان زیادی کردوە و وای لێهاتوە یەکێ لەئەرکەکانی مانگە دەستکردەکانی وڵاتانی خاوەن چەکی ئەتۆمی، لەوانە

ئەمریکا، فەرەنساو تەنانەت هیندستانیش، بریتی بێ لەگەڕان بەدوای دەربڕینەوەی دامەزراوە ئەتۆمییەکانی وڵاتانی جیهانی سێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوازی ئاڵۆزی ئەوتۆ بۆ شاردنەوەی وێستگە ئەتۆمییەکان داهاتوە بەجۆری ئەگەری تێکشکاندنی ئەو وێستگانەی لەلایەن وڵاتی پەلاماردەرەوە کەم دەکاتەوە، ئەمەش وادەکات وڵاتێکی لەنمونەی ئێران هەڕەشەکانی ئیسرائیل زۆر بەهێند وەرنەگرێت کەدەیەوێت بەهەمان شێوەی پەلامارەکەی وێستگەی تەموزی عیراق پەلاماری وێستگەی بوشەهری ئێران بدات.

ئەم راستیەی سەرەوە هۆکارەکانی پەنا بردنە بەر ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی بۆ پشکنینی دامەزراوە ئەتۆمییەکانی ئەو وڵاتانە بکات کەگومانی هەبونی بەرنامەی ئەتۆمییان لێ دەکرێت، ئەمە سەرەڕای ناچار کردنی زۆربەی وڵاتانی جیهان بەتایبەتی وڵاتانی جیهانی سێ بەئیمزاکردنی پەیمانی قەدەغەکردنی بڵاوبونەوەی چەکی ئەتۆمی‌و کردنەوەی وڵاتەکانیان لەبەردەم پشکنەران‌و چاودێرانی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی بۆ رێگرتن لەهەر سەرکێشییەك لەجۆری ئەمەی ئێران کەمەرامی شاراوەی لەبەرنامە ئەتۆمی‌یەکەی هەبێت. هەرچەندە توانای دۆزینەوەی ناوەندە شاراوەکانیان وەکو پێویست نی‌یە کەبتوانێ بەتەواوی ئاشکرایان بکاو دواتریش تێکیان بشکێنێ، نمونەی عیراق، حاڵەتێکی لەم جۆرەش پێویستی بەیەکڕیزی کۆمەڵی نێودەوڵەتی هەیە، بەتایبەتی وڵاتانی پیشەسازی لەسەروی هەموشیانەوەی ئەمریکا.

هەڵپەی ئێران بۆ بەدەستهێنانی تەکنەلۆجیای ئەتۆمی بەدو قۆناغدا تێپەڕیوە:

یەکەم: ١٩٥٨-١٩٧٩ قۆناغی هاوکاری‌و پشتگیری، ئەم قۆناغە لەگەڵ سەرەتای هەوڵەکانی محەمەد رەزا شا دەستی پێکردو لەگەڵ شۆڕشی خەڵکی ئێران بەراگەیاندنی کۆماری ئیسلامی ئێران، هەرەسی هێنا. لەم قۆناغەدا، سیاسەتەکانی شای ئێران هاوتەریبی سیاسەت‌و بۆچونەکانی خۆرئاوا بەتایبەتی ئەمریکا بۆ بەدەستهێنانی تەکنەلۆجیای ئەتۆمی لەلایەن ئێرانەوە

نـەك هـەر دەستخۆشـی لیٚ دەکـرا، بـەڵکو هاوکـاری دامـەزراندنی رێکتـەرە ئەتۆمی‌یەکانیان بۆ دەکـردن‌و ئاسـانکاری بـۆ بەگەڕخسـتنی ئـەو رێکتەرانـە دەکرا، بەتایبەتی ئەو رێکتەرانەی بۆ توێژینەوەی زانستی بەکار دەهێندران.

دوەم: ۱۹۸۰-۲۰۰۵ قۆناغی دژایەتی‌و هەڕەشەکردن، راگەیاندنی کۆماری ئیسلامی ئێران‌و پاشـان کـارکردن بـۆ هەناردنـە دەرەوەی شۆڕشـی ئیسـلامی لەنمونەی ئێران، ئەمەش مەترسی گەورەی بۆ سـەر بەرژەوەندیـەکانی خۆرئـاوا لەکەنداوی فارسدا کە ۶۰٪یەدەکی نەوتی جیـهانی لیٚ کۆبوەتـەوە، لەبەرئـەوە خۆرئاوا بەسەرکردایەتی ئەمریکا هەرگیز رێگە بەهیچ وڵات‌و هـێزێك نـادات ئەگەر لەچوارچێوەی سیاسەتەکانی ئەواندا نەجوڵێتەوە گەشە بکا چ جای بونی هێزێك کەبەئاشکرا دژایەتیان بکات. ئـەمریکا بـۆ لاوازکـردن‌و پەکخسـتنی توانا ئابوری‌و سەربازییەکانی ئێران چـەندین رێوشـوێنی گرتۆتـە بـەر، هـەر لەسەپاندنی ئابلۆقە تا گوشار خستنە سەر ئەو وڵاتانەی هاوکاری ئێران دەکەن بەتایبەتی لەبواری تەکنەلۆجیای ئەتۆمی‌و تەنانەت سـزادانی ئـەو کۆمپانیـا بیانی‌یانەی سەرمایەگوزاری لەکەرتی نـەوتی ئـێراندا دەکـەن، بـەو ئامانجـەی سەرچاوەی دارایی بەردەست حکومـەتی ئـێران کەمبکاتـەوە، تـا بەهەڕەشـەی سەربازی بگات، کەئەمریکا بەردەوام وەك ئەگەرێکی کراوە بەدوری نازانێت.

لەم قۆناغەشدا ئێران بەهۆی گوشارەکانی خۆرئاواوە بـەناچاری پـەنای بـۆ وڵاتانی خۆرهەڵات بردوە، روسیا، چین، کۆریای باکور، بەسـودوەرگرتن لـەبونی ناتـەبایی لەپەیوەندیـەکانی نێـوان ئـەو وڵاتانـەو ئـەمریکا کـە لـەچاو هاوپەیمانەکانیدا کەمتر توانای گوشار خستنە سەریانی هەیە.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئایا دەکرێ کێشەی ئەتۆمی ئێران بەرێگەی ئاشتیانە چارەسەر بکرێ؟

ئەگەرەکانی چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشە ئەتۆمییەکەی ئێران هێشـتا ماوە، هەرچەندە رەوشەکە بەرەوگرژی‌و ئاڵۆزی زیـاتر دەڕوات کـەدەکرێ بـەوەی تێبەگەین کەبەشێکی تری ئەو گفتوگۆیانەی نێوان ترۆیکای ئەوروپی‌و ئێرانـە کە لەماوەی درێژیدا چەندین توندی‌و خاوبونەوەی بەمەبەستی ملدانـی ئـێران

... داراکانیان بەخۆوە دیوە. بەڵام ئێستا کێشەکە لەوەدایــە کەئەگـەرەکانی
...ـەکردنی ئاشتیانەی کێشەی ئەتۆمی ئێران لەگەڵ کاتدا کەمتر دەبێتــەوە،
... بڕوانین کەمحافزکارانی ئێران کەجارێکی تـر دەســەلات دەگرنــەوە دەست،
... سیستەکانیش لەگەڵ ئـەوەی دەســەلاتی بەســەر بەرنامــە ئەتۆمییەکـەی
... لەدوایین هەڵبژاردنیشــدا پەرلەمانیشـیان لـەکیس چـو لەپێشـو
... دەبن ئەگەر هــاتو پۆسـتی سـەرۆك کۆمـاریش ببەنـەوە، بـەلام عــەلی
... رابەری ئێران بۆ ئەوەی نەهێڵێ هیچ لایەنو کەسێك فـایلی ئـەتۆمی
... بو مەرامی خۆیان نەقۆزنەوە گوتی، بەرنامـــەی ئـەتۆمی ئـێران بـەهیچ
... پەیوەندی بــەناکامی هەڵبژاردنــەکانی سـەرۆکایەتی ئێرانــەوە نـابێت،
هەروەها ئەوانەی ئــەمریکاش ئامــادەیی چارەســەرکردنی مامناوەنجیــان نیــە،
ئەمەش پێدەچێ لەئاینده ببێتە هۆی کەوتنــەوەی جــەنگی چوارەمــی کــەنداو.
چونکە:

١-چارەســەری ئــەمریکا بــۆ کۆتــایی هێنــانی کێشــەکە خـۆی لەتـــەواو دەستهەڵگرتنی ئێران لەتوانا ئەتۆمییەکانی دەبینێتەوە کەپەیوەستە بەهــەردو ...کنەرەکـەی بوشـەهر، هـەروەها وازهێنـان لەهـەمو چالاکیــە ئەتۆمییــە ســەربازیەکانی کەپەیوەسـتن بـە بەرنامـــەی پیتــاندنی یۆرانیۆمــی ۲۳۵و دروستکردنی ئامێرەکانی سەنتەر ڤیوج. ئەمریکا لەبنەڕەتدا لەگەڵ ئەوەدا نیە ...ران ببێتە خاوەن تەکنەلۆجیای ئەتۆمی ئەگەر مــەدەنیش بـێ، چونکـە پێـی وایە ئەوە بۆ پەردە پۆش کردنی چالاکییــە ســەربازیەکانیەتیو بـە تێپـەڕبونی کاتیش توانای بەرهەمهێنانی بۆمبی ئەتۆمی دەبێت، واتە واشــنتۆن ئامــادەی گرتنەبەری هەر ڕێگایەکە بۆ پەککخستنی یەکجارەکی بەرنامەکەی ئێران.

۲-چارەسەری ئێرانیش بــۆ کۆتــایی هــاتنی کێشــەکە خـۆی لـەدرێژەدانی هەوڵەکانیدا دەبینێتەوە بۆ تەواوکردنی هەردو بەرنامــە ئەتۆمیــیە مــەدەنیو سەربازییەکەی بـەپێدانی هــەمو زەمانــەتێك کەرێگــە لەئاراســتەیەك بگـرێ کەبەرەو بەرهەمهێنانی بۆمبی ئەتۆمی بگرێت لەم بۆچونەشەوە دەکرێ وا لــەو

هەمو لێدوانانەی بەرپرسە جیاجیاکانی ئێران بگەین کە لەناو ئـــەم بازنەیـەدا دەسورێتەوە.

عەلی رەزا جەعفەری زادە، نوێنـــەری ئەنجومـــەنی نیشـتمانی ئۆپۆزیسـیۆنی ئێرانی لەواشنتۆن، سەبارەت بەئامانجی پرۆژەی ناتانز گوتی: ئـەم پرۆژەیـە بـۆ بەرهەمهێنانی سوتەمەنیی ئەتۆمییە. کۆمپانیای کالا ئەلکتریك کەبارەگاکەی لەتارانی پایتەختە کەرەستەو کەلوپەلی پرۆژەکەی بەشێوەیەکی نـهێنی پـەیدا کردوە.

سەرچاوەکان:

---

[1] حنان حسين الياسري، من هاجس التهديد الخارجي لايران الى دوافع الرد المعاكس بسلاح العوق، جريدة الصباح العراقية، يوم ١١/٣/٢٠٠٥

٢ محمد زاهر، قراءة في الملف النووي الايراني، جريدة اللواء الصادرة عن المركز الاردني للدراسات والمعلومات، العدد ١٦٥٧ في ١٨/٥/٢٠٠٥.

[3] جنان حسين الياسري، هەمان سەرچاوەی پێشو..

[4] نيم هاني خلاف، القدرات النووية الايرانية، المنظور الدولي و الاقليمي، مجلة السياسة الدولية، العدد ١٤٢، القاهرة اكتوبر ٢٠٠٠ لا ١٥٠.

[5] محمد منيسي، هل انتهت ازمة البرنامج النووي الايراني؟، مختارات ايرانية، مركز الدراسات السياسية والاستراتجية، ١ القاهرة /١/٢٠٠١ www. Ahram. Org.eg.acpss.

[6] احمد سيوفي، النووي، شوكة امريكية في ظهر ايران، اسلام اونلاين، شؤون سياسية، ١٤/٤/٢٠٠٤..www.islamomline.net

[7] جنان حسين الياسري، هەمان سەرچاوەی پێشو.

[8] محمد زاهر، قراءة في الملف النووي الايراني، هەمان سەرچاوەی پێشو.

[9] هەمان سەرچاوەی پێشو.

[10] هەمان سەرچاوەی پێشو.

[11] هەمان سەرچاوەی پێشو.

[12] تميم هاني خلاف، القدرات النووية الايرانية، هەمان سەرچاوەی پێشو. لا ١٥١.

[13] هەمان سەرچاوەی پێشو. لا ١٥١.

[14] هەمان سەرچاوەی پێشو. لا ١٥٣.

[15] جوزيفس. ناي، سبيل افضل لتقليل الاخطار النووية. پرۆجێکت سنديكيت، شوبات/٢٠٠٤، www.priject-syndcate.

[16] سەید محەمەد رەییس زادە، توانا ئەتۆمییەکانی پاکستان، وسیروان جەلال، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارەی ٢ ساڵی نۆیەم، سلێمانی ئابی ٢٠٠١ لا ١١٠.

[17] بشير عبدالفتاح، المسالة النووية الايرانية.. تسوية ام هدنة؟ مجلة السياسة الدولية، القاهرة يناير ٢٠٠٥ www.ahram. org. acpss.

[18] هەمان سەرچاوەی پێشو.

[19] احمد سمان، الحصار التكنولوجي والتوجي والتوجه الخارجي الايراني، مختارات ايرانية، مركز الدراسات السياسية والاستراتيجية القاهرة ١/١//٢٠٠١.www.ahram. org.eg.acpss.

[20] هەمان سەرچاوەی پێشو.

[21] هەمان سەرچاوەی پێشو

[22] تميم هاني خلاف، القدرات النووية الايرانية، هەمان سەرچاوەی پێشو لا١٥١.

[23] سەید محەمەد رەییس زادە، توانا نەتۆمییەکانی پاکستان‌و سیروان جەلال، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، ژمارە ٢ ساڵی نۆیەم، سلێمانی تابی ٢٠٠١، لا١١٠.

[24] التقرير الاستراتيجي العربي(٢٠٠٣-٢٠٠٤) مركز الدراسات السياسية و الاستراتيجية، الطبعة الاولى/ القاهرة/ اغسطس، ٢٠٠٤ ص ١٣١.

[25] هەمان سەرچاوەی پێشو.

[26] معهد واشنطن لسياسة الشرق الادنى، برنامج ايران النووي، سايتى مركز الشرق العربي للدراسات الحضارية والاستراتيجية، ٢٠٠٣/٣/٢٤..www.asharqalarbi. org.

[27] خالد عمر عبدالحليم، الملف النووي الايراني بين المفاوضات الاوروبية والتهديد الاسرائيلي، جريدة الخليج الاماراتية، ٢٠٠٥/٣/٢٤. هەروەها بڕوانە: بيسان عدوان، ايران النووية في مؤتمر هرتسليا الخامس، مختارات ايرانية، مركز الدراسات السياسية والاستراتيجية القاهرة.٢٠٠١/١/١.www.ahram. org.eg.acpss




# پەرەسەندنی مێژوویی دەوڵەت

**لەتیف مستەفا ئەمین**
**ماستەر لەبواری یاسای گشتی**

لەڕوی مێژوویی‌یەوە ئەستەمە سەرەتای پەیدابونی دەوڵەت دەستنیشان بکرێ بەلام ئەوەی ساغ بۆتەوە ئەوەیە کەمرۆڤ لانی کەم سەد هەزار ساڵ لەمەوبەر لەسەر ئەم هەسارەیە پەیدا بوە کەچی کۆنترین دیکۆمێنتی بەردەست ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کەمێژوی پەیدابونی کۆمەڵە سیاسییەکان دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لەپێنج هەزار ساڵ[1].

ئێمەش لێرەوە دەست بەگێڕانەوەی دیرۆکی پەیدابونی دەوڵەت دەکەین لەئیمپراتۆریەتەکانی رۆژهەلاتو هەردو سەردەمی یۆنانو گریکەوەو بە سەدە ناوەڕاستەکان دا تێدەپەڕینو دەگەینە سەردەمی رێنیسانسو لەچاخی تازەدا کۆتایی بەگەشتەکە دێنین.

## یەکەم: دەوڵەت لەئیمپراتۆریەتە دێرینەکانی رۆژهەلاتدا

مێژو ساغی کردۆتەوە کەیەکەم شێوەی دەوڵەت لەرۆژهەلاتدا پەیدا بوە[2]و لەو ناوچەیەدا ئیمپراتۆریەت لەمیسری فیرعەونیو ئاشورو بابلو فارسو هیندو چیندا سەری دەرهێناوە.

ئەم ئیمپراتۆریەتانە تایبەتمەندیی گشتیی هاوبەش پێکەوەی کۆ دەکردنەوە لەوانە پشت بەستنیان بەرژێمێکی پاشایەتیی ئۆتۆکراتی پشت ئەستور بەبنەمایەکی ئاینی کەتێیدا پاشا دەسەلاتی لەخواوەندەوە وەردەگرت یاخود خودی خۆی بەخواوەند دادەنرا[3].

فیرعەونەکانی میسر بەخۆیان دەوت(رەع) واتە خواوەندی پیرۆزو لەولاتی ئاشورو بابلیش پاشاکان خۆیان بەخواوەند دادەناو لەم بارەیەوە لەبت عشتار لەیاساکەیدا دەڵێ((منم لەبت عشتار، کوڕی خواوەند ئنلیل))[٤]

هەروەها لەهیندستانی دێریندا دەسەلاتی پاشا لەبراهمای خواوەندی گەورەوە سەرچاوەی دەگرت‌و لەچینی دێریندا دەستوری(جوو)کەکۆنترین ئاسەواری ئاینە، دەسەلاتەکانی ئیمپراتۆری لەسەر بنەمای ئاین دیاری کرد[٥]. واتە پاشا خۆی بەخواوەندێکی سەروی مرۆڤ داناو دەسەلاتەکەی بوو بەدەسەلاتی خواوەندو ئیتر بەم پێیە دەسەلاتەکەی بوو بەدەسەلاتێکی رەهای بێ سنورو خودی خۆی لەبەردەم کەسدا بەرپرسیار نەبوو، بۆیە لەم ئیمپراتۆریەتانەدا بیرۆکەی دەوڵەت جیا نەبوو لەکەسایەتی‌ی حوکمڕانەکان بەڵکو کۆمەڵی سیاسی تیایاندا لەسەر بنەمای پاشا دادەمەزرا کە بەخاوەنی هەر چی‌ی زەوی‌و موڵك‌و سامان‌و خەڵکانی دەوڵەتەکەی دادەنراو هەمو دەسەلاتەکانی یاسادانان‌و راپەڕاندن‌و داوەری‌و هەروەها دەسەلاتی ئاینیشی بۆ خۆی گل دابۆوە. بیرکردنەوە لەجیابونەوەی دەسەلات لەکەسایەتی‌ی حوکمڕانەکان‌و بیرکردنەوە لەرێکخستنی ئەو دەسەلاتە لەو سەردەمانەدا هێشتا سەری دەرنەهێنا بوو، ئەگەرچی چەشنە رێکخستنێکی سیاسی‌ی بەخۆوە دی بوو[٦].

## دووەم: دەوڵەت لەسەردەمی گریکەکاندا

سەرچاوەی راستەقینەی بیری سیاسی، ولاتە گریکەکانە. ئەم بیرە دو رەوەندی هەبو: یەکەمیان رەوەندی کردارەکیی رون بوو و ئەوی دیکەیان گەڕان بوو بەدوای دەوڵەتی نمونەیی.

سیستمی شاری سیاسیی سەربەخۆ کەخۆی لەخۆیدا دەوڵەتە، یەکێ لەگرنگترین خەسڵەتەکانی مێژوی کۆنی یۆنانە. لەوێ دەوڵەتی شار روبەرێکی دیاریکراوی هەبو و خاوەنی سەربەخۆیی‌یەکی سیاسی‌و ئابوری بوو. لەیۆناندا زۆر شار هەبو گەورەترینیان ئەسیناو سپارتا بوو[٧].

سەبارەت بەرەوەندی کردارەکی، گریکەکان هەمیشە خەخۆری دۆزینەوەی چاکترین رێوشوێنی حوکمڕانی‌و رێکخستنی پەیوەندیی نێوان سەردەست‌و

(بڕدەستو شێوەی حکومەت بون. بونی ژمارەیەکی زۆری شاری سیاسیی ئازادو ململانێی نێوان ئەسینای دیموکراتو سپارتای ئۆرۆستۆکرات پارمەتیی سەر دەرهێنانی بیروباوەڕی سیاسیو گفتوگۆی رژێمە جیاوازەکانی دا[8].

لەهەلومەرجی سیاسیدا یۆنان چەندان رژێمی سیاسیی جیاوازی بەپێی شارە سیاسییەکان تێدا هەڵکەوتبو وەك رژێمی حوکمڕانیی ئۆرۆستۆکراتو رژێمی دیموکرات.

بۆ نمونە، ئەگەر لەسیستمی فەرمانڕەوایی‌ی دەوڵەتی ئەسینا ورد بینەوەو وەك نمونەیەکی تاوتوێ کردنی دەسەڵاتی شارە یۆنانییەکانی وەرگرین، دەبینین ئەم شارە خاوەنی دەستورێکی دیموکرات بوەو زانیاریش لەبارەیەوە تارادەیەکی زۆر زانیارییەکی تەواوە[9]. هەمو شارەکان دەزگای سیاسیی سەرەکییان هەبوو و رژێمە سیاسییەکەیان لەسێ دەزگا پێکدەهات[10]:

**دەزگای یەکەم: کۆمەڵەی گشتی(Ecelesia)**

ئەم دەزگایە باڵاترین دەزگای سیاسی بوو و لەهەموو هاوولاتییە ئازادە نێرینەکانی لە٢٨ ساڵ سەر بەرەو ژور پێکدەهاتو دە جار لەساڵێکدا کۆ دەبۆوە. جگە لەکاروباری سیاسی، دەسەڵاتی دەرکردنی یاساو هەڵبژاردنی دادوەرو بڕیاردان لەسەر شەڕو ئاشتیو مۆرکردنی رێککەوتننامەو چاودێری کردنی بودجەشی هەبوو و دەسەڵاتەکانی هەمو شتێکی دەگرتەوە.

**دەزگای دووەم: ئەنجومەنی راوێژکاران(ئەنجومەنی پێنج کەسی)**

لەنوێنەرانی دە خێڵە سەرەکییەکەی شار پێکدەهات، واتە هەر خێڵێك دە ئەندامی هەبوو و دەسەڵاتێکی فراوانی لەبواری یاسادانانو بەڕێوەبردندا هەبو. ئەم دە خێڵە بەدرێژایی‌ی ساڵ بەنۆرە حوکمڕانییان دەکرد ئەویش لەبەر ئەوەی کەئەنجومەنەکە تێکڕا نەیدەتوانی حوکمڕانی بکا[11]. لەبەر ئەوەش کەکۆمەڵەی گشتی نەیدەتوانی بە بەردەوامی کۆبونەوە بکاو مشوری کاروباری حوکمڕانی بخوا، ئەنجومەنی راوێژکار بەکردەوە دەسەڵاتی دەبرد بەڕێوەو یەکێ لەئەرکەکانی نامادەکردنی پرۆژەی یاساکانو جێبەجێ کردنی یاساکانو سەرپەرشتی کردنی

کاروبـاری دارایـیو مـافی دادگـایی کردنـی هاوولاتییـانو پیشـوازی کردنـی بالیوزەکانو هەلسوراندنی کاروباری دەرەوە بوو.

### دەزگای سییەم: دادگاکان[12]

ئەندامانی دادگا لەریزی گەل بو ماوەی یەك سال هەلدەبژیردران و سیستمی دادگاکـان نوینەرایـەتیی سانسوری گـەلی دەکـرد لەسـەر یاسـاو دادوەرەکـانو ئەرکەکانی ئەو دادگایانە بریتی بـون لەچارەسـەرکردنی ناکوکییـەکانو تـاوتوی کردنـی رەوایـیـی یاسـاکانو سەرپەرشـتی کردنـی کاروبـاری هاوولاتییـانو لیپرسینەوەیانو پیداچونەوەی حیساباتو کاروباری گشتی. تاکەکان دەیـانتوانی لەبـەردەم دادگـادا تانـەو تەشـەر لەیاسـاکانو بریارەکـانی ئەنجومەنـەکانو هەلسوکەوتی کارمەندان بدەن. ئەو تانەو تەشەرانەش لییـان رادەبیـنرا جیبـەجی کردنـی یاسـاو بریـاری تانـەو تەشـەر لیـدراو هەلپەسـیرن تـا مەسـەلەی تانـەو تەشەرەکە یەکلا دەکرایەوە[13].

سەرنج دراوە کە لەسەردەمی دەولەتی شـاردا دەزگـای جیـا جیـای دەولـەتو دابەشـکردنی پوسـتە جیاوازەکـان بـەدی دەکـری بـەجوریك کەهـەر دەزگایـەك بەئەنجامدانی کاریکی دیاریکراوەوە خـەریك بـوو. نابـی ئـەم مەسـەلەیە وا بیتـە بـەرچاو کەچەشـنە ریکخسـتنیکی دەسـەلاتە یـاخود لیـك جوداکردنـەوەی دەسەلاتەکانە بەو مانایەی ئەمرو باوە چونکە دابەشکردنی ناوبراوو فرەییی دامو دەزگاکـان زیـاتر پـەیوەندیی بەسروشـتی پیکهاتـەی دەولـەتی شـارەوە هـەبوو و پەیوەندیی بەلیك جیاکردنەوەی دەسەلاتەکانەوە نەبو چونکـە ئامـانجی پرنسـیپی لیك جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان کەدواتر سەری هـەلدا کـوت کردنـی دەسـەلاتی حوکمرانەکانـە بـو مسـوگەرکردنی ئـازادیی تاکـەکان، لـەکاتیکدا لەسـەردەمی دەولـەتی شـاردا شـتیك نـەبو نـاوی ئـازادیی تاکـەکان بـی[14]. لـەو سـەردەمەدا روخسارەکانی دیموکراسیی راستەوخوو فەرمانرەواییی گەل تەنها بو هاوولاتییـە ئازادە نیرینەکان سەلمینراو بوو. ئەمە لەلایەك. لەلایـەکی تـرەوە، تـاك بەرامبـەر بەدەولەت هیچ مافیکی نەبوو چونکە تاك لەبوتەی کومەلدا دەتوایەوەو دەولەت

بوی هەمو چارەنوسی دیاری بکاو ئازادییەکانی دەستنیشان بکاو دەست لەشایەنترین کاروباری وەر بدات.

ئەمە لەسەر ئاستی سیاسی. لەسەر ئاستی بیریاری، راستە لەو سەردەمەدا بیریارو فەیلەسوفی گەورەی وەك ئەفلاتون و ئەرستۆ هەبوە بەلام بیرکردنەوەی ئەوانیش لەچوارچێوەی ئاستی سیاسیی سەردەمەکەیان نەدەترازا.

پوختەی باس ئەوەیە کەئەم بیریارو فەیلەسوفانە وەك دواتر دەرکەوت، هەریەکی دانانی تیۆرییەکی هەمەگیرو گشتلایی نەبون بۆ رێکخستنی دەسەلات بەلکو بیرکردنەوەیان لەوە زۆرتر ئەچو کەبەشوێن چاکترین جۆری حکومەت بگەرێن.

لەم روەوە ئەفلاتون Platon (٤٢٧-٣٤٧پ. ز)کە لەمتافی لاوێتیدا ئایدیالیست بوو، کتێبێکی بەناوی(کۆمار)ەوە داناو تێیدا دالغەی بەدەولەتێکی نمونەیی لێدا کەفەیلەسوفەکان حوکمڕانن تێیدا[١٥]. بەلام ئەفلاتون لەکۆتایی ژیانیدا دەستبەرداری ئەم بۆچونانە بوو و واقیعبینتر بۆ مەسەلەکە چو، ئەویش لەکتێبی((یاساکان))دا کەتێیدا دەستورێکی دانا لەسەر بنەمای رژێمی تێکەلاوو دەسەلاتی کرد بەسێ دەزگاوە کەبریتی بون لەکۆمەلەی گشتی و ئەنجومەنی گەل و دادگاکان. ئەنجومەنەکەشی کرد بەدوانزە بەشەوە کەمانگانە یەك لەدوای یەك حوکم دەگێڕن.

ئەرکەکانی دەولەتیشی بەسەر شەش دەزگادا دابەش کرد کەهەر دەزگایەك ئەرکێکی دیاریکراوی ئەنجام دەدا[١٦] ئەویش بەم چەشنە:

١-ئەنجومەنی سەردارێتی: کەهەژمونی خۆی بەسەر هەمو کاروباری دەولەتدا دەسەپێنێ.

٢-کۆمەلێ: کە لەبلیمەتە گەورەو یاسا دانەرەکان پێکدێ و ئەرکی پاراستنی دەستورە.

٣-ئەنجومەنی پیران: کە لەلایەن گەلەوە هەلدەبژێردرێ و ئەرکەکەی دەرکردنی یاسایە.

٤-دەزگای داوەری: کە لەچەند دادگایەك بەپلەی جیاواز پێکدێ و ئەرکەکەی چارەسەرکردنی کێشەو ململانێکانە.

٥-دەزگای پۆلیس: بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوخۆو سوپا.

٦-چەند دەزگایەکی فێرکاریی جیاوازو دەستەیەکی راپەڕاندن بۆ هەڵسوڕاندنی هەمو رشتە گشتییەکانی دەوڵەت.

لەسایەی ئەم رژێمەدا تاکەکان ملکەچی یاسان و دەبێ حوکمڕانەکانیش پەیڕەوی لەدادپەروەری بکەن و تەنها ئەگەر بەمەبەستی بەدی هێنانی داد بێ، حوکمڕانەکان دەتوانن هێز بەشێوەیەکی رەوا بەکار بێنن[١٧].

بەلام قوتابییەکەی ئەفلاتۆن، واتە ئەرستۆ(٣٨٤-٣٢٢ پ. ز)لەمامۆستاکەی واقیعبینتر بوو و ئەوەندەی خەریك بوو بەلێك جیاکردنەوەی روخسارەکانی هەڵسوڕانی دامودەزگاکانی دەوڵەت و ئەرکەکانی دەوڵەت ئەوەندە خەریك نەبو بەگیروگرفتی دابەشکردنی دەسەلاتەکان.

ئەرستۆ لەئەرکەکانی دەوڵەت راماو بەو سەرەنجامە گەیشت کەدەوڵەت سێ ئەرکی بنچینەیی هەیە[١٨]:

١-ئەرکی یاسادانان یاخود وەك ئەرستۆ ناوی ناوە((ئەرکی تاوتوێ کردنی مەسەلە گشتییەکان))کەیەکەم و گرنگترین ئەرکەو پەیوەندیی بەکێشە ژیانییەکانی دەوڵەتەوە هەیە وەك بڕیاردان لەسەر شەڕو ئاشتی و بەستنی رێککەوتننامەو سزادانی تاك، لەپاڵ ئەرکە بنچینەییەکەی کەیاسادانانە. ئەمە بەو واتایە دێ کەمەسەلەی تاوتوێ کردنی مەسەلە گشتییەکان لەلای ئەرستۆ فراوانترە لەئەرکەکانی دەسەلاتی یاسادانانی ئەم سەردەمەمان. ئەرکی یاسادانان بەلای ئەرستۆوە ئەرکێکە لەکۆمەڵەی گشتیی هاوولاتییاندا بەئەنجام دەگەیەنرێ و شێوەی پێکهێنانی ئەم کۆمەڵە دەوەستێتە سەر هەلومەرجی دەوڵەت و رژێمی حوکمڕانی و هیچ روخسارێکی نەگۆڕی نییە.

٢-ئەرکی راپەڕاندنی کاروبار: ئەمەش بەلایەوە ئەرکێکە مەل بۆ کۆمەڵەی گشتی کەچ دەکاو دەستور دەسەلات و چۆنێتی و ماوەی هەڵسوڕانی ئەم ئەرکە دەستنیشان دەکاو بەشێوەیەکی گشتی ئەرکەکە پەیوەندیی بەجێبەجێ کردنی یاساو پاراستنی ئاسایشەوە هەیە.

٣-ئەركی داوەری(داد): ئەركێكە ئاماغجەكەی یەكلاكردنەوەی كێشە جیا جیاكانە، سەرباری چاودێری كردنی كۆمەڵەی گشتی‌و دەستەی راپەڕاندن لەمەسەلەكانی تایبەت بەرەوایی‌ی یاساكان‌و چۆنێتی‌ی جێبەجێ كردنیان[19].

بەلای ئەرستۆوە پێویستە ئەو ئەركانە نەكەونە دەستی یەك كەسەوە یاخود یەك دەزگاوە بەڵكو دەبێ هەر یەكێكیان بەدەزگایەكی تایبەت بسپێردرێ بەو مەرجەی كەئەو دەزگایانە هاریكاری یەكتری بكەن‌و چاودێریی یەكتری بكەن. بەلام ئەمە بەو مانایە نیە كەئەرستۆ بانگەشە بۆ لێك جیاكردنەوەی دەسەلاتەكان دەكا وەك هەندێ وای بۆ دەچن بەڵكو تەواوی ئەوەی ئەو گوتویەتی لەوە تێناپەڕێ كەئەو بەپێی هەلومەرجی سیاسی‌و دەزگا سیاسییەكانی سەردەمی شاری ئەسینا قسەی كردوە، سەرباری هەندێ هەمواركردنی هەڵقولاوی ئەندێشەو بیرە تیۆرییەكانی خۆی[20].

## دەوڵەت لەسەردەمی رۆمانەكاندا

بیری رۆمانەكان ئەوەندەی رەنگی بیری یاسایی‌ی لێ سوا بوو ئەوەندە رەنگی بیری سیاسیی لێ نەسوا بوو چونكە رۆمانەكان هەر خەریكی جیهانگیری‌و شەڕوشۆڕو گرتنی ولاتان بوون‌و شەیدای سەركەوتن بون، ئەمەش وای لێ كردن وا تێبگەن گوایە رژێمە سیاسییەكەیان چاكترین رژێمەو لەم سۆنگەیەوە زۆر خۆیان بەبیری سیاسییەوە خەریك نەكرد[21]. ئاسەوارە سیاسییەكانی ئەو سەردەمە ئەوەندە زۆر نین كەببنە هۆی یارمەتیدانی لێكۆڵیار بەلام بەگشتی ئەوە ساغ بۆتەوە كەسەردەمی رۆمان بەسێ قۆناغی مێژوییدا تێدەپەڕێ كەبریتین لەسەردەمی پاشایەتی، سەردەمی كۆمارو سەردەمی ئیمپراتۆریەت[22].

لەسەردەمی پاشایەتیدا هێزی سیاسی لەدەستی پاشادا بوو لەگەڵ ژمارەیەكی كەمی بنەماڵە ئۆرۆستۆكراتەكان. پاشا بەسەرۆكی سیاسی‌و سوپایی‌و ئاینی دەژمێردراو دەسەلاتێكی رەهای هەبوو. ئەگەرچی لەو سەردەمەدا ئەنجومەنێك بەناوی ئەنجومەنی پیرانەوە هەبو كە لەسەرانی خێڵەكان پێكدەهات بەلام ئەركی ئەم ئەنجومەنە ئەركێكی سەرتاپا راوێژكارانە بوو و پاشا مەرج نەبو گوێڕایەڵی راسپاردەكانی ئەنجومەنەكە بێ. جگە لەوە چەندەها

ئەنجومەنی گەلیش هەبو کەپاشا بۆ کۆبونەوە بانگهێشتی دەکردن‌و ئەرکەکەیان تایبەت بوو بەلێدوان سەبارەت بەو مەسەلانەی کەپاشا پێشنیاری تاوتوێ کردنیانی دەکرد.

لەسەرەتای سەردەمی کۆماردا کەسالّی ٥٠٩ پ. ز دەستی پێ کردو تا سالّی ٢٧ پ. ز درێژەی کێشا، برێك رێکخستنی دەسەلاّت‌و پەیڕەوی کردنی حوکمڕانیی دیموکرات لەئارادا بوو و لەرژێمە دەستورییەکەدا ئەنجومەنی گەل‌و ئەنجومەنی پیران‌و ئیمپراتۆر لێك جیا کرانەوەو هەر یەکێکیان دەسەلاّتی راستەقینەی خۆی هەبو[٢٣].

لەو سەردەمەدا گۆڕانێکی جەوهەری داهات ئەویش یەکسانیی چینی گشتی‌و نەجیبزادەکان بوو و ئیمپراتۆر نوێنەرایەتیی گەلی دەکرد، بەتەنها گەلیش دەسەلاّتێکی فراوانی بێ سنوری هەبو. هەر لەو سەردەمەدا سیستمی دو کۆنسۆل داهێنراو بەپێی ئەم سیستمە دەسەلاّت خرایە دەست دو کەسەوە کە لەڕوی دەسەلاّت‌و لێپرسینەوەوە یەکسان بون‌و پێیان دەگوترا کۆنسۆل. ئەم دو کۆنسۆلە تەنها یەك جار بۆ ماوەی یەك سالّ هەلّدەبژێردران‌و هەر یەکێکیشیان مافی هەبو نارەزایی بەرامبەر بەبڕیارەکانی ئەوی دی دەربڕێ[٢٤]. مەبەست لەم رێوشوێنەی سەرۆکایەتی کردنی دەولّەت، خۆ رزگارکردن بوو لەتاکڕەویی حوکمڕانەکان‌و کارکردن بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندیی گشتی.

لەسەردەمی کۆماردا ئەنجومەنی پیران بوو بەکۆمەلّەیەکی راستەقینەو حوکمڕانەکانی بەلاوە وەك کارمەند وا بون. ئەمەش هەلێکی وای رەخساند کەبتوانرێ سالاّنە کۆنسۆلەکان هەلّبژێردرێن، سەرباری تازەکردنەوەی هەلّبژاردنی فەرمانبەرە گەورەکان.

ئەنجومەنەکانی گەلیش وەکو جاران بەڕێوە دەچون بەلاّم لەو سەردەمەدا ئەو ئەنجومەنانە دەرگایان تەنها بۆ ئەندامێتی نەجیبزادەکان والاّ نەبو بەلّکو خەلّکانی تریشی تێکەوت. ئەو ئەنجومەنانە کاریان هەلّبژاردنی دو کۆنسۆلەکەو هەندێ کارمەندی تر بوو، جگە لەوەی کەدەیانڕوانییە پرۆژەی یاساکان‌و لەسکالاّنامەکانیان دەکۆلّییەوە.

لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتدا واتە پاش ساڵی ٢٧ پ. ز تا روخانی ئیمپراتۆریەتی رۆژئاوای رۆمان لەساڵی ٤٧٦دا، فەرمانڕەوایی لەدیموکراسییەوە بوو بەئۆتۆکراسیو وردە وردە دەسەلاتەکانی ئیمپراتۆر پەرەیان سەندو وردە وردە ئەو دەسەلاتە جێی دەسەلاتەکانی ئەنجومەنی پیرانی گرتەوەو ئیمپراتۆر روخسارێکی پیرۆزی پەیدا کردو دەسەلاتەکەی بوو بەدەسەلاتێك کەریشەکەی دەچوو سەر خواوەند. بۆیە دەسەلاتی ئیمپراتۆر هەمو شتێکی گرتەوەو رۆڵی ئەنجومەنی گەل ئەوەندە لەکزیی دا کەئیتر کۆبونەوەشی نەدەکرد. لەم سۆنگەیەوە گەل ئەو مافەی نەما کە لەئیمپراتۆر بپرسێتەوە[25]. مەسەلەکە بەو جۆرە درێژەی کیشا تا ئیمپراتۆریەتی رۆمان لەسەر دەستی خێلە درندەکانی گێرمەن لەساڵی ٤٧٦ی زانینیدا هەرەسی هێنا.

وەك گوتمان، رۆمانەکان شارەزایی تەواویان لەفەلسەفەو بیری سیاسیدا نەبوو و لەم بارەیەوە بنەچەی بیری سیاسییان دەچێتەوە سەر گریکەکان. فەیلەسوف بۆلیبس (٢٠٤پ. ز- ١١٦پ. ز)کەبەردی بناغەی بنەڕەتیی بیری رۆمانیی داناوە، بەرپشە یۆنانی بوو.

بۆلیبس دەستوری رۆمانیی سەردەمی خۆی تاوتوێ کرد، زۆری بەشانو باهوی هەڵدا، لایەنە چاکەکانی دەرخست، دابەشکردنی ئاسایی حکومەتەکانی بۆ حکومەتی پاشایەتیو ئۆرۆستۆکراتو دیموکرات لەئەرستۆ وەرگرتو چەشنێکی تری خستە پاڵ کەکۆمارە، واتە ئەو سیستەمەی کە لەسەر بیۆکەی رژێمی تێکەلاو پێکهاتبوو و هەمو روخسارەکانی سێ جۆرە حکومەتەکەی تێدا کۆ ببۆوە. ئەم سیستەمە بەلای بۆلیبسەوە لەهەمو جۆرە حکومەتەکانی تر باشتر بوو چونکە هاوسەنگیی هێزە جیاوازەکانی رادەگرت[26].

بۆلیبس پێی وابو هەر سێ نمونەی ناوبراو بەهاوسەنگیو یەکسانیو هەماهەنگی لەدەستوری کۆماری رۆماندا بەدی دەکرێن هەم بەبەراورد لەگەڵ یەکەری رژێمی سیاسیو هەم بە بەراورد لەگەڵ چۆنێتیی بەرێوەچونی کاروباری رۆژانەو لەم سۆنگەیەوە پشتیوانیی لەهێنانە کایەی سیستەمێکی میانڕەو کرد

کەهێزەکان تێیدا هاوسەنگن و هەر یەکێکیان لێ ناگەڕێ ئەوی تر بەرەو توندڕەوی یاخود دکتاتۆری بچێ.

بەگشتی، دەبینین بەم جۆرە گوزارشتی لەهەر سێ نمونە کرد ((ئەگەر بڕوانینە دەسەڵاتی کۆنسوڵەکان رژێمی پاشایەتییان تێدا دەبینین و ئەگەر لەدەسەڵاتی ئەنجومەنی پیران ورد بینەوە رژێمی ئۆرۆستۆکراتی تێدا دەبینین بەڵام ئەگەر بڕوانینە دەسەڵاتی ئەنجومەنەکانی گەل دەبینین ئەو ئەنجومەنانە بەئاشکرا دیموکراسی دەردەخەن))[٢٧].

بۆلیبس وای بۆ دەچێ کەبنچینەی رژێمی تێکەڵاو هاوسەنگی و ئۆرەیە واتە بەمانایەکی وردتر هاوکاری و سەرەنجام هەماهەنگی. هاوسەنگی ی نێوان دەسەڵاتی سێ دەزگا سیاسییەکەی ئەم رژێمەش بریتین لەکۆنسوڵەکان، ئەنجومەنەکانی پیران و ئەنجومەنەکانی گەل. هەر یەکێ لەم سێ دەسەڵاتە هاوتای هەر دەسەڵاتێکی ترە بەجۆرێك کەداشی هیچ دەسەڵاتێك ناتوانێ سواری داشی دەسەڵاتێکی تر ببێ. لەهەمان کاتدا لەنێو ئەو سێ دەسەڵاتەدا هاوسەنگی و هەماهەنگی هەیە بەجۆرێك کەهیچ یەکێ لەم دەزگایانە بەبێ دەزگاکانی تر هیچ کارێکی بۆ ناچێتە سەرو لەئاکامدا دەتوانرێ بەهۆی دەزگاکانی ترەوە سنورێك بۆ هەر دەزگایەك دابنرێ. بەجۆرە، هەر دەزگایەك لەو چوارچێوەیەدا دەمێنێتەوە کەپێشەکی لەدەستوردا بۆی دیاری کراوە.

دەتوانین بڵێین کەئەوەی بۆلیبس لەو سەردەمەدا بانگەشەی بۆ کردوە زۆر نزیکە لەپرنسیپی لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بەو شێوەیەی کە لەچەرخی مۆدێرندا لەسەر دەستی مۆنتسکیو هاتۆتە دی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی بۆلیبس کردویەتی لەوە تێنەپەڕیوە کە وێنایەکی دامەزراوە سیاسییەکانی سەردەمی خۆی خستۆتە بەرچاو.

پاش بۆلیبس، فەیلەسوف شیشرۆن(١٠٦پ. ز ٤٣پ. ز)پەیدا بوو کەبیروڕاکانی خۆی لەدو کتێبەکەی کۆمارو یاساکاندا کۆکردەوەو چەمکی دەوڵەتی لەسەر بنەمای دەستوری تێکەڵاو داڕشت، ئەم بیرۆکەیەش زیاتر دەچێتەوە سەر بۆچونەکانی بۆلیبس. شیشرۆن وەك بۆلیبس پێی وابو رژێمی تێکەڵاو باشترین رژێمی حوکمڕانی یە[٢٨].

شیشـرۆن بـاوەڕی بـەتیۆریی پەرەسـەندنی مێژوویـی‌ی دەسـتوورەکان هـەبو، تیۆرییەك كە لەئەرستۆی وەرگرتبوو و پێی وابو دەوڵەت هەمیشە لەپەرەسەندندا دەبێ و ئەگەر لەشوێنی خۆیدا بچەقێ ئەوا بەتەواوی پەکی دەکەوێ. هەروەها لـەژێر کاریگـەریی ستۆکیسـتەکانیشدا[29] بـوو و لەوانـەوە فـێری مەسـەلەی ڕێکخستنی دەوڵەت بوو. بەم پێیە، دەوڵەت و یاسا بـەجۆرێك ڕێکدەخـرا کەیـەك کەسە، ئەو کەسەش لەناوەڕۆکدا چەندەها کەسە کە بەیەکسانی خاوەنی دەوڵەت و یاساکەن، بۆیە پێویست بوو لەسەر دەوڵەت بەپێی قازانجی تاکەکان هەڵسوکەوت بکات چونکە هێزی دەوڵەت زادەی هێزی کۆکراوەی تاکەکانـەو هەمیشـە دەبێ ئەو دەوڵەتە ملکەچی یاسای خواوەند یاخود یاسای سروشت بێ[30].

شیشـرۆن و بۆلیبـس ئـەوەیان لەئەرسـتۆ وەرگـرت کـەدەبێ دەوڵـەت ئـەرکی جیاوازی تێدا بێ بۆ ئەوەی دەزگـا جیاوازەکـان هـەر سـێ ئەرکـە یاسـاییەکەی دەوڵەت بەئەنجام بگەیەنن و لەم ڕووەوە وەستایانەو ژێرانە بیرۆکەی بالانسیان خستە پاڵ واتە ڕاگرتنی هاوسەنگیی نێوان هەر سێ دەسەڵات، ئەوەی لـەم سـەردەمەی ئێمەدا پێی دەگوترێ پرنسیپی بەسەرکردنەوەو هاوسەنگی Cheak and balance بەڵام شیشرۆن بـەوە لـەبۆلیبس جودا دەکرێتـەوە کەدەسـەڵاتی گـەلی (بەشـێوەی ئەنجومـەنی پیران) خسـتۆتە سـەروی دەسـەڵاتەکانی تـر[31]، ئـەویش لەسـەر ئـەو بنچینەیەی کەگەل سـەرچاوەی هـەمو دەسـەڵاتەکانەو بەلایـەوە باشـە ئەنجومـەنی پیران لەوانە پێك بێ کەحوکمڕانییان کردووە چونکە تەنها بەهۆی گەلەوە هەموو کەسێك بەو ئاستە دەگـات و بڕیارەکانیشـی بڕیـاری یاسـایی دەبـن[32]. شیشـرۆن دەوڵەت و حکومـەتی لێك جوێ کردەوە ئەوەش لەو دیدەوە کەدەوڵەت دەزگایـەکی سیاسییەو حکومەتیش لەبری گـەل دەسـەڵاتی سیاسـی هەڵدەسـوڕێنێ. شـایانی باسە کەبیرمەندانی ڕۆمـان دەسەڵات(Imperium) و جێبەجێ کردنی ڕواڵەتەکانی دەسەڵاتیان(Potest)لێك جیا دەکـردەوەو بەلایانـەوە دەسـەڵات تایبـەت بەگەلـەو ئـەوی تـر تایبـەت بـەئیمپراتۆرە بـەپێی پـەیمانێکی سیاسـی‌ی پشـت بەسـتوو بەبیرۆکەی سپاردنی دەسەڵات بەئیمپراتۆر[33].

## دەسەڵات لەسەدە ناوەڕاستەکاندا

### یەکەم-لەئەوروپا:

سەردەمی ناوەڕاست لەسەدەی پێنجی زاینییەوە بەڕوخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمان لەساڵی ٤٧٦ لەسەر دەستی خێڵە دڕندەکان دەست پێ دەکاو لەسەدەی پانزەهەمی زاینیدا کۆتایی دێ. ئەم سەردەمە بەسەردەمێکی تاریک ناو نراوە. لەو سەردەمەدا سیستەمی دەرەبەگایەتی سەری دەرهێنا چونکە بەربڵاویی ئیمپراتۆریەتی گێرمانەکانو پەل هاوێشتنی بۆ زۆربەی هەرە زۆری ناوچەکانی ئەوروپا، دەسەڵاتی ناوەندیی ئیمپراتۆری لەناوچەکاندا لاواز کردو بوە هۆی ئەوەی کەئیمپراتۆر چەند حوکمڕانێك لەهەرێمە جیاجیاکاندا دابمەزرێنێو زۆری نەخایاند ئەو حوکمڕانانە لەهەڵسوڕاندنی کاروباری هەرێمەکانیاندا سەربەخۆییان بەدەست هێناو دەسەڵاتی تەواویان پەیدا کردو دەستڕۆیشتوویی خۆیان سەقامگیر کردو لەو سۆنگەیەوە ئیمپراتۆر تەنها دەسەڵاتی فەرمیی بۆ مایەوە[٣٤].

بەهۆی ئەمەوە کۆمەڵ کەوتە ژێر کاریگەریی سێ دەسەڵات لەیەك کاتدا کە لەسەروی هەموویانەوە دەسەڵاتی سەرۆکی دەرەبەگەکان بوو واتە پاشا ئینجا حوکمڕانەکان کە بەفەرمانی پاشا دامەزرانو دواتریش دەرەبەگە خۆماڵییەکان. هەر دەرەبەگ نشینێك سەر بەدەرەبەگ نشینێکی لەخۆ گەورەتر بوو و هێشتا ناسیۆنالیزمو قەوارەی نەتەوایەتی سەری دەرنەهێنا بوو ولەم ڕووەوە تاك هەستی دەکرد ئەو بەشێکە لەئیمپراتۆریەتێکی مەسیحیی جیهانی[٣٥].

لەسایەی ڕژێمێکی وادا دەرەبەگ بەخاوەنی زەویو زەوینشینەکان دادەنراو خودی خۆی هەم حوکمڕان بوو هەم دادوەر هەم فەرماندەی سوپا هەم باجگرو هەم خاوەنی مافی ڕەها بوو[٣٦].

لەپێنج سەدەی یەکەمدا مەسیحیەت لەگەڵ ئیمپراتۆردا تەبا بوو و تەنانەت ملکەچی ئیمپراتۆر بوو وخۆی لەپلەیەکی نزمتر لەپلەی ئیمپراتۆر دادەنا. پاشان کەنیسە زێدەڕۆیی لەبۆچونەکانیدا کردو کەوتە هەڵپەی ملکەچ کردنی دەسەڵاتی دەوڵەتو وای بڵاوکردەوە کەڕەوایی پاشا لەکەنیسەوە سەرچاوە دەگرێو هەر کات دەرکەوت پاشا دڵسۆزی کەنیسە نیە، کەنیسە دەتوانێ لەکاری

ەا. سەربار، مەسیحیەت نکوڵیی لەتیۆریی مافی خوایی‌ی پاشاکان کرد
دەقەشە بەرایی‌یەکان بانگەشەیان بۆ کردبوو[٣٧]. بۆیە، ئەم قۆناغە کڵپەسەندنی
ململانێی نێوان کەنیسەو پاشای بەخۆوە بینی. لێرەوە قەشە تۆمای ئیکوینی
یەکێ لەدیارترین بانگهێشتکارانی دەسەڵاتی کەنیسە دادەنرێ کە وای دانابوو
پلەی دەوڵەت لەپلەی کەنیسە نزمترەو لەبەر ئەوە دەبێ دەوڵەت خزمەتی کەنیسە
بکا بۆ ئەوەی کەنیسە ئامانجە بەرزەکانی خۆی پێ بهێندرێتە دی. ئەگەر
بڕیارەکانی دەوڵەت لەگەڵ بڕیارەکانی کەنیسەدا وێك نەهاتایەتەوە، ناوبراو ئەو
بڕیارانەی بەبڕیاری ناڕەوا دەدایە قەڵەمو مافی لەکارخستنی پاشای بۆ کەنیسە
دەسەلماندو داوای لەهاوولاتییانیش دەکرد چیتر گوێڕایەڵی نەبن[٣٨].

بەرامبەر بەمە، پاشاو دەستەو دایەرەکەی پێیان لەسەر تیۆریی مافی خوایی
داکرتو رایانگەیاند کەدەسەڵاتیان لەخواوە سەرچاوە دەگرێو ملکەچی
ڕێنمایی‌یەکانی پاپا نین[٣٩].

لەئاکامی ئەمەدا ململانێی نێوان دەسەڵاتی دەوڵەت کەخۆی لەپاشادا
دەنواندو دەسەڵاتی ئاینی کەخۆی لەکەنیسەدا دەنواند پەرەی سەندو بەو رادەیە
گەیشت کەئاسان نەبوو بزانرێ کامیان شایستەی دەسەڵاتنو وەك ئەوەی لێ هات
کەدنیای تەنها دو پیاوی تێدایە کەپاشاو پاپایە، ئیتر مەسەلەکە بەوە گەیشت
کەکەس نەما بیر لەرێکخستنی دەسەڵات بکاتەوەو چاکترین ڕێوشوێنی
حوکمڕانی بدۆزێتەوە. لەم بارەیەوە بیرۆکە سەرەتایی‌یەکانی چۆنێتیی
رێکخستنی دەسەڵات کە لەسەردەمی دەوڵەتی شاری یۆنانیو سەردەمی
کۆماری ئیمپراتۆریەتی رۆماندا سەریان دەرهێنابوو، پوکانەوەو مەسەلەکە چەند
سەد ساڵێك بۆ دواوە گەڕایەوەو دیسان دەسەڵات بەرگی فەرمانڕەوای لەخۆوە
پێچا.

وەك ئاکامێکی ئاسایی‌ی پەرەسەندنی ململانێی نێوان پاشاو پاپا، هەندێ
دەنگ بەرز بونەوەو کەوتنە سەرزەنشت کردنی ئەو هەلومەرجەو بانگەشەیان بۆ
لێك جیاکردنەوەی ئاینو دەوڵەت کرد. یەکێ لەوانەی بانگەشەیان بۆ ئەم
بیرۆکەیە بڵاوکردوەوە، یاساناس مارسیلیۆ بادوا بوو[٤٠] کەدەوڵەتی بەژێندار

چواندو وای بۆ چوو کەئەم ژیندارە لەچەند ئەندامێك پێکدێ کەهەر یەکێکیان ئەرکی گرنگ لەژیاندا جێبەجێ دەکاو چەند ئەو ئەندامانە پێکەوە بەرێکوپێکی کار بکەن، ئەوەندەش ژیندارەکە تەندروستتر دەبێ. بۆیە ئەو بیرەی لەلا گەڵاڵە بوو کەدەبێ حکومەتێکی مەدەنی وەك ئامرازێکی ئاسایش و سەقامگیری بێتە سەرکارو بەپێویستی زانی دەسەڵاتە جیاوازەکانی دەوڵەت لێك جودا بکرێنەوەو لەم بارەیەوە سنورێکی وننی لەنێوان ئەرکەکانی دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتی راپەراندن دیاری کردو وای دانا کەپێویستە دەستەیەکی یاسادارێژ هەبێ کە لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردراو بێ بۆ دەرکردنی یاساو هەر ئەو دەستە یاسا دارێژەشە کەدەبێ لەنێو خۆیدا دەزگایەکی راپەرێنەر بۆ سەرپەرشتی کردنی چۆنێتیی بەرێوەچونی ئەرکەکانی دەوڵەت هەڵبژێرێ[41] بادوا پێی وابو پێویستە دەزگا راپەرێنەرەکە یەکگرتو بێ بۆ ئەوەی دەوڵەت بتوانێ ئەرکەکانی خۆی بەتەواوی جێبەجێ بکات.

## دەوڵەت لەسەردەمی رێنسانسدا

سەردەمی رێنسانس بەوە ناسراوە کەدەوڵەتی نەتەوەیی تێدا پەیدا بووە کەدەوڵەتێکە کۆتاییی بەشێواویی گشتی و پەرەوازەیی سیاسیی پاشماوەی رژێمی دەرەبەگایەتیی سەردەمی ناوەراست هێنا[42]، ئەویش بەکۆکردنەوەی تەواوی دەسەڵاتەکان لەیەك کەسدا کەپاشایە، ئەو پاشایەش توانی بەهۆی مشتی ئاسنین و حوکمرانیی رەهاوە هەمو دەرەبەگنشینە خۆماڵییەکان رابماڵێ و یەك دەسەڵاتی ناوەندیی بەهێز لەدەوڵەتدا دروست بکات، سەرباری ئەوەی کەکەنیسەشی بۆ دەسەڵاتی خۆی ملکەچ کرد.

لەم سەردەمەدا بانگەواز بۆ دەسەڵاتی رەها باوی سەند، ئەمەش شتێکی سەیر نیە چونکە دکتاتۆریای تاك بەلای خەڵکەوە لەزوڵم و زۆری میرە دەرەبەگەکان باشتر بوو[43] بۆیە دەکرێ وا تەماشای بانگەواز بۆ دەسەڵاتی رەها بکرێ کە لەداخی زوڵم و زۆری سەردەمی دەرەبەگایەتی و دەستێوەردانی کەنیسە لەکاروباری دەوڵەتدا بووە.

لەم روەوە چەندەها فاکتەری ماددیو فیکری رۆڵیان هەبو لەهێنانە دیی پاشایەتیی رەهاو پشتیوانی لیٚ کردنی. لەروی فیکرییەوە هەر یەك لەنیکۆلای میکیاڤیللیو جان بودان لەو کەسانە بون کەهەڵگری ئاڵای بانگەشەکردن بون بۆ دەسەڵاتی رەها.

فەیلەسوفی ئیتالی میکیاڤیللی ١٤٦٩-١٥٢٧ پارچە پارچەییو پەراگەندەییو پەرتەوازەییی وڵاتی بەدڵ نەبوو و لەو بڕوایەدا بوو کە کەنیسە نزباڵی ئەم بارودۆخەی لەمل دایە چونکە نەیتوانیوە ئیتالیای لێك داپچڕاو یەکپارچە بکاو نەشیهێشتووە هێزی تر دەرکەویو ئەم ئەرکە جێبەجێ بکات[٤٤].

لەو سۆنگەیەوە لەکتێبەکەیدا ((میر)) داوای کرد سیاسەت لەئاینو ئاکار رزگار بکرێو وتی میر بۆ بەدی هێنانی ئامانج کەبریتییە لەدروست کردنی دەوڵەتێکی بەهێز، دەتوانێ پەنا بۆ هەمو رێوشوێنێك ببا با ئەو رێوشوێنە لەگەڵ ئاکارو ئاینیشدا رێك نەیەتەوە چونکە ئامانج پاساوی رێوشوێن دەدا.

بەهەمان پێودانگ فەیلەسوفی فەرەنسی جان بودان(١٥٢٩-١٥٩٦) تیۆریی سەردارێتیی داهێناو سەردارێتیی وا پێناسە کرد کەبریتی لەدەسەڵاتی باڵای رەهای هەمیشەییو نەشیاوی دابەشکردنو پارچە پارچەکردن کە ئامانجەکەی یەکپارچەکردنی دەسەڵاتە لەبەر دەستی پاشادا[٤٥]. لێرەوە بودان گوتی کەئەگەر لەڕوی تیۆرییەوە بتوانرێ ئەوە بگوترێ کەسەردارێتیی رەها وەك دەشێ بۆ تەواوی گەل یاخود بۆ کەمینەیەکی ئۆرۆستۆکرات بسملێنرێ هەروەها دەشێ بۆ یەك کەسیش بسملێنرێ، ئەوسا بەدی هێنانی سەردارێتی بەروخسارە رەهاو هەمیشەییو یەکگرتووەکانییەوە، تەنها لەسایەی رژێمێکی پاشایەتیدا دەشێ کاری پێ بکرێ. هەروەها وای بۆ چوو کەسەردارێتیی رەها بەو مانایە دێ کەسەردار مل بۆ کەس کەچ نەکا بەڵام ئەگەر هاتوو چەندەها سەردار هەبو، ئەوە دەبێ هەر یەکێکیان مل بۆ ئەوی تر کەچ بکاتو دواجاریش هیچ کامێکیان نابێ بەسەردارێکی راستەقینە[٤٦].

کرۆتسیۆس(١٥٨٣-١٦٤٥) کەخاوەنی خوێندنگەی یاسای سروشتی بوو پشتیوانیی لەبیرۆکەی سەردارێتی کرد وەك پشتگیرییەك لەبەهێزکردنی

دەسەلاتی سیاسی‌و کۆکردنەوەی لەدەستی پاشادا بەمەبەستی تۆکمەکردنی شان‌و شەوکەتی پاشاو یەکپارچەکردنی دەسەلاتی سیاسی[٤٧].

هەروەها تۆماس هۆبز ١٥٨٨-١٦٧٩ پشتگیریی کۆکردنەوەی دەسەلاتی لەدەستی پاشادا کرد ئەویش بەهۆی فەلسەفەی دو تیۆرییەکەی یاسای سروشتی‌و پەیمانی کۆمەلایەتی. هۆبز بەپێویستی زانی هەموان بەشێوەیەکی رەها گوێرایەلّی سەردارێتی بن بۆ کۆکردنەوەی دەسەلاتی دەولەت لەدەستی پاشاداو نەهێشتنی هیچ کەلەوەکێشی‌یەك بۆ وەرگرتنی دەسەلات لەلایەن کەنیسەو هەر لایەکی ترەوە[٤٨].

سەرباری هەمو ئەمانە، بزاڤەکانی ریفۆرمی ئاینی سەریان دەرهێنا کەئەوانەش تەواوکەری بۆچونەکانی میکیاڤللی بون سەبارەت بەرزگارکردنی سیاسەت لەئاین‌و لەم بارەیەوە بۆ جیابونەوەی دەولەت لەروی سیاسی‌و ئاینی‌یەوە بونە پشتیوان‌و داوایان کرد کەنیسە ملکەچی دەسەلاتی دەولەت بێ. پەیرەوانی ئەم بزاڤانە کەوتنە زیندوکردنەوەی بیرۆکە دێرینەکە کەدەیگوت خوا سەرچاوەی دەسەلاتی سیاسییەو هەر خاوەن دەسەلاتێك سێبەری خوایە لەزەویی خۆیدا. مەبەستیش ئەوە بوو کەئەم دەسەلاتە خوایی‌یە بخەنە بەر دەستی پاشاکانەوە بۆ بەهێزکردنی رژێمی پاشایەتی‌و جێگیرکردنی دەسەلاتەکانی چونکە پێیان وابو پاشاکان پارێزەری بزاڤە نوێکەی ئەوانن لەکۆششەکانیاندا بۆ روبەروبونەوەی مەزهەبی کاتۆلیك.

یەکێ لەگرنگترین هۆکارە ماددییەکان، پەیدابونی چینی بورژوازیی بازرگان بوو کە لەسەردەمی شەری خاچپەرستەکانەوە بەرە بەرە خەریکی دروستبون بوو. پەیدابونی ئەم چینە گرنگترین فاکتەر بوو لەبواری پێکەوەنانی دەولەتی نەتەوەییدا. ئەم چینە تازەیە ئەو هەموو باج‌و پیتاکەی بەدلّ نەبوو کەهەر دەرەبەگێك لەسنوری دەسەلاتی خۆیدا بەسەر بازرگانی‌و کالاکانی دەسەپاند. بۆیە ئەم چینە بوە هەلگری ئالای رزگارکردنی ولات لەو کۆت‌و زنجیرانەو خۆراپسکاندن لەدەسەلاتی میرو نەجیبزادەکان. لەبەرژەوەندیی ئەو چینەدا بوو کە حکومەتێکی ناوەندیی بەهێز پەیدا ببێ‌و دەسەلاتی دەرەبەگەکان لەناوخۆدا

برمێنێ و بازرگانیی دەرەکی بپارێزێ و مرۆڤ لەجەورو ستەمی کەنیسە رزگار بکات.

بەهەمان پێودانگ پاشایەتییەکانی زۆربەی دەوڵەتانی ئەوروپا لەسەر ئەو ریسایە دامەزران کەدەسەڵاتی رەهاو تەواوی مافەکانی سەردارێتی بۆ پاشا بن، ئەوەش بەسپاردنی هەمو دەسەڵاتەکان بەپاشاو لەم روەوە پاشا پەنای بردە بەر تیۆریی مافی خوایی و وتی گوایە لەخواوە مافی حوکمڕانیی پێ بڕاوەو گوایە تەنها لەبەردەم خوادا بەرپرسیارە. ئیدی سەردارێتی بەرگی پاشای کردە بەرو بیرۆکەی دەوڵەتی دارایی هاتەوە گۆڕێ کەدەوڵەتی بەموڵکی تایبەتی پاشا دەژمارد.

لەسەر ئەم بنەمایە سیستمی حوکمڕانیی دەوڵەت روخساری دەرەبەگانەی پێوە مایەوەو هەمو ئەو ماف و دەسەڵاتەی کەمیری دەرەبەگی سەردەمی ناوەڕاست هەیبو، بۆ پاشا مایەوەو ئەم هەلومەرجە بەو جۆرە درێژەی کێشا تا لەسەدەی دوانزەهەمدا دەوڵەتی لیبڕال سەری دەرهێنا[49].

بەڵام سەرەڕای بانگەواز بۆ حوکمڕانیی رەهاو دانی هەمو دەسەڵاتەکان بەپاشا، کەسانێك هەبون داوایان دەکرد ئەرکە جیا جیاکانی دەوڵەت لێك جوێ بکرێنەوە. لەم بارەیەوە فەیلەسوف جان بودان سەرباری ئەو روخسارانەی کە بەسەر سەردارێتیی دادابوو، بەڵام لەهەمان کاتدا داوای دەکرد ئەرکی داوەری نەخرێتە بەر دەستی پاشا ئەویش لەبەر دوو هۆ[50]:

یەکەم- لەبەر سروشتی ئەرکی داوەری چونکە بودان ئەوەندە ئەم ئەرکەی بەگرنگ دەزانی کەدەیویست دەستەیەکی سەربەخۆ بیگرێتە ئەستۆو لەم بارەیەوە پێی وابوو ئەگەر پاشا هەم یاسا دانەرو هەم دادوەر بێ، ئەوا بڕیاری بێ بەزەییانە دەردەکا.

دووەم- لەبەر ئەوەی نەیدەویست پاشا بەگرفت و ململانێی رۆژانەی نێوان تاکەکانەوە خەریك بێ بەڵکو دەبێ بەتەواوی خۆی بۆکاروباری گشتی تەرخان بکات.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە لەکاتێکدا حوکمڕانیی پاشایەتیی رەها لەزۆربەی دەوڵەتانی ئەورووپادا لەسەر کار بوو، لەئنگەلتەرە ماوەیەك بوو بیری دیموکراتی سەری دەرهێنابوو. لەوێ ململانێیەکی دوورودرێژو دژوار لەئارادا بوو لەنێوان پاشاکانی بنەماڵەی ستیوەرت لەلایەك و لایەنگرانی رژێمی پەرلەمانی بەسەرۆکایەتیی نەجیبزادەو بورژوازییەکان. لەئاکامی ئەم ململانێیەدا دەستکەوتی گرنگ بەدەست هێنراو پاشاکان ناچار کران وردە وردە دان بەماف و ئازادییەکاندا بنێن لەشۆڕشی قەشەو بارۆنەکانەوە لەدژی جان سان تیر لەسەدەی سیانزەهەمدا کەگەیشتە رادەی دەرکردنی دیکۆمێنتی ماگنا چارتا لەساڵی ١٢١٥دا کەتێیدا پاشا رازی بوو چیتر دەست وەرنەداتە کاروباری کەنیسەو مافە دەرەبەگییەکانی بۆ دەستنیشان بکرێ. جگە لەوە رازی بوو کەتەنها پاش رەزامەندبونی ئەنجومەنی گەورە یاسا دەرکاو باجی تر بسەپێنێ. ساڵی ١٢٥٤ ئەنجومەنی گەورە پەرەی سەندو بوە پەرلەمانێك بۆ نوێنەرایەتی کردنی هەموو چینەکانی گەلی ئنگلیز ئەویش لەبەر ئەوەی هنریی سێیەم لەبەر پێویستیی بەباجی تر ناچار بوو لەهەر ناوچەیەك دو شۆڕەسواری هەڵبژێردراوو پاشان لەهەر شارێك دو شۆڕەسواری هەڵبژێردراو بۆ ئەنجومەن بانگ بکات[51].

ساڵی ١٦٠٣ کاتێك پاشاکانی بنەماڵەی ستیوەرت ویستیان بەگژ رەهەندی پەرەسەندنی مێژوییدا بچنەوەو هەڵبکوتنە سەر ماگنا چارتا، دوچاری چەندان پێکدادانی سیاسیی و سوپایی بونەوە کەدەورووبەری نیو سەدەی خایاندو لەکۆتاییشدا لەساڵی ١٦٤٨ دا بەروخانی رژێمی پاشایەتیی و راگەیاندنی کۆمار بەسەرۆکایەتیی کرۆمۆیل دوایی هات. کرۆمۆیل بۆ یەکەم جار جۆرە لێك جیاکردنەوەیەکی دەسەڵاتەکانی داهێناو ئەم پرنسیپە لەدەستوری کۆمارەکەیدا جێگیر کردو هەر سێ دەسەڵاتی یاسادانان و راپەڕاندن و داوەریی لێك جیا کردەوە. بەڵام ئەم دەستپێشخەرییە پاش روخانی کۆمارو هاتنەوە سەرکاری رژێمی پاشایەتی لەئنگلتەرە لەساڵی ١٦٥٨ زیندە بەچاڵ کرا[52]. بەڵام لەبەر پێداگرتن لەسەر تیۆریی مافی خوایی، شۆڕشێکی تر لەدژی جیمسی دووەم هەڵگیرسا. پاش راکردنی جیمسی دووەم، ولیەم ئۆرانج لەسەر بنچینەی

پەیماننامەی مافەکان Bill of rights دەسەڵاتی گرتە دەست. پەیماننامەکە لە١٣ی شوباتی ١٦٨٨دا دەرچو، پەرلەمان پەسندی کردو پاشاش پێی رازی بو. بەپێی پەیماننامەکە لەئنگلتەرە پاشایەتیی رەها بنەبڕ کراو پاشایەتیی دەستوریی پشت بەستو بەلێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان دەستی پێ کرد. پاشان مەسەلەکە بەوە گەیشت کەپەرلەمان لەبری گەل بوە خاوەنی دەسەڵاتی یاسادانان و ئەرکی راپەراندن و دەرکردنی چارتەر، بەو جۆرەی کە لەگەڵ یاساکاندا بگونجێ، بۆ پاشا هێڵدرایەوە.

## دەوڵەت لەسەردەمی تازەدا

### لقی یەکەم: دەوڵەتی لیبرال

لەسەردەمی رێنیسانسدا لەزۆربەی هەرە زۆری ئەوروپادا پاشایەتیی رەها سەری دەرهێنا کەزۆربەی مۆرکی دەرەبەگانەی پێوە دیار بوو و ئەم رژێمانە هەلومەرجێکی سیاسیی پڕ زوڵم و زۆریان پێك هێناو زۆرینەی تاکەکان ئاسایش و ئازادییان لەدەستدا، جگە لەوەی کەژیانێکی کولەمەرگیان دەبردە سەر.

بۆیە ئەو هێزو گروپانەی کە لەسەرەتادا یارمەتیی پاشایان دا چونکە پێیان وابو پاشا هێمای یەکبون و سەرکەوتنە، زۆری نەبرد هەستیان بەستەمی دەوڵەت کردو کەوتنە کۆشش بۆ سەندنەوەی ماف و ئازادییان و بەرپەرچدانەوەی رژێمی حوکمڕانیی رەها[٥٣] و لەم سۆنگەیەوە ململانێی لەدژی رژێمە تازەکە دەستی پێ کردەوە.

هەر بۆ نمونە چینی بورژوازیی بازرگان کەپشتیوانیی لەپاشا کردبوو و دژایەتیی دەرەبەگی کردبوو بۆ هێنانە دیی دەوڵەتی نەتەوەیی، مافە سیاسییەکانی خۆی پێ نەهاتە دی و بۆی نەلوا کاریگەرانە بەشداری لەکاروباری حوکمڕانیدا بکا، سەرباری کرێکاران و جوتیارە هەژارەکان کەبەتەمای ژیانێکی خۆشتر بون.

سەرەڕای پەیدابونی دەوڵەتی یەکگرتوو، میرە دەرەبەگەکان توانییان هەمو بەرژەوەندییە کۆنەکانی خۆیان بپارێزن و تەنانەت چەندین بەڵێن و پەیمانیان

لەپاشاکان وەرگرت کەمافە دەرەبەگییەکانیان پێ پاراست ئەویش لەپای سەردانەواندن بۆ دەسەڵاتە سیاسییە یەکگرتووەکەو پابەندبون بەپێشکەش کردنی کۆمەکی سوپاییو دارایی بۆ ئەو دەسەڵاتە.

بۆیە رژێمی پاشایەتیی دەوڵەتە تازەکە مۆرکێکی دەرەبەگانەی پێوە دیار بوو رپاشا هەمو ئەو مافانەی لەشانشینەکەی خۆیدا هەبو کەکاتی خۆی میرە دەرەبەگەکانی سەردەمی ناوەڕاست هەیانبو. هەر لەم سەروبەندەشدا لایەنگرانی ریفۆرمی ئاینیی پرۆتستانت کەلایەنگری پاشایەتی بونو خۆیان لەستەمی کەنیسەی کاسۆلیك پێ دەپاراست، لەساڵی ١٥٢٧دا پاش قەسابخانەکەی سانت بارتلمی کەوتنە هێرشی سەخت بۆ سەر پاشایەتی[٥٤].

لەم جەنجاڵەدا کۆمەڵە نوسینێك بلاّو کرانەوە کەمۆرکێکی پرۆتستانەیان پێوە دیار بوو و نوسەرەکانیان بە((نەیارانی پاشایەتی))خۆیان ناساندبوو، تیایدا بانگەشە بۆ بنچینە جەماوەرییەکەی دەسەڵات کراو هێرش کرایە سەر تیۆریی مافی خوایی پاشاکان[٥٥]. پاشان تیۆریو بۆچونی فەلسەفیو فیکریی دژ بەتیۆرییە نا ئەخلاقییەکانی میکیاڤیللیو جان بودان دەربارەی دەسەڵاتی رەهای پاشاکانو دژ بەبۆچونەکانی تۆماس هۆبز لەمەڕ حوکمڕانیی رەهاو دژ بەبیروڕاکانی بوسیە لەبواری تیۆریی مافی خوایی پیرۆزی دەسەڵات، باویان سەندوکەوتنە ئافەروزکردنی حوکمڕانیی رەهاو رەت کردنەوەی مافی دەسەڵاتدارێتیی پاشاکانو بانگەشەکردن بۆ سپاردنی سەردارێتی بەگەلو پێکەوەنانی حکومەتی پابەندکراو.

لەم روەوە سەرلەنوێ یاسای سروشتی تاوتوێ کرایەوە بەتایبەتی لەو لایەنەوە کەئەم یاسایە جەخت لەسەر سەلماندنی ئازادیی تاك لەڕوی ئابوریو مەعنەویو سیاسییەوە دەکا. بۆفندرۆف[٥٦](١٦٣٢-١٦٩٤) لەم روەوە لەسەر ئەو باوەڕە بوو کەبنچینەی گروپی مۆدێرن لەپەیمان دایەو لەم بوارەدا تاکەکان رازی دەبن پێکەوە لەسایەی یەك دەسەڵاتدا بژین کەمشوری دابین کردنی ئاسایشو بەرژەوەندیی گشتی دەخوا[٥٧]. ئیدی رێبازی ئازادیی تاك سەری دەرهێناو جەختی لەسەر جیابونەوەی کۆمەڵ لەدەوڵەت کرد. ئەمەش دو مانای هەبو: لەلایەك

بەمانای سەلماندنی ئازادییەکانی تـاك دەهـات‌و لەلایـەکی تـرەوە بـەمانای ئـەوە دەهـات کەدەسـەڵاتی گشتی بێلایـەن بـێ‌و ئـەوەندەی لـەتواناداا بـێ هـەڵی دەستێوەردانی دەوڵـەت کـەم بکرێتـەوە بەرادەیـەك کەدەوڵـەت تەنـها ببـێ بەپاسەوان[58].

جگە لەوە هەمدیسان تیۆرییـەکانی دەسـەڵاتی گـەل‌و پـەیمانی کۆمەڵایـەتی سەریان دەرهێنایەوەو بەپێی ئەندێشە تازەکە بانگەواز بۆ ئـازادیی سیاسـی بـڵاو کرایەوەو وا تەماشای دەوڵەت کرا کـەدەبێ پشـت ئەسـتور بـێ بـەئیرادەی گـەل‌و مـافی لەبەشداری کردن لەدەسەڵاتداو لـەم رووەوە بـۆ سـپاردنی سـەروەری بەگـەل هانا بۆ بەکارهێنانی بیرۆکەی پەیمانی کۆمەڵایەتی برا.

یەکەم کەس کەبیرۆکەی پەیمانی کۆمەڵایەتیی بۆ دروستکردنی حکومەتێکی پابەند بەکارهێنا فەیلەسوفی ئینگلیز جۆن لوك(١٦٣٢-١٧٠٤) بـوو کـەداوای کـرد دەسـەڵات لەدەوڵـەتدا دابـەش بکـرێ بـۆ ئـەوەی دەسـەڵاتی پاشـاکان لاواز بکـرێ‌و بەپێویسـتی زانـی دەسـەڵاتی یاسـادانان لەپاشـاکان بسـەنرێتەوەو بەدەزگایەکی سەربەخۆ بسـپێردرێ‌و بەئاشـکرا دەسـەڵاتە جیاجیاکـانی دەوڵـەتی لێـك جوێ کـردەوەو بـۆ دەسـتەبەرکردنی پێکـەوەنانی حکومـەتی پابـەند بـۆ پاراسـتنی مـاف‌و ئازادییـەکانی تاکـەکان داوای لێـك جیاکردنـەوەی هـەردو دەسەڵاتی یاسادانان‌و راپەڕاندنی کرد[59].

پاشـان جـان جـاك رۆسـۆ پـەیدا بـوو کـەمۆرکێکی تـری بـەتیۆریی پـەیمانی کۆمەڵایـەتی داو وای بـۆ چـوو کەتاکـەکان دەسـتبەرداری مـاف‌و دەسـەڵاتە سروشتییەکانی خۆیان بون‌و ئەو ماف‌و دەسـەڵاتانەیان بەبونـەوەرێکی بەکۆمـەڵ سپاردو لەئاکامی دەستبەرداربونی ئەم هەموو ئیرادەیە ئەو شتە پێك هات کەپێی دەگوترێ(ئیرادەی گشتی). ئەم ئیرادە گشـتییە بـەلای رۆسـۆوە هاوجوتـە لەگـەڵ سەردارێتی‌داو لەراستیدا سەردارێتی بەلای رۆسۆوە تەنها پـەیڕەوکردنی ئـیرادەی گشتییەو ئەو ئیرادەیە گشتییە لەسەرجەم ئیرادەی تاکەکان پێك دێ‌و بۆ سـەرجەم تاکـەکانی گـەل دەگەڕێتـەوە نـەك بـۆ کەسـێك یـاخود دەزگایـەکی سـەردارێتی دەوڵـەت. کورتییەکـەی: رۆسـۆ تیۆریـی پـەیمانی کۆمەڵایـەتیی بەشـێوەیەکی

زیرەکانە بۆ لێ سەندنەوەی مافی سەردارێتیی پاشاکان بەکارهێناو داوای کرد ئەو مافی سەردارێتییە تەنها بەگەل بسپێردرێ[٦٠].

تیۆرییەکانی دەسەڵاتی گەلو پەیمانی کۆمەڵایەتیو رێبازی ئازاد بەبیروباوەڕی فەیلەسوفی فەرەنسی مۆنتسکیو(١٦٨٩-١٧٥٥) بەستراونەتەوە. مۆنتسکیو تیۆریی لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی لەلۆك وەرگرتو دەستی بەپەرەپێدانی ئەم تیۆرییە کردو کردی بەتیۆرییەکی تەواو بۆ هێنانە کایەی حکومەتی پابەند.

ئەم تیۆرییانە رۆڵێکی زۆریان هەبو لەگەشەپێدانی هۆشیاریو هەروەها لەزیادکردنی سەروەتو سامان کە بەهۆی پەرەسەندنی بازرگانیو چالاکیی بازرگانییەوە تا دەهات زیاتر نەشونمای دەکرد. هەروەها ئەم تیۆریو فاکتەرانە وەك سوتەمەنی وابون بۆ ئەو بزاڤە شۆڕشگێڕانەی کە ساڵی ١٦٨٨ لەدژی حوکمڕانیی بنەماڵەی ستیوەرت لەئنگلتەرە دەستیان پێ کردو گەیشتن بەراگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمریکا لە٥ی حوزەیرانی ١٧٧٦و پاشان هەڵگیرسانی شۆڕشە مەزنەکەی فەرەنسا، ئیدی ئەم بزاڤانە سەرتاسەری ئەوروپاو دەوڵەتانی جیهانیان تەنییەوە. دوا بەدوای ئەم بزاڤانە دەوڵەتی برال دامەزرا کەئەم تایبەتمەندییانەی هەبوو[٦١]:

١-تاکگەرایی: لبرالیزم باوەڕی بەتاکگەرایی هەیەو پێی وایە دەوڵەت بۆ خزمەت کردنی تاك هاتۆتە ئاراوەو ئەو تاکەش بەر لەوەی دەوڵەت پەیدا ببێ مافی تایبەتی خۆی هەبوە. بۆیە پێویستە لەسەر دەوڵەت ئەو مافانە بپارێزێ چونکە ئەو مافانە ئامانجی هاتنە کایەی دەوڵەت بون. راگەیاندنی مافەکان لەئەمریکا لەتەموزی ساڵی ١٧٧٦دا وای دانا کە(حکومەتەکان تەنها بۆ یەك مەبەست دادەمەزرێن ئەویش پاراستنی مافە سروشتییەکانی مرۆڤە بەجۆرێك کەئەگەر حکومەت رێزی لەو مەبەستە نەگرت، گەل بۆی هەیە سەرپێچی بکاو ئەو حکومەتە هەڵبوەشێنێتەوە)).

٢-ئازادی[٦٢]: لیبرالیزم باوەڕی بەئازادییە سیاسیو مەدەنیو ئابوورییەکانەو ئەو مافو ئازادییانە وا دادەنێ کەسنوورێکی پارێزراون کەدەوڵەت بەهیچ شێوەیەك بۆی نیە بیبەزێنێ. دەستوری ساڵی ١٧٩١ی فەرەنسا وای دانا کە((دەسەڵاتی یاسادانان ناتوانێ یاسای وا دابنێ کە بەهۆیەوە دەستدرێژی بکاتە سەر ئەو مافو ئازادییە گشتییانەی کەئەم دەستورە دەستەبەریان دەکا یاخود تەگەرە بخاتە بەردەم پەیڕەوکردنی ئەو مافو ئازادییانە)).

٣-یەکسانی: دەوڵەتی لیبرال یەکسانی رادەگەیەنێ بەلام یەکسانی بەلایەوە یەکسانی یاسایی ئابستراکتە، واتە بریتییە لەراگەیاندنی پرنسیپی یەکسانیی دەرفەت نەك یەکسانیی راستەقینە.

٤-سەروەرێتیی گەل: یەکێك لەخەسڵەتەکانی دەوڵەتی لیبرال باوەڕە بەسەروەرێتیی گەلو ئافەرۆزکردنی شێوەکانی حوکمڕانیی راستەوخۆو نا راستەوخۆو پیادەکردنی سیستمی حوکمڕانیی پەرلەمانی. لەم بارەیەوە راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤو هاوولاتیی فەرەنسا لەخاڵی سێدا وتویەتی((تەواوی سەروەرێتی لەبنەڕەتدا بۆ گەلە. هیچ دەزگایەك یان کەسێك بۆی نیە ببێ رەزامەندیی گەل پەیڕەو لەهیچ دەسەلاتێك بکا)).

٥-سیستمی سیاسیی پابەند[٦٣]: دەوڵەتی لیبرال پەیڕەوی لەم سیستمە دەکا. بواری چالاکیی دەوڵەت پابەندە بەئازادییە گشتییەکانی تاکەکان، جگە لەوەی کەدەوڵەت دەست وەرناداتە کاروباری ئابووریو بۆ چالاکیی تایبەتی دەهێڵێتەوە. ئیدی ئەرکی دەوڵەت لەوەدایە کەپارێزگاریی لەئاسایشی ناوخۆو دەرەوە بکات.

٦-پرنسیپی لێك جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان[٦٤]: یەکێ لەگرنگترین تایبەتمەندییەکانی لیبرالیزم پرنسیپی لێك جیاکردنەوەی دەسەلاتەکانە. لەم رووەوە سیستمی دەستوریی دەوڵەت لەسەر دو تەوەری بنچینەیی دەگیرسێتەوە کەبریتین لە: پەرلەمانی هەڵبژێردراوو حکومەت. لەم رووەوە سیستمی دەستوریی ئەم دو تەوەرە لێك جیا دەکاتەوە.

جگە لەوە تەوەرێکی سێیەمیش هەیە کەدەسەلاتی داوەرییە. ئەم دەسەلاتە چاودێریی کارو کردەوەکانی دەسەلاتی یاسادانان(پەرلەمان) و کارو کردەوەکانی

دەسەڵاتی راپەڕاندن(حکومەت) دەکات تاکو هیچ کامێکیان یاخود هەردوکیان سنوری دەسەڵاتەکانی خۆیان نەبەزێنن. لەم روەوە راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤو هاوڵاتیی فەرەنسا لەخاڵی یەکەمیدا وتویەتی((هەر دەزگایەکی کۆمەڵایەتی گرەنتی بۆ مافەکان دانەنێتو دەسەڵاتەکان لێك جیا نەکاتەوە، دەزگایەکی بێ دەستورە)).

## لقی دووەم: دەوڵەتی سۆسیالیست

دەوڵەتی لیبراڵ- وەك رونمان کردەوە- لەسەر بنەمای تاکگەرایی دامەزرا. ئەم رێبازەش مرۆڤ پیرۆز رادەگرێو بەهایەکی خۆییی پێ دەبەخشێو تاك دەکاتە بنچینەو ئامانجی سیستمی بەکۆمەڵ، جگە لەوەی کەئەم رێبازە تەنها لەچوارچێوەیەکی تەسکدا رێ بەوە دەدا کەدەوڵەت دەست لەکاروباری تاکەکان وەر بدات. دەوڵەت بەلای ئەم رێبازەوە لەزیان بەولاوە هیچی تر نیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێکی پێویستە، بۆیە دەسەڵاتی دەوڵەتو بواری دەستوەردانی لەکاروباری تاکەکان ئەوەندەی لەتوانادا بێ، دەبێ سنوری بۆ دیاری بکرێ.

بەهۆی ئەم رێبازەوە مرۆڤ بەو پێیەی کەمرۆڤە مافو ئازادیو یەکسانیی لەبەردەم یاسادا بۆ دیاری کراو ئەو مافانە وا دانران کەوەك ئەو ناوچانە وان کەقەدەغەیە دەوڵەت توخنیان بکەوێ. واتە داننان بەمافو ئازادییە سروشتییەکانی مرۆڤدا دەوڵەتی بەوە پابەند کرد کەنابێ هیچ دەستوەردانێك بنوێنێ بەڵکو دەبێ هەلی یەکسانی بۆ هەموان مسۆگەر بکات بەبێ ئەوەی بایەخ بەشتی زیاتر بدات، واتە بەبێ ئەوەی پابەند بێ بەدابین کردنی هەلومەرجی کۆمەڵایەتیو پێشکەشکردنی خزمەت بۆ پەیڕەوکردنی مافو ئازادییەکان[٦٥].

بەڵام ئەم ناساندنەی ئازادیو یەکسانیی یاساییی تاکەکان بەکردەوە بەو ئاکامە گەیشت کەیەکسانی پێك نەیەت ئەویش لەبەر جیاوازیی نێوان تاکەکان لەرووی کارامەییو بەهرەی سروشتیو هێزی جەستەییو فیکرییەوەو هەروەها لەبەر ئەوەی کەکاتێك هەموان وەك یەکتریو بەیەکسانی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ، ئەو هەلە بۆ بەهرەمەندەکانیان دەرەخسێ کەهیچ ئاسەوارێکی یەکسانی نەهێڵن، بۆیە جیاوازی لەنێوان تاکەکاندا پەیدا دەبێو بەهۆی سیستمی میراتەوە

ئەدەبێتە هۆی سەردەرهێنانی رژێمــی چینایــەتی، کــەلێن‌و کەلەبــەری نێوانیــان سەرفراوان دەبێ[٦٦].

هەموی دەوروبەری پەنجا ســاڵ بــوو یەکــەم دەوڵــەتی لــیبرال لەجیــهاندا ســەری دەرهێنا، واتە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە، کاتێك دوو چینی ناکۆك‌و دژ بەیەکتری سەریان دەرهێنا کــەبریتی بــون لــەچینی ســەرمایەدارەکانی خــاوەن هۆکانی بەرهەم هێنان‌و چینی کرێکاران کەبێجگە لەهێزی بازوو هیــچ شــتێکی تریان نیەو لەسەر فرۆشتنی کار بەچینی یەکەم دەژین.

پەیدابونی داهێنان لەبواری پیشەسازی‌و لەسەرەنجامدا پێشــکەوتنی هۆکــانی هونەری بەرهەم هێنان‌و بەکارهێنانی ئامێر لەباتی دەستی کرێکار، بەدوو ئاکام گەیشت:

١-لەلایەك داهێنانەکان بونە هۆی ئەنجامدانی پرۆژەی گەورەو دروســتکردنی کارگەی گەورە تا ئــەو رادەیــەی کەســەرمایە لەپیشەســازیدا خرایــە گــەڕو چینــی سەرمایەدارە پیشەکارە پارەدارەکان سەری دەرهێنا.

٢-لەلایــەکی تــرەوە بونــە هــۆی گردبونــەوەی کرێکارەکــان لەشــارەکانداو بلاوبونەوەی بێکاری لەنێویانداو ئەم بێکارییە بــوە هــۆی هەڵگیرســانی شۆڕشــی ١٨٤٨ لەفەرەنساو ئەو شۆڕشە کرێکارەکان سوتەمەنی‌یەکەی بون[٦٧].

لەســایەی ئــەو هەلومەرجەدا سۆســیالیزمی زانســتی لەســەر دەســتی کــارل مارکس سەری دەرهێنا. مارکس هەستی بەنایەکسانیی ئابوریی کردو لەئاکامدا هەستی بەو نایەکسانی‌یە کرد کــەخۆی لەهەلومــەرجی کۆمەڵایــەتی‌و هــەژاری‌و ژیانی کولەمەرگی کرێکاراندا دەنوانــد بەتایبــەتی کــەکرێکاران زۆرینــەی هــەرە زۆری خەڵکی شارەکانیان پێکدەهێنا، ئیدی مــارکس لــەو گۆشــە نیگایــەوە وای دانا مێژووی کۆمەڵی مرۆڤایەتی بریتی‌یە لەمێژووی ئــابوری‌و میــژووی هێزەکــانی بەرهەم هێنان‌و ململانێ لەپێناوی خاوەنێتی‌ی ئامرازەکانی بەرهەم هێنــان‌و وای بــۆ چــو کــەمێژووی خــودی مرۆڤایــەتی بریتی‌یــە لــەمێژووی خــودی چەوســانەوەو ململانێی چینەکان[٦٨].

مــارکس وای دەبینـــی کەئازادییـــە سیاســـییەکان، ئەوانــەی کـــەبورژوازی رایاندەگەیەنێ، تەنـها بەروکـەش ئـازادین دەنـا پـەیڕەوکردنیان دەوەسـتێتە سـەر چەندەها هۆ کەدەوڵەتی لیبرال لێی رانابینرێ کەبتوانێ پێشکەشـیان بکـات وەك دەوڵەمەندیو بـاری کۆمەڵایـەتیو وای دانـا کەئـەو ئازادییانـە بـەکردەوە تەنـها خودی چینی بورژوازی خێریان لێ دەبینێ چونکە مافو ئازادییە راسـتەقینەکان بەلای مارکسـەوە ئـەو مـافو ئازادیـیـەن کەسیسـتمێکی کۆمەڵایـەتیو ئـابوری دابینیان دەکاتو ئیدی ئەو سیستمە کۆمەڵایەتیو ئابورییە دەتوانێ ژینگەیەکی لەبار بۆ ئازادی فەراهەم بکات[69]. لەم دیدەوە رێبازی مارکسـیزم وای بـۆ دەچـێ کـەمافو ئازادییـــە راســتەقینەکان تەنـــها بـــەرزگارکردنی مـــرۆڤ، ئـــەویش بەنەهێشتنی سەرچاوەی راستەقینەی چەوسـانەوە، دەسـتەبەر دەکرێـنو هـەر لـەم رووەشەوە کۆکردنەوەی رژێمی دەوڵەتو ئازادییەکان کـارێکی مەحاڵـەو ئـازادی لەسایەی دەزگای دەوڵەتدا پەیدا نابێ چونکـە دەوڵـەت بـەقازانجی کەمینەیـەکی بچوك خۆی بەسەر زۆرینەی هەرە زۆری خەڵکیدا دەسەپێنێ[70].

کەواتـە پێویسـتە خـاوەنێتیی تایبـەتی هۆکـانی بەرهـەم هێنـان رابماڵدرێ ئەویش لەرێی سەرلەنوێ دابەش کردنەوەی سامانو دروست کردنـی کۆمـەڵێکی کۆمۆنیستی بێ چینەوە، تەنها ئەوسا مرۆڤ تـەواوی مافـەکانی خـۆی بەدەسـت دەهێنێ چونکە نە دەوڵەت دەمێنێو نە کەس پێویستی بەدەوڵەت دەبێ چونکـە دەوڵەت بەو پێیەی کـەئامرازی دەسـتی چینـی چەوسـێنەرە هیـچ پاکانەیـەك بـۆ مانەوەی نامێنێ ئەویش لەو سۆنگەیەوە کەئەو هۆیانەی بونە مایـەی پـەیدابونی دەوڵەت لەناو دەچنو نامێنن[71].

بـەلام دامـەزراندنی کۆمـەڵی کۆمۆنیسـت یـاخود گواسـتنەوە لەکۆمـەڵی چینایەتییەوە بۆ کۆمـەڵی ناچینایـەتی بەیـەك کـەرەت نایەتـە دی بـەلکو بـەدو قۆناغی مێژوییدا رەت دەبێ یەکێکیان قۆناغی دکتاتۆریای پرۆلیتاریایەو ئەوی تر قۆناغی کۆمۆنیزمە.

ئەگـەرچی بـەلای مارکسـیزمەوە گواسـتنەوەی مرۆڤایـەتی بـۆ قۆنـاغی کۆمۆنـیزم قۆنـاغێکی سروشـتییەو بـەهۆی یاسـای پەرەسـەندنی سروشـتییەوە

لەئەنجامی ململانێی نێوان هەردو چینی سەرمایەدارو کرێکاراندا دێتە دی بەڵام مارکسیزم پێی وایە چینی بورژوازی بەسانایی دەستبەرداری بەرژەوەندییەکانی خۆی نابێ‌و هەروەها نابێ چینی کرێکار دەستەوسان بوەستێ بەڵکو پێویستە لەسەری کاری خۆی ئەنجام بداو پەلە لەپرۆسەی پەرەسەندنی مێژودا بکا، ئەویش بەگرتنی دامودەزگای دەوڵەت لەرێی زەبروزەنگ‌و شۆڕشەوەو دەستپێکردنی قوناغی دکتاتۆریای پرۆلیتاریا کە لەبیری مارکسیزمدا یەکێکە لەقۆناغە مێژوییەکانی پەرەسەندن‌و وەك پردێك وایە بۆ گواستنەوە لەکۆمەڵی سەرمایەداری فرە چینەوە بۆ کۆمەڵی کۆمۆنیستی بێ چین.

ئەمەش بەوە دێتە دی کە چینی کرێکارو پێشەنگە شۆڕشگێڕەکەی(پرۆلیتاریا) لەرێی شۆڕشەوە دەست بەسەر دەوڵەتدا بگرێ‌و بکەوێتە کار بۆ سەرلەبەر دابەشکردنەوەی سامان‌و خۆماڵی کردنی هۆکانی بەرهەم هێنان‌و بەرە بەرە ریشەکێش کردنی پاشماوەکانی رژێمی بورژوازیی سەرمایەدارو رێ خۆش کردن بۆ هێنانە دیی کۆمەڵی کۆمۆنیست لەسەرتاسەری جیهانداو سەرکوت کردنی بزاڤەکانی دژی شۆڕشی پرۆلیتاریا ئەویش بەوردوخاشکردنی بەرهەڵستیی زەویداران‌و سەرمایەداران‌و کارکردن بۆ سەرلەنوێ دارشتنەوەی رێکخستنی سیاسی‌و ئابوریی دەوڵەت.

دەوڵەتی دکتاتۆریای پرۆلیتاریا کەپێویستە لەو قۆناغەدا بێتە سەرکار لەدیدی مارکسیزمەوە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ دەوڵەتی لیبرالدا نیە لەو روانگەیەوە کەئامرازێکی داپلۆسینە بەدەست چینی سەردەست بەڵام بەوە لەشێوەکانی پێشوی دەوڵەت جیا دەکرێتەوە کەئەوانەی پێشو هەر هەمویان دکتاتۆریای کەمینە بون لەدژی زۆرینە، لەکاتێکدا دەوڵەتی دکتاتۆریای پرۆلیتاریا دکتاتۆریای زۆرینەی چەوساوەیە لەدژی کەمینەی بورژوازی، بۆیە ئەم دکتاتۆریایە بەلای مارکسیزمەوە بەناوەرۆك دیموکراسییە. بەڵام لەنێوان دیموکراسیی رۆژئاوایی‌و لەنێوان ئەوەی مارکسیزم ناوی ناوە دیموکراسی جیاوازییەکی زۆر هەیە چونکە لەدیموکراسیی رۆژئاواییدا مافی کەمینە پێشێل

ناکرێ کەچی لەدەوڵەتی پرۆلیتاریادا رێ بەئۆپۆزیسیۆن نادرێو دان بەهیچ مافێك بۆ کەمینە نانرێو تەنانەت دان بەبونی کەمینەدا نانرێ.

دەوڵەتی پرۆلیتاریا چەند بنەماو بنچینەیەکی سەرەکیی هەیە کەگرنگترینیان ئەمانەن:

١-کۆمەڵگەرایی[٧٢] : سۆسیالیزمی مارکسیستی وەك بیروباوەڕێکی کۆمەڵگەرا وای دەبینێ کەبەرژەوەندیی گشتی لەسەروی بەرژەوەندیی تاکەوەیەو تاك مافی سروشتیی جێگیری نیەو بونێکی سەربەخۆشی لەدەرەوەی کۆمەڵدا نیە بەڵکو تەنها شانەیەکە لەکۆمەڵدا. بەکورتیەکەی، تاك ئامانجی کۆمەڵ نیە بەڵکو کۆمەڵ دیاردە بنەڕەتییە سروشتییەکەیە.

٢-ئازادی: لەدەوڵەتی سۆسیالیستدا تەنها ئەوەندە مافو ئازادی بۆ تاك سەلمێنراوە کەکار نەکاتە سەر ئامانجەکانی کۆمەڵو لەم روەوە پرۆپاگەندەی ئەوە دەکرا کەمافو ئازادییە لیبرالییەکان شتی روکەشن و ئازادیی راستەقینە تەنها بە نەهێشتنی ململانێی چینایەتیو خاوەنێتیی تایبەتو دروستکردنی کۆمەڵێکی کۆمۆنیستی بێ چین دێتە دی چونکە لەو کۆمەڵەدا مرۆڤ لەهەمو چەشنە زۆرو چەوسانەوەیەك رزگاری دەبێ[٧٣]. کۆبەندی ئەوەی مارکسیزم بانگەشەی بۆ دەکا ئەوەیە کەمەحاڵە دەوڵەتو ئازادی پێکەوە کۆ ببنەوە.

٣-یەکسانی: دەوڵەتی سۆسیالیست دەیگوت یەکسانیی روت یاخود یەکسانی لەبەردەم یاسادا کەلیبرالیزم بانگەشەی بۆ دەکا یەکسانییەکی وەهمیەو مایەی هێنانەدیی نایەکسانییە، گوایە یەکسانیی راستەقینەش تەنها بەسەرلەنوێ دابەشکردنەوەی سامانو پێکەوەنانی کۆمۆنیزم دێتە دی[٧٤].

٤-سەرداریێتیی گەل: دەوڵەتی سۆسیالیست پەیرەوی لەپرنسیپی سەرداریێتیی گەل دەکا بەلاّم گەل بەلای کۆمۆنیزمەوە لەسەرەتای دامەزراندنی دکتاتۆریای پرۆلیتاریادا تەنها چینی کرێکاران دەگرێتەوە بەلاّم بەلەناوبردنی شێنەیی چینەکانو نەهێشتنی جیاوازییە چینایەتییەکان چەمکی گەل بەرفراوان دەبێو تەواوی گەل دەگرێتەوەو لەم روەوە بەپێی بەندی یەکی دەستوری ساڵی ١٩٣٦ی یەکێتیی سۆڤێت ((یەکێتیی کۆمارە سۆسیالیستە سۆڤێتەکان

دەوڵەتی کرێکاران‌و جوتیارانــە))[٧٥] کـەچی لەدەسـتوری سـاڵی ١٩٧٧دا خـاڵی دووەم وتویەتی((تەواوی دەسەڵات لەیەکێتیی سۆڤێتدا بۆ گەلـە. گـەل بـەهۆی ئەنجومـەنەکانی نوێنەرانی گەلەوە پەیڕەوی لەدەسەڵات دەکا)).

بەلای کۆمۆنیزمەوە، پیادەکردنی پرنسیپی سەردارێتی‌ی گەل گونجاوە لەگەڵ حوکمڕانیـی راسـتەوخۆی گــەل بــەڵام بەناچارییــەوە دەچێتــە ســەر سیســتمی پەرلەمانی‌و لەم دۆخەدا پێکهاتەی دەستوریی دامودەزگاکانی دەوڵەت بەجۆرێك دادەمەزرێ کەگەل بتوانێ بەردەوام چـاودێریی نوێنــەرەکانی‌و هـەمو دەزگاکـانی دەوڵەت بکا بەڵام لـێرە نوێنـەرەکان ئـەو سـەربەخۆیی‌یەیان نیـە کـە لەدەوڵـەتی لیبرالدا هەیانە.

٥-سیســتمێکی سیاســیی رەهـــا: دەســـەڵاتی دەوڵـــەتی سۆسیالیســـت دەسەڵاتێکی رەهایەو شوێن نیە دەوڵەت نەتوانێ دەسـتی تێـوەردا، جگـە لـەوەی کەدەوڵەت ئەو لایەنەیە کەچالاکیی ئـابوری رێکدەخـاو دەسـت وەردەداتـە هـەمو بوارەکـانی ژیـانی ئـابوری وەك رێکخسـتنی بەرهـەم هێنـان، کـار ، بازرگـانی، سەرلەنوێ دابەشـکردنەوەی سـامان بەنەهێشـتنی خـاوەنێتی‌ی تایبـەت‌و کردنـی بەمولکی کۆمەڵ، سەرباری سەرپەرشتی کردنی کاروبـاری خوێنـدن‌و پـەروەردەو تەندروستیی گشتی‌و دابین کردنی کۆمەڵایەتی‌و هی تر.

کورتییەکەی، بواری چالاکیی دەوڵەت ئەوەندە بەرفراوانـە کەتـەواوی کۆمـەڵ دەگرێتەوەو کۆمەڵ‌و دەوڵەت لێك جیا ناکرێتەوە. دیارە ئەرکی کردنـی کۆمـەڵی فرە چین بەکۆمەڵێکی بێ چین‌و کۆمۆنیست ئەرکێکی دژوارەو بەئاسـانی‌و بـەبێ بەرپەرچدانەوەو خۆ لێ راپسکاندن‌و دژایەتی کردن نایەتــە دی، بۆیـە مەسـەلەکە پێویستی بەبونی دەسەڵاتێکی بەهێزو رەها هەیە[٧٦].

٦-لـەناکامی خـاڵی پێشـودا دەوڵـەتی سۆسیالیسـت دژی پرنسـیپی لێـك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانەو زیـاتر دەچێتـە سـەر پرنسیپی یـەکبونی دەسـەڵات چونکە دەوڵەتی سۆسیالیست دەوڵەتی یەك چینە کەچینی کرێکارانەو ئەم چینـە یەك ئیرادەی هەیەو دابەشبون‌و لێکترازان‌و پارچە پارچەبون ناناسـێ، لەبـەر ئـەوە دەسەڵاتەکەشـی یـەك دەسـەڵاتە، لـەکاتێکدا دەوڵـەتی لیبرال لەسـەر ناتـەبایی‌ی

کۆمەڵی سەرمایەداری دامەزراوە، بۆیە پرنسیپی لێک جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەو دەوڵەتەدا بۆ ئەوەیە کەهاوسەنگی لەنێوان هێزو چینە ناتەباکاندا دروست ببێو کۆت بخرێتە سەر دەسەڵاتی حوکمڕانەکان لەکاتێکدا لەدەوڵەتی سۆسیالیستدا پێویست ناکا هیچ کۆتێك بخرێتە سەر دەسەڵاتی حوکمڕانەکانو لەم رووەوە پێویست بەلێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان ناکا گوایە ئەم دەوڵەتە دەوڵەتێکی بێ ناکۆکیەو دان بەئۆپۆزیسیۆندا نانێو جگە لەیەکدەنگیی سیاسی کەزادەی یەکێتیی بیروباوەڕو یەکبونی حزبە بواری هیچ شتێکی تر نیە.

لەوەی باس کرا دەردەکەوێ کە لەهەمو سەردەمو قۆناغە مێژوویەکاندا تا دەگاتە سەدەی هەژدەهەم- هەندێ قۆناغی لێ دەرچێ- هیچ رێکخستنێکی دیاریکراو بۆ پیادەکردنی دەسەڵات لەدەوڵەتدا نەبوە چونکە دەسەڵاتی دەوڵەت تێکەڵ بەدەسەڵاتی فەرمانڕەوا دەبوو و ئەو فەرمانڕەوایە دەسەڵاتی بۆ خۆی قۆرخ کردبوو و سەری بۆ هیچ کۆتو بەندێك کەچ نەدەکرد. تەنانەت لەسەردەمی رێنیسانسیشدا مەسەلەکە هەر بەو جۆرە مایەوە ئەگەرچی لەو سەردەمەدا دەوڵەتی نەتەوەیی مۆدێرن سەری دەرهێناوەو ئەگەرچی لەو سەردەمەدا خاوەن دەسەڵاتو پیادەکەری دەسەڵات لێك جیا دەکرانەوەو لەنێوان حوکمڕانو دەسەڵاتی دەوڵەتیش جیاوازی هەبو، مەسەلەیەك کە هۆریۆ ناوی ناوە((دامەزراندنی دەسەڵات))[٧٧]، بەو مانایەی کەدەوڵەت خاوەنی دەسەڵاتی سیاسییەو حوکمڕان لەئامراز بەولاوە هیچی دی نیە چونکە جاران، بەپێی تیۆرییە تیوکراتییەکان دەسەڵاتێکی رەهای هەبو کە لەخودی خۆی یاخود لەسەروەتو سامانەکەیەوە سەرچاوەی دەگرتو هێزێکی ماددیی پێ پەیدا دەکردو لەم سۆنگەیەوە پاشایەتییە رەهاکان کە بەرگێکی پیرۆزیان لەخۆوە دەپێچا، زۆربەی هەرە زۆری دەوڵەتانی ئەوروپایان تەنییەوە.

بەڵام لەسەدەی هەژدەهەمداو لەئاکامی تازەکردنەوەی تیۆرییەکانی یاسای سروشتیو پەیمانی کۆمەلایەتیو سەردەرهێنانی تیۆرییە دیموکراتییەکاندا کەزیاد لەسێ سەد ساڵ بوو فەیلەسوفو بیریارەکان دەیانهۆنییەوە، دەست

ﻪﭘﺎﻛﺘﺎﻭﻛﺮﺩﻧﻰ ﺭﮊێمی پاشایەتیی رەها کراو سەردارێتیی گەل جێی ئەم جۆرە پاشایەتییانەی گرتەوەو دواتریش شۆڕشی دیموکراتی هەڵگیرسا کەبوە مایەی دامەزراندنی دەوڵەتی دیموکراتی مۆدێرن و لەئەنجام دا دو جۆری دەوڵەتی دیموکرات پەیدا بوو یەکێکیان دەوڵەتی دیموکراتی لیبرال بوو ئەوی تر دەوڵەتی دیموکراتی سۆسیالیست بوو ولەم سۆنگەیەوە شێوەی ڕێکخستنی دەسەڵاتی دەوڵەت دو دیمەنی بەخۆوە گرت:

دیمەنی لیبرال:کەپرنسیپە سەرەکییەکەی لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانە ئەویش بەدابەش کردنی دەسەڵاتی دەوڵەت بەسەر دەزگاکاندا بۆ ئەوەی هەر یەکێکیان بەسەر ئەوی تردا ببێ بەچاودێر بەمەبەستی هێنانە کایەی دەوڵەتی یاسا یاخود دەوڵەتی پابەند بەیاسا.

دیمەنی سۆسیالیست: کەپرنسیپە سەرەکییەکەی یەکبونی دەسەڵاتە ئەویش بەرێکخستنی کاروباری دەسەڵات لەسەر بنچینەیەکی ستونی، واتە بەچڕکردنەوەی تەواوی دەسەڵاتی دەوڵەت لەبەر دەستی ئەنجومەنێکی هەڵبژێردراو وەك بالاترین دەزگای دەوڵەت و پاشان سپاردنی دەسەڵات بەڕیزە دەزگایەکی یەك لەدوای یەك لەسەرەوە تا خوارەوە بەبێ ئەوەی هیچ کۆت و بەندێك لەسەر دەسەڵاتی ئەنجومەنە هەڵبژێردراوەکە هەبێ ئەویش لەبەر ئەوەی دەوڵەتی سۆسیالیست دەوڵەتێکی تۆتالیتارەو هیچ کۆت و بەندێك قبوڵ ناکات.

## سەرچاوەکان:

[1] الدكتور ثروت بدوي، النظم السياسية، الكتاب الاول، الطبعة الاولى، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٦١، ص١٩.
[2] بڕوانە: كرافتسوف، عرض موجز لنظريات الدولة والقانون، دار التقدم، موسكو، ١٩٦٨، ص١٣. هەروەها بڕوانە: الدكتور ادمون رباط، الوسيط في القانون الدستوري العام، الجزء الاول، الطبعة الثانية، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٦٨، ص ص ٢١-٢٢.
[3] الدكتور ثروت بدوي، المصدر السابق، ص٢١. هەروەها بڕوانە: الدكتور عبدالحميد متولي، الوجيز في النظريات والانظمة السياسية، ج١، الطبعة الثالثة، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٦٤، ١٢٨.
٤ ابراهيم عبدالكريم فارس، تاريخ القانون في وادي الرافدين والدولة الرومانية، مطبعة ازهر، بغداد، ١٩٧٣، ص٩١.
٥ الدكتور طعيمة الجرف، نظرية الدولة والاسس العامة للتنظيم الاجتماعي، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٦٤، ص٧.
[6] الدكتور ثروت بدوي، المصدر السابق، ص٢١. هەروەها بنواڕە: ادمون رباط، المصدر السابق، ص٣٣.
[7] جورج سباين، تطور الفكر السياسي، الكتاب الاول، ترجمة حسن جلال العروسي، دار المعارف بمصر، القاهرة، ١٩٥٤، ص١٠-١١.
[8] دیارە لەنێو گریکەکاندا ناتەبایی هەبو لەنێوان گەڕانیان بەدوای دەوڵەتی نمونەییو داشکاندنی کردارەکییان بەلای دژزینەوەی باشترین ڕێوشوێنی کارای فەرمانڕەوایی بەڵام پەیدابونی هەردو ڕەوەند پەیوەندیی بەهەلومەرجی سەردەرهێنانی شاری یۆنانییەوە هەیە. بۆ زیاتر شارەزابون، بنواڕە: جۆرج سپاین، سەرچاوەی پێشو، ل٨١و لاپەڕەکانی پاشتر.
[9] الدكتور ثروت بدوي، المصدر السابق، ص٣٢.
[10] الدكتور ابراهيم درويش، الدولة نظريتها وتنظيمها دراسة فلسفية تحليلية، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٦٩، ص١١٨.
هەمان سەرچاوە، ل١١٩.
[12] الدكتور محمود سعيد عمران واخرون، النظم السياسية عبر العصور، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٩٩، ص٧٧.
[13] الدكتور ابراهيم احمد شلبي، تطور الفكر السياسي، الدار الجامعية، بيروت، ١٩٨٥، ص٨٨.
[14] الدكتور عبدالحميد متولي، المصدر السابق، ص٢٠.
[15] ئەفلاتۆن دەوڵەتی بەزیندار چواند کەوەك هەر زیندارێك دڵو ئارەزوو و ئەقڵی هەیەو ئەم هێزانە پێکەوە هاوکاریی یەکتری دەکەن بۆ پاراستنی گیانی ئەم زیندارەو بۆ دەستەبەرکردنی هاوسەنگی لەم زیندارەدا دەبێ دڵو ئارەزوو مل بۆ ئەقڵ کەچ بکەنو هەروەها دەبێ

جوتیاران‌و بازرگانان‌و سەربازان‌و جەنگاوەران مل بۆ فەیلەسوفەکان کەچ بکەن چونکە فەیلەسوفەکان نوێنەرایەتیی ئەقڵ دەکەن. بنوارە: جۆرج سەپاین سەرچاوەی پێشو، ل ٨٢و لاپەڕەکانی پاشتر. هەروەها دکتۆر محەمەد سەعید عومران‌و ئەوانی تر، سەرچاوەی پێشو، ل٣٠٨و ١٢٤.

[16] الدكتور محمد كامل ليلة، النظم السياسية الدولة والحكومة، دار الفكرة العربية، القاهرة، ١٩٦٧-١٩٦٨، ص ٥٠١-٥٠٢.

[17] الدكتور محمود سعيد عمران واخرون، المصدر السابق، ص١٣٢-١٣٥و الدكتور عبدالحميد متولي، المصدر السابق، ص٦٣-٦٤.

[18] الدكتور محمد عبدالمعز نصر، في النظريات والنظم السياسية، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٦٤، ص٥١٢. هەروەها: ريموند كارفيلد كيتل، العلوم السياسية، ج١، ترجمة الدكتور فاضل زكي محمد، مكتبة النهضة، بغداد، ١٩٦٠، ص٢٢٨.

[19] الدكتور محمد كامل ليلة، المصدر السابق، ص٥٥٢.

[20] بەلای ئەرستۆوە داوەری دەزگایەکی خاوەن دەسەڵاتێکی راستەقینەیە، بۆیە دەتوانێ چاودێریی هەردو دەسەڵاتەکەی تری دەوڵەت بکات. لەم بارەیەوە بڕوانە: الدكتور محمود سعيد عمران، المصدر السابق، ص٧.

[21] الدكتور محمد طه بدوي والدكتور محمد طلعت الغنيمي، النظم السياسية والاجتماعية، دار المعارف بمصر، القاهرة، ١٩٥٨، ص٢٠٣.

[22] الدكتور ثروت بدوي، النظم السياسية، المصدر السابق، ص٧٩.

[23] الدكتور طعيمة الجرف، المصدر السابق ص٢٥٩.

[24] الدكتور منذر الشاوي، القانون الدستوري(نظرية الدولة)، منشورات مركز البحوث القانونية، بغداد، ١٩٨١، ص١٧٠

[25] الدكتور محمد طه بدوي والدكتور محمد طلعت الغنيمي، المصدر السابق، ص٢٠٢.

[26] الدكتور ابراهيم احمد شلبي، المصدر السابق، ١٦٤و ما بعدها.

[27] هەمان سەرچاوەی پێشو، ل١٦٦.

[28] جان توشار، الاسس النظرية والفلسفية للانظمة السياسية والقانونية منذ زمن الاغريق حتى القرن العشرين، ترجمة د. على مقلد، دار الاستقلال للثقافة والترجمة، بيروت، ٢٠٠١، ص٦٣.

[29] ستۆکیستەکان پەیڕەوانی فەلسەفەی ستۆکیسم Stoicism (الرواقيه).

[30] الدكتور محمود سعيد عمران وآخرون، المصدر السابق، ص١٥٤.

[31] الدكتور نوري لطيف، القانون الدستوري المبادئ والنظريات العامة، جامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٧٦، ص١٥١.

[32] الدكتور ابراهيم احمد شلبي، المصدر السابق، ص١٧٩-١٨٠.

[33] الدكتور طعيمة الجرف، المصدر السابق، ص٢٤١.

[34] الدكتور ثروت بدوي، المصدر السابق، ص٩٥.

[35] د. محمد كاظم المشهداني، النظم السياسية، كلية القانون، جامعة الموصل، ١٩٩١، ص٩٩-١٠٠.
[36] الدكتور طعيمة الجرف، المصدر السابق، ص٤٢٨.
[37] قەشە پاپا پۆلس بەوە دانەكەوت كەداواى ملكەچبون بۆ حوكمڕانەكان بكا بەڵكو ڕيشەى دەسەڵاتى بردەوە سەر خواو لەو سۆنگەيەوە واى دانا كەمل كەچ كردن بۆ ئەو دەسەڵاتە بنەمايەكى ئاينيى هەيەو دەبێ هەموان پابەندى دەسەڵاتى مير بن گوايە مير جێبەجێكەرى ئيرادەى خوايەو هەرچى گوێڕايەڵى مير نەبێ گوێڕايەڵى خوا نيسە. بڕوانە: الدكتور ثروت بدوي، المصدر السابق، ص٩١.
[38] الدكتور عبدالرحمن رحيم عبدالله، محاضرات في فلسفة القانون، كلية القانون، جامعة صلاح الدين، اربيل، ٢٠٠٠، ص٣٨.
[39] فەيلەسوف دانتى(١٢٦٥-١٣٢١) يەكێ لەو كەسانە بوو كەپشتيوانيى لەدەسەڵاتى دەوڵەت كردو واى بۆ چوو كەدەسەڵاتى پاشا لەخواوەيەو كەنيسە كارى پێوە نيە بەڵام لەهەمان كاتدا دانى بەوەدا نا كەپاپا دەسەڵاتى ئاينيى هەيە. بڕوانە: الدكتور ابراهيم درويش، المصدر السابق، ص٧٢.
[40] زۆر كەم دەربارەى ژيانى مارسيليۆ بادوا زانراوە. ناوبراو ڕاگرى زانكۆى پاريس بوو و زۆر لەپرۆژە سياسييەكانى خانەدانى جيبلانى ئيتالياوە نزيك بوو. لويس دوو بوڤيار پشتو پەناى بادوا بوو و تا ئەو كاتەى بادوا لەساڵى ١٣٤٢دا كۆچى دوايى كرد چارەنوسى بەچارەنوسى لويس دوو بوڤيارەوە بەسترابۆوە. بڕوانە: الدكتور ابراهيم درويش، المصدر السابق، ص٧٥.
[41] ريموند كارفيلد كيتل، المصدر السابق، ص٢٨٤.
[42] الدكتور صادق الاسود، علم الاجتماع السياسي اسسه وابعاده، مطبعة دار الحكمة، بغداد، ١٩٩٠، ص٣١٨.
[43] الدكتور طعيمة الجرف، المصدر السابق، ص٤٧٥.
[44] نيكۆلاى ميكياڤيللى لەدايكبوى ساڵى ١٤٦٩ى شارى فلۆرەنساى ئيتاليايەو سەر بەيەكێ لەبنەماڵە بورژوازيە گەورەكانە. باوكى يەكێ لەشارەزايانى ياسا بوو. بڕوانە: الدكتور عبدالحميد متولي، الوجيز في النظريات والانظمة السياسية، المصدر السابق، ص١٠٧.
[45] ژياننامەى بودان لەهەندێ ڕووەوە نەزانراوە. ئەم فەيلەسوفە لەپاريس وەك پارێزەرێكى ئەو سەردەمە ڕۆڵێكى بەرچاوى نواند لەپارتى سياسەتمەداراندا و لەساڵى ١٥٧٦ دا لەكۆمەڵەى گشتيى بلوودا سەرنجى هەموانى بەلاى خۆيدا ڕاكێشاو لەلادون پۆستى نوێنەرى پاشاى لەپەرلەماندا پێ سپێردرا بەڵام بەهۆى بيروباوەڕى كالڤينيستىيەوە كەباوەڕى پێ بوو، كەوتە بەر هەڕەشەى سزاى سوتاندن. بڕوانە: جان توشار، المصدر السابق، ص٢٣.
[46] الدكتور ابراهيم درويش، المصدر السابق، ص٩٤.

[47] کرۆتسیۆس لەدایکبوی بنەماڵەیەکی بەڕیشە فنسی‌ی شاری ولفتی هۆلاندە. لەبیروباوەڕدا لەژێر کاریگەریی ئەرستۆو یاساناسەکانی ڕۆمان‌و قەشە تۆما ئیکوینی و چەندەها زانای لاهوتناس بوو. زۆر بایەخی بەفەلسەفەی یاساو یاسای نێودەوڵەتان داو لەساڵی ١٦٤٠دا کتێبێکی سەبارەت بە ((یاسای دەستکەوتەکان))و پاشان لەساڵی ١٦٢٥دا کتێبێکی تری دەربارەی((شەڕو ئاشتی)) دەرکرد. ناوبراو وەك فەیلەسوف نەناسرا بەڵکو وەك بورژوازییەکی هۆلەندیی شارەزای بەرژەوەندییە بازرگانییەکانی وڵاتەکەی خۆی ناسرا. بڕوانە: الدكتور منذر الشاوي، فلسفة القانون، منشورات المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٩٤، ص١١٦.

[48] فەیلەسوفی ئنگلیز تۆماس هۆبز بەوە ناسراوە کەتیۆریسینی حوکمڕانیی ڕەهای بنەماڵەی ستیوەرتەو خودی خۆیشی پاشا شارلی یەکەم بەخێوی کردبوو. لەگرنگترین نوسینەکانی: لیفتیان(١٦٥١)، توخمەکانی ڕاستی یان یاسا(١٦٤٠)، هاووڵاتی(١٦٤٢). بڕوانە: جان توشار، المصدر السابق، ص٢٦٠.

[49] ريموند كارفيلد كيتل، المصدر السابق، ص١٣١-١٣٢.

[50] الدكتور محمد عبدالمعز نصر، المصدر السابق، ص٤٣٨و ٥١٢

[51] الدكتور طعيمة الجرف، المصدر السابق، ص٢٦٩-٢٧١.

[52] الدكتور نوري لطيف، نظرية الفصل بين السلطات بين الشكل والمضمون، مجلة العلوم السياسية والقانونية، جامعة المستنصرية، العدد الثاني، ١٩٧٧، ص ص ٥٠-٧٤.

[53] ريموند كارفيلد كيتل، المصدر السابق، ص١٣٣.

[54] الدكتور محمد طه بدوي، امهات الافكار السياسية الحديثة وصداها في نظم الحكم، دار المعارف بمصر، القاهرة، ١٩٥٨.

[55] الدكتور منذر الشاوي، الدولة الديمقراطية في الفلسفة السياسية والقانونية، الكتاب الاول، دار الكتب للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٩٨، ص٥٠.

[56] سامۆیل بۆفندرۆف بەرەگەز ئەڵمانەو خۆی‌و زانای هۆلاندی کرۆتسیۆس بەتیۆریسینی مافە سروشتییەکان دەژمێردرێن بەڵام ئەو بۆ خۆی لەلایەنگرانی دەسەڵاتەو لەپەنا میرو پاشاکانی سویددا دەژیاو مێژونوسی پاشای سویدیش بوو. لەنوسینە سەرەکییەکانی: یاسای سروشت‌و خەڵکی(١٦٧٢)، ئەرکەکانی مرۆڤ و هاووڵاتی(١٦٧٣). بڕوانە: جان توشار، المصدر السابق، ص٢٥٦.

[57] الدكتور طعيمة الجرف، المصدر السابق، ص٢٦٢.

[58] هەمان سەرچاوە، ل٤٦٨.

[59] الدكتور محمد طه بدوي، امهات الافكار السياسية الحديثة، المصدر السابق، ص٨٧.

[60] الدكتور كمال الغالي، مبادئ القانون الدستوري النظم السياسية، الطبعة الثانية، مطبعة دار الكتاب، دمشق، ١٩٩٦-١٩٩٧، ص٢٣٦-٢٣٧.

[61] هەمان سەرچاوەی پێشو، ل٣٣٥-٣٣٧.

[62] الدكتور عبدالحميد متولي، الوجيز في النظريات والانظمة السياسية، المصدر السابق، ص١٦٧.

[63] الدكتور كمال الغالي، المصدر السابق، ص٤٠.
[64] الدكتور عبدالحميد متولي، المصدر السابق، ص٢٦١.
[65] الدكتور هاني سليمان الطعيمات، حقوق الانسان وحرياته الاساسية، دار الشروق للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠١، ص٨٢.
[66] محمد سعيد طالب، الدولة الحديثة والبحث عن هوية، دار الشروق للنشر، عمان، ١٩٩٩، ص٢٥٢.
[67] الدكتور ثروت بدوي، المصدر السابق، ص١٦٢.
[68] الدكتور محسن خليل، النظم السياسية والدستور اللبناني، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٧٥، ص٤٧٩. هەروەها بڕوانە: الدكتور محمد عبدالمعز نصر، المصدر السابق، ص٢٦٠ وما بعدها. شايانى باسە كە كارل ماركس بەڕەچەڵەك ئەڵمانەو لەدايك و باوكێكى جولەكەيە بەڵام باوكى وازى لەجولەكايەتى هێنـاو چـوە سـەر مەزهـەبى پرۆتستانتى مەسـيحيەت. ماركس لەرۆژانێكى سەختدا ژيا كەئاسەوارى قوڵيان لەسەر بيركردنەوەى بـەجێ هێشـتو لەسەرەتاى تافى لاوێتىيدا ئاشنايەتىى لەگەڵ دۆستى گيـانى بـەگيانى خـۆى، ئـەنگلس، پەيدا كردو نيدى هەردوكيان پێكەوە تيۆريى سۆسياليزمى زانستييان دارشت. بڕوانە: جـان توشار، المصدر السابق، ص٤٧٦.
[69] الدكتور سليمان الطماوي، السلطات الثلاث في الدساتير العربية المعاصرة وفي الفكر السياسي الاسلامي- دراسة مقارنة، مطبعة جامعة عين شمس، ١٩٨٦، ص٥٢١.
[70] جان توشار، المصدر السابق، ص٥٠٠.
[71] الدكتور ابراهيم درويش، المصدر السابق، ص١٠٢.
[72] الدكتور طعيمة الجرف، المصدر السابق، ص٥٠٢.
[73] هەر لەو ديدە ئەنگلس وتويەتى كەچينى پرۆليتاريا بۆ ئـەوە پێويستى بەدەوڵـەت نيـە كەئازاد بێ بەڵكو بۆ ئەوەيەتى كەدوژمنەكانى خۆى پێ سەركوت بكاتو تەنها لـەو رۆژەدا دەكرێ باسى ئازادى بكرێ كەتێيدا كۆمەڵ دەوڵەتى تێدا نەما بێ. بڕوانە: الدكتور محمد طه البدوي، امهات الافكار السياسية الحديثة، المصدر السابق، ص١٤٢.
[74] الدكتور عبدالحميد متولي، القانون الدستوري والانظمة السياسية، الجزء الاول، الطبعة الثالثة، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٦٤، ص٣٦١.
[75] هەمان سەرچاوە، ل٣٥٦.
[76] سيستمى سياسيى دەوڵەتى سۆسياليست لەسەر كۆكردنەوەى دو دژ دامەزراوە كـەبريتين لەدكتاتۆرىو ديموكراسى.
لەڕوى دكتاتۆرييەوە، وا رادەگەيـەنرێ كەئەمـە دكتـاتۆريى پرۆليتاريايـە بـەڵام دكتاتۆرىيەكى شۆڕشگێڕەو دژى رژێمى سەركارەو خەبات بۆ سەقامگيركردنى رژێمە تازەكە دەكا ئەويش بەگۆڕينى هەلومەرجى ماددىى بەرهەم هێنان لەڕێى نەهێشـتنى خـاوەنێتىى تايبەتى هۆكانى بەرهەم هێنانەوەو لەم روەوە ئامرازى بنەڕەتيى ئەم دكتاتۆرىيە شۆڕشگێڕە، حزبى كۆمۆنيستە.

لەروی دیموکراسییەوە، وا رادەگەیەنرێ کەپەیڕەوی لەدیموکراسیی ناوەندی دەکرێ کەئەم ماناپانەی هەیە:

١ هەلبژاردنی هەمو ئەو دەزگایانەی کە لەخوارەوە تا سەرەوە نوێنەرایەتیی دەسەلاتی دەولەت دەکەن.

٢ ملکەچبونی دەزگاکانی خوارەوە بۆ سەرەوە.

٣ پابەندبونی دەزگاکانی خوارەوە بەفەرمانەکانی دەزگاکانی سەروی خۆیان.

٤ ملکەچبونی دامودەزگا ئیدارییەکانی راپەڕاندن بۆ ئەنجومەنی هەلبژێردراوی گەل بەو پێیەی کەئەم ئەنجومەنە بالاترین دەسەلاتە لەدەولەتدا.

٥ چاودێری کردنی دەزگای دەولەت لەلایەن گەلەوە.

لەم روەوە بچۆرە سەر: کرافتسوف، عرض موجز لنظريات الدولة والقانون، المصدر السابق، ص١١٥و كذلك ١٠٤.

سستمی پەیڕەوکراو پەنا بۆ هەلبژاردن دەبا بەلام دیموکراسییەکە تەنها بۆ چینی کرێکارەو ئەوانە لەریزی پێشەوە بۆ پێشەنگی شۆڕشگێڕی پرۆلیتارییە بەتایبەتی ئەندامانی پارتی کومۆنیست یاخود لانی کەم پالێوراوانی پارتی کۆمۆنیست. دەستور بەجۆرێك دارێژرا بوو کەشێوەی هەرەم وەرگرێ کەلوتکەکەی ئەنجومەنی وەزیرانەو بنکەکەی لێشاوی هەلبژێرەکانەو دەزگاکانی خوارەوە لەسەر بناغەیەکی شاقولی بەدەزگاکانی سەرەوە بەستراونەتەوە. جگە لەوە دەزگاکانی حزب هەن کەهاوجوتن لەگەل رێکخستنی هەرەمی دەزگا دەستورییەکانی دەولەت. ئیدی لەنێوان ئەم دو هەرەمەدا دەزگاکانی حزب لەسەر هەمو ئاستەکان زالن بەسەر دەزگاکانی دەولەتدا ئیتر بەم شێوەیە حزب دەبێتە سەرچاوەی راستەقینەی دەسەلاتەکانی ناو دەولەتو بەکردەوە دەزگاکانی مل بۆ دامودەزگاکانی حزب کەچ دەکەن. بڕوانە موريس دوفرجيه، المؤسسات السياسية والقانون الدستوري- الانظمة السياسية الكبرى، ترجمة د. جورج سعد، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت، ١٩٩٢، ص٤١١.

بەو مانایەی کەحوکمڕان تەنها ئامرازێکە بەدەست دەولەتەوەو دەولەت لەرێی ئەو حوکمڕانەوە دەسەلات هەلدەسوڕێنێ یاخود بەو واتایەی کەدەسەلات بۆ دەولەت دەگەڕێتەوە بەو پێیەی کەدەولەت سوبێکتی خۆی هەیە کەجیایە لەشەخسی حوکمڕانەکانو بەبەردەوامیش هەیە. لەم روەوە بچۆرە سەر: الدكتور ثروت بدوي، المصدر االسابق، ص ١٧٧.

## تەوەری ئاین و دەوڵەت لەتورکیا

ئەم تەوەرە لەدو توێژینەوەی گرنگ پێکدێ کەدو شارەزا لەبواری کاروباری تورکیا نوسیویانە. توێژینەوەی یەکەم ئیدریس بووانو نوسیویەتی کەتێیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کەچەشنە لێک نزیک بونەوەیەک لەنێوان رەهەندی ئیسلامگەراو رەهەندی عیلمانی لەتورکیا هاتۆتە دی بەجۆرێک کەخەریکە بەیەکتری رازیبونێک دێتە دیو هەم ئەو روخسارانەی عیلمانیەت کە لەریفۆرمە کەمالیستیەکاندا بەدی دەکرێن، خەریکن توندوتیژیی جارانیان پێوە دیار نامێنێ‌و هەم رەهەندی ئیسلامگەرا خەریکە زیاتر لەگەڵ پرۆسەی دیموکراتیدا دەسازێ.

توێژینەوەی دووەم کەدکتۆر خەلیل عەلی مراد نوسیویەتی، پێشینەی مەسەلەی ئاین لەتورکیا تاوتوێ دەکاو رۆڵی ئاین لەپرۆسەی سیاسیدا شی دەکاتەوە. لەراستیدا هەردو توێژینەوە یەکتری تەواو دەکەن‌و ئەگەرچی هەردوکیان لەدو کاتو دو شوێنی جیاوازدا نوسراون بەڵام بۆچونەکانی هەر توێژینەوەیەک بونەتە پشتیوان بۆ بۆچونەکانی توێژینەوەکەی تر.

سەنتەر

*راو بۆچونەکانی نوسەرانی ئەو لێکۆڵینەوانەی خراونەتە دوتوێی ئەم تەوەرەوە، گوزارشت لەراو بۆچونی سەنتەر ناکەن*.

| ئاماژەکانی پشت ململانێی نێوان رەهەندی ئیسلامگەراو رەهەندی عیلمانی لەتورکیا | حزبە سیاسییەکان‌و مەسەلەی ئاین لەتورکیا |
| --- | --- |

# ئامانجەکانی پشت ململانێی نێوان رەهەندی ئیسلامگەراو رەهەندی عیلمانی لەتورکیا

ئیدریس بووانو

دام‌و دەزگای راگەیاندن ئەمڕۆ توانیویەتی بڕێکی زۆری زانیاریمان سەبارەت بەکرۆکی چەندان نەبەرد پێ بناسێنێ بەڵام چەندەها نەبەردو شەڕو جەنگ‌و ململانێ هەیە کە نە سەرەنجامی زانراوە نە دەزانرێ ژمارەی قوربانی‌یەکانی چەندەو نە ژمارەی کوژراوو بریندارەکانی، ئەویش نەبەردە فیکرییەکانە کە بەشێوەیەکی رەها لەمەترسیدارترین شەڕو جەنگەکان، لەبابەتی ئەو نەبەردە زبرەی ماوەیەکە لەنێوان رەهەندی ئیسلامگەراو رەهەندی عیلمانی لەوڵاتانی دنیای ئیسلام، لەسەروی هەموویانەوە تورکیا، کەوتۆتە گەڕ.

مەکینەی راگەیاندن ناوبەناو هەندێ لەو رووداوانەی سەبارەت بەهەندێ کێشە خستۆتە بەرچاو کە لەململانێ‌و شەڕی نێوان دو رەهەندەکە کەوتۆتەوە بەڵام ئەم مەکینەیە بەدەگمەن توانیویەتی پلەی گەرمیی ئاگری ژێر خۆڵەمێشی ئەم شەڕەمان پێ بناسێنێ، شەڕێك کە هاوکێشە لەبەرچاو ونەکانی نێوان دو رەهەندەکە سەپاندوویانە.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵ دەدەین پەردە لەڕوی پەنهانی‌یەکانی ململانێی نێوان دو رەهەندەکە هەڵبماڵین چونکە ئەو ململانێ‌یە لەمێژە لەئارادایەو سەرنجی تۆژەران‌و شیکارانی بەلای خۆیدا راکێشاوە. هاندەرمان بۆ تاوتوێ‌کردنی ئەم ململانێ‌یە یاخود با بڵێین هاندەرمان بۆ سەرلەنوێ شی کردنەوەی، چەند هۆکارێکە کە گرنگترینیان ئەمانەن:

۱-ساغ کردنەوەی رادەی پتەوی و تۆکمەیی ڕەهەندی ئیسلامگەراو ریشە داکوتانی نەك هەر لەچەند ساڵێکی رابردووەوە بەڵکو لەسەدان ساڵەوە لەچوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا.

۲-پەرۆشیمان بۆ زانینی هەلومەرجی دەرکەوتنی تۆوی یەکەم جاری رەهەندی عیلمانی لەناو تورکیاو سەرەتای دەستپێکی گەڵاڵەبونی چ لەناو نوخبەی مەدەنیی روناکبیرە عوسمانییەکانداو چ لەناو نوخبەی سوپایی ئەفسەرانی سوپاداو تاوتۆی کردنی هەندێ لەروخسارو رواڵەتەکانی عیلمانیەت کەهاوتەریبی ریفۆرمە کەمالیستی یەکان بوەو کاردانەوەشی لێ کەوتۆتەوە.

۳-ئاماژەکردن بۆ گرنگترین سەرەنجامو کاردانەوەکانی پاش ریفۆرمە کەمالیستی یەکان کەبریتی بون لەپەیدابونی چەند گروپێکی سۆفیو بزاوتێکی پەروەردەییو کەلتوری کە بەهەر هەمویان ئەو پێکهاتانەیان لێ پێك هات کەپێی دەگوترێ رەهەندی ئیسلامگەراو ئەوەی بەلامانەوە گرنگە ئەزمونە سیاسییەکەی گروپێکی هەڵسوراوە کەگروپی رای نیشتمانییە.

٤-لەنزیکەوە ناسینی هاوکێشە لەبەرچاو ونەکانی ململانێی نێوان هەردو رەهەندی ئیسلامگەراو عیلمانی لەکۆتایی رۆژانی دەوڵەتی عوسمانییەوەو پاشان باسك ئەستوربونی تا ئەم هەلومەرجەی ئەمرۆو کشانەوەی هەر لایەکیان بەقازانجی لاکەی تر. ئەمەش لەسەر چەند ئاستێك لەئارادا بوو ،گرنگترینیان لەسەر ئاستی وتاری هەردولایە.

٥-وریابونمان لەگرنگترین کرۆکەکانی ململانێی نێوان هەردو رەهەند. بە باوەری ئێمە، ئەو کرۆکانە نەك هەر بۆ ئەزمونی دیموکراسیی تورکیا گرنگن بەڵکو هەروەها بۆ تەواوی دیموکراسییەکانی جیهانی عەرەبو ئیسلامیش.

لەکۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا بەکورتی چوینەتە سەر ئەوەی کە دەشێ ئەزمونی دیموکراتیی عەرەب دوچاری ئەو ململانێیە نەبێ کە دوو رەهەندەکەی ناو تورکیا دوچاری بونو دەشێ سود لەم ئەزمونە وەرگرێ بۆ بنیاتنانی کەشوهەوایەکی دیموکراتیی وا کەدەستی هەبێ لەپەرەپێدانی وڵاتەکاندا.

## یەکەم: دەوڵەتی عوسمانی لانکەی ڕەهەندی ئیسلامگەرای ئەمڕۆیە

### ١-کورتە سەرنجێك لەدەوڵەتی عوسمانی

ئەگەر سەیرێکی شانۆی نێودەوڵـەتیی سـەدەی حەوتـەمی کۆچـی بکـەین کەدەکاتە سەدەی سـێزدەهەمی زاینـی، بۆمـان دەردەکـەوێ کەچـەندها بـەش لەجیهانی ئیسلام لەژێر پەرچەمی چەند دەوڵەتێکدا بون: میسرو حیجازو شـام لەژێر حوکمڕانیی مەمالیکە موسڵمانەکاندا بون، نیمچە دورگـەی ئـەناتۆلیا لەبەر دەستی سەلجوقییە تورکە موسڵمانەکاندا بوو و ولاتی ئـەندەلوس لـەژێر فەرمانڕەوایی چەند دەوڵەتۆکەیەکی پاشاکاندا بوو. ئاگری شەڕ لەزۆربەی ئەو شوێنانەی جیهانی ئیسلام لەگـەڵ هـێزە ئەوروپایی‌یـەکاندا بەسـەرکردایەتیی کەنیسەکەی ڕۆما، کڵپە سەندوو بوو.

لەو قۆناغە ناسکەی مێژوی جیهانی ئیسلامدا بنەماڵەی عوسمانی دەوڵەتی خۆی لەسەر دەستی سوڵتانی جیهانگیر عوسمان خانی کوڕی ئارتوغرولی کـوڕی سلێمان شای تورکمان لەساڵی ٦٩٩ی کۆچی (١٢٨٠ی زاینی)دا دامـەزراند[١].

ڕوپێوی ئـەم دەوڵەتـە دواتـر پـەرەی سـەندو ئـێران، عـێراق، ئازەربایجـان، ئەرمەنستان، (کوردستان)، نیمچە دورگەی عەرەب، سوریا، فەلەستین، میسر، تونس‌و جەزائیری گرتەوەو گەیشتە سەر سنوری مـەغریب‌و لەنیمچـە دورگـەی بالکان‌و ئەوروپای ڕۆژهەلاتەوە تا باشوری ڤیەنناو نزیك لنینگراد بە بـەلگرادو سربیاو مۆنتینیگرۆو کۆسۆڤۆو سنجەقاو بۆسنیاوە، واتە سنوری سیاسیی ئـەم دەوڵەتە بۆ ئـەفریقیاو ئاسـیاو ئـەوروپا پـەلی هاوێشـت، لەئێرانـەوە لـەدیوی ڕۆژهەلاتدا تا نزیك شـورەکانی دەوروبـەری ڤیـەننا لـەڕۆژئاوادا‌و لەحەبەشـەوە لەدیوی باشوردا تا هنگاریا لەباکوردا[٢].

پاش ئەوەی دەوڵەتە ئیسلامییەکەی عەباسییەکان لەساڵی ٦٥٦ی کۆچی‌دا داهێزراو پاش ئـەوەی خەلیفـەی عەباسـی محەمـەدی موتـەوەکل بـۆ سـوڵتان سـەلیمی یەکـەم دەسـتی لەخەلافـەت هـەڵگرت، دەوڵـەتی عوسمـانی ئـالای خەلافەتی ئیسلامیی هەڵ کردو بەمە دەوڵەتی عوسمانی بەشـێوەیەکی ڕەسمـی بوە بەرپرسـیارو ئـەرکی پاراسـتنی جیـهانی ئیسـلام‌و گـەیاندنی بانگـەوازی

ئیسلامی بۆ تەواوی جیهان کەوتە ئەستۆ. سوڵتان سەلیمی یەکەم دەمو دەستو بەکسەر کەوتە پشتگیری کردنی پیشەسازیی چەكو دروستکرنی کەشتی گـەل لەمیسرو پشتیوانیکردن لەکەشتی گەلی موسڵمانان لـەدەریای سـورو دەریـای ناوەڕاستو ڕاوەدونانی کەشتیی پورتوگالیە خاچپەرستەکانو پاراستنی شوێنە پیرۆزەکانی ئیسلام. دەوڵەتی عوسمانی تـا سـەردەمی سـوڵتان عەبدولحـەمیدی دووەم لەساڵی ۱۹۰۹ لەسەر کار لابرا، ڕۆڵـی دەوڵـەتی خەلافـەتی ئیسـلامی لەئەستۆ گرتبو[٣].

دەوڵەتی عوسمانی لەململانێیدا لەگـەڵ هێزەکـانی ئـەوروپادا بەتـەواوەتی پشـتی بەئیسـلام بەسـتبوو و لەوەتـەی سـوڵتان محەمــەدی فــاتیح شــاری قوستەنتینیەی گرت ئەم مەسەلەیە بوە رازی سەرکەوتنی ئــەم دەوڵەتــە، لــەم ســۆنگەیەوە دیــن بــوو بەیــەکێ لەفاکتــەرەکانی ململانــێی فیکــریی نێــوان شارستانێتیی ئیسلامو شارستانێتیی ڕۆژئاوایی[٤]، یـاخود وەك دکتــۆر ئەحمــەد عیماری ناوی ناوە، شارستانێتیی لاتینی[٥].

## ٢-سەرەتای دەستپێکی لاوازبونی دەوڵەتی عوسمانی

لەساڵانی کۆتاییی تەمەنی دەوڵەتی عوسمانیدا چەندەها هۆکار بونە هــۆی لاوازبونی دەوڵەت کە لەئاکامدا دەوڵەتی عوسمانی نەیتوانی کۆنترۆڵی چــەندین ناوچە بکا کە جاران لەژێر کۆنترۆڵیدا بوون. سەرەتای ئەم لاوازیە کەبــەرۆکی دەوڵەتی عوسمانیی گرت بۆ کۆتاییی سەدەی حەڤدەهەم دەگەڕێتەوە بەڵام ئـەم لاوازیە لەچارەکی دواییی سەدەی هەژدەهەمەوە تا سەرەتای چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم رەگی داکوتا. چەندەها ئاماژە-کەناکرێ لەبەر کورتــیی ئـەم توێژینەوەیە بەتێروتەســەلی بچینــە ســەر باســکردنیان-ســاغیان کــردەوە کــە سەرەڕای ئەو جەزرەبانەی کە لەماوەی ناوبراودا بەر دەوڵەتی عوسمانی کــەوتون ئەم دەوڵەتە هێشتا لەخۆی رادەبینــی کــەبتوانێ بەرگــە بگــرێو ڕۆڵـی خــۆی لەهاوسەنگیی جیهاندا بگێڕێ، ئەمەش لەکاتێکدا کە هێشتا هــێزی ڕۆژئــاوا نەگەیشــتبوە ئاســتی هــێزێکی جیــهانیی دەســڕۆ بــەتوانا، بــەڵام لەســەدەی

نۆزدەهەمدا ئەم بارودۆخە گۆڕانی بەسەردا هات نەك هەر سەبارەت بەدەوڵەتی عوسمانی بەڵکو سەبارەت بەهەمو دەوڵەتە ئیسلامی‌یەکانی تر. لەساڵی ۱۷۷٤ بەدواوەو پاش روخانی ئیمپراتۆریەتی مەغۆل لەهندستان لەشەڕی پالاس لەگەڵ بریتانیاو پاش روخانی دەوڵەتی سەفەوی لەناوەڕاستی هەمان سەدەدا، بەرە بەرە دەرکەوت کەشپرزەیی‌و تێکچونی شێوازە بۆتە مەسەلەیەکی گشتی لەتەواوی وڵاتانی جیهانی ئیسلامدا. ئیتر لەوساوە لەئاکامی دواکەوتویی‌ی جیهانی ئیسلام لەبواری شێوازە مۆدێرنەکانی جەنگ‌و رێوشوێنەکانی بازرگانی‌و ئابوریی تازە، وردە وردە ئەو جیاوازی‌یەی نێوان هێزی مادیی رۆژهەڵات‌و رۆژئاوا دەردەکەوت‌و رون دەبوەوە. لەسەرێکی ترەوە، هاوسەنگی‌یەکانی هێزەکانی ئەورروپاش پەرەیان سەند، ئیتر لێرە بەدواوە ئەم باڵادەستی‌و ئەم پەرەسەندنە ئەو دەرفەتە بۆ هێزە ئەورروپایی‌یەکان دەرەخسێنێ کەبچنە قۆناغێکی نوێی هێرش کردن بۆ سەر وڵاتانی جیهانی ئیسلام‌و لێرە مەسەلەکە پەیوەندیی بەقۆناغی هێرشی راستەوخۆو پێشبڕکێی کلاسیکی‌یەوە هەیە، واتە داگیرکردنی سوپایی[٦].

ئەم قۆناغە تازەیە بەهەمان شێوازی دو سەدەی رابردو برایە سەر کەشێوازێکە تێیدا هەوڵ درا دەسەڵات لەڕێی بازرگانی‌و سیاسەتەوەو بە ململانێ بۆ کۆنترۆڵ کردنی دەریاو ئۆقیانوسەکان، پەیدا بکرێ. سەرەڕای ئەو هەمو پەرەسەندنە تازەیە دەوڵەتی عوسمانی بەپێی پێوانەکانی سەدەی نۆزدەهەم وەك هێزێکی گەورە مایەوەو رۆڵی خۆی وەك نوێنەری جیهانی ئیسلام گێڕاو روبەڕوی هەڵناوسانی هێزی رۆژئاوا بۆوەو بەرپەرچی هەڕەشەکانی دایەوە.

هۆی ئەم مانەوەیە بۆ دو فاکتەری بنەڕەتی‌ی لێك گرێدراوو تەواوکەری یەکتری دەگەڕێتەوە:

أ-سیاسەتی ریفۆرمخوازانەی سوڵتانە عوسمانییەکان لەسەلیمی یەکەمەوە تا سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید، لەهەوڵێکدا بۆ چارەسەرکردنی هۆکانی لاوازی‌و شپرزەبونی هێزی خۆیی‌و میکانیزمەکانی هەڵسوڕاندنی پەیوەندیی

نێوان ناوەندێتیی عوسمانیو ویلایەتەکانی سەر بەناوەند چ لەسەر خاکی ئەورووپاو چ لەسەر خاکی رۆژهەڵاتدا.

ب-سروشتی تەرازوی هێزە ئەورووپایییەکان کە بەسەرجەم ئەوەیان سەپاند کەدەبێ دەوڵەتی عوسمانی بمێنێو تا ئەو کاتەی-لەروانگەی هێزە ئەورووپایییەکانەوە-هەنگاوی پێویست بۆ لێك داپچڕاندنو پارچە پارچەکردنی دەنرێ، دەبێ ئەو دەوڵەتە بمێنێ بەڵام نابێ پارچە پارچەکردنی ببێتە مایەی هەرەشە لەتەرازوی هەستیاری نێوان هێزە رکابەرەکانی ئەورووپا کەپێشبڕکێ لەسەر رێبەرایەتی کردنی ئەورووپاو دابەشکردنی جیهان دەکەن[7].

ئەم دو فاکتەرە لەهەردو سەدەی شانزەهەمو حەڤدەهەمدا لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە پراکتیزە کران. ئەو ماوەیەش ماوەی دەسەڵاتو دەسڕۆییو هەژمونو باڵا دەستیی دەوڵەتی عوسمانی بوو و ئەو دەوڵەتە توانی سود لەو دو فاکتەرە وەرگرێ بۆ تێکدانی یەکپارچەییو یەکرێزیی ئەورووپا بەڵام لەسەدەی نۆزدەهەمدا جێبەجێکردنی ئەم دو فاکتەرە دیویکی تری دو فاکتەرەکەی نیشاندا چونکە رۆژئاوا بەکاریگەریو گوشاری بۆ سەر پرۆسە ریفۆرمخوازییەکانی دەوڵەتی عوسمانی کارێکی وای کرد ئەو دەوڵەتە زۆر پشتی پێ ببەستێو ئەمەش وای کرد بتوانێ پاشماوەی تۆخمەکانی هێزی دەوڵەتی عوسمانی لەخشتە بداو بەرەو لاوازبون هەنگاو بەر قەوارە زلو زەبەلاحە بنێ چونکە نەیدەتوانی بەیەك کەرەت هەرەسی پێ بێنێ بەڵام دەتوانرا وردە وردە بنکۆڵ بکرێو بەرە بەرە لێك بترازێنرێ[8]. هێزە رۆژئاواییەکان بەتەواوی درکیان بەهێزو توانای ئەو قەوارەیە کردبوو، بۆیە کەوتنە خۆ بۆ پیادەکردنی سیاسەتی کلۆرکردنی لەناوەوە.

### دووەم: سەرەتای دەستپێکی عیلمانیەت لەدەوڵەتی عوسمانیدا

سەردەمی ریفۆرم لەدەوڵەتی عوسمانیدا لەقۆناغی دوەمیدا لەسەر دەستی خەلیفەی عوسمانی سەلیمی سێیەم دەستی پێکردو گرنگترینی ئەو ریفۆرمانە ئەوانە بون کە کەوتنە سەرلەبەر رێکخستنەوەی هێزە چەکدارەکان لەسەر

بنچینەیەکی مۆدێـرن کەشانی لەشانی ئەو ریفۆرمانە دەدا کەسوپاکانی ئەوروپا ئەنجامیان دابو. ئەم ریفۆرمانە لەسەر دەستی سـولتان مەحمودی دوەم زۆر بەڕونی سەرکەوتنیان بەدەست هێنا چونکە ئەم سوڵتانە لەسالّی ۱۸۲٦دا خوێندکارانی سوپای عوسمانیی بۆ خوێندنگا سوپاییەیە رۆژئاواییەکان نـارد تاکو خوێندنی تێدا تەواو بکەن، بەتایبەتی لەفەرەنسا. ئەم هەنگاوە هاوکات بوو لەگەڵ زیادبونی سەفەری خوێندکارە عوسمانییەکان بۆ خوێندنی بالاّ لەزانکۆکانی رۆژئاواو خوێندنی هەندێکیان لەو خوێندنگە بیانییانەی کە تازە خەریك بوو لەشارە گەورەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا سەریان دەردەهێنـاو پەیدا دەبون.

کەواتە چینێکی خوێنەواری نوێ پەیدا بوو کەزادەی خوێندنگە ئەوروپاییەکان بوو و ئەم چینە بوە هەڵگری بیروباوەڕێکی نوێ کەچەشنە گرژییەکی ناوخۆییی پێك هێناو چەندەها پرسیاری دەربارەی دەوروبەری خۆی وروژاند. لەبەرامبەردا ئەم مەسەلەیە بوە هۆی سەرهەڵدانی شێوان لەناوخۆدا کە دەرهاوێشتەی پێویستییەکی زۆر بوو بەخۆپاساودانو لەئاکامدا لەنێو کۆمەڵی عوسمانیدا سێ رەهەند یاخود سێ گروپ سەریان دەرهێنا:

-گروپی یەکەم: ئیسلامییەکان، کە سور بون لەسەر پاراستنی قەوارەی ئیسلامیی دەوڵەتو پاراستنی ئاینی ئیسلام وەك بنچینەی ژیان لەهەمو رویەکەوە.

-گروپی دوەم: تۆرانییەکان، کەبانگەشەیان بۆ نەتەوایەتیی تورکچێتی دەکردو دروشمەکەیان بریتی بوو لەوەی کە ((تەنها تورك دۆستی تورکە)). ئەم گروپە هەوڵیدا گەلانی تۆرانی لەیەك قەوارەدا کۆ بکاتەوە.

-گروپی سێیەم: رۆژئاواییەکان، کە لەنێوخۆی دەوڵەتی عوسمانیو لەرۆژئاوا ئاشنایەتییان لەگەڵ بیروباوەڕی رۆژاواییدا یەپدا کردبوو و لەم روەوە گەشتە زانستییەکانی هەندێ خوێندکاری عوسمانی رۆڵێکی گەورەیان لەئاشنایەتی پەیداکردن لەگەڵ ئەم بیروباوەڕەدا پەیدا کردو لەئەنجامدا بەشێکیان بەو بیروباوەڕە سەرسامو مەدهۆش بونو تەنانەت بانگەشەی

بەبرەوكردنیشیان بڵاوكردەوە. لەئاكامی ئەمەدا لایەنگرانی ئەم رەهەندە زۆر بەكەرمو گوڕی كەوتنە خۆ دابڕاندن لەدابو نەریتی ئیسلامیو پەیوەندیكردن بەڕۆژئاواوە. لەمنداڵدانی رەهەندی سێیەمدا -كە لەمەولا زۆر بەسەختی ململانێ لەگەڵ هەردو رەهەندەكەی تردا دەكا، بەتایبەتی رەهەندی ئیسلامی- بیروباوەڕی عیلمانی سەری دەرهێنا.

## ١-قۆناغی دزەكردنی بیروباوەڕی عیلمانی بۆ ناو دەوڵەتی عوسمانی

لەسەردەمی خەلیفە مەحمودی دوەمدا وردە وردە بیروباوەڕە سەرەتاییەكانی پرۆسەی بەعیلمانی كردنو بەڕۆژئاواییكردن دەستیان بەدزەكردن كرد بۆ ناو دامو دەزگاكانی دەوڵەت. ئەوەی یارمەتیی ئەم مەسەلەیەشی دا هانا بردن بوو بۆ یاسای دانراو كەپشت ئەستور بوو بەیاساكانی ئەوروپا بۆ تەواوكردنی ئەو یاسایەی كە لەدەوڵەتی عوسمانیدا كاری پێ دەكراو بەتەواوەتی پشت ئەستور بوو بەشەریعەتی ئیسلام. جگە لەوە، هەنگاوی تازەش لەبەڕێوەبردندا نرا كەبوە هۆی نەهێشتنی تێڕوانینی كۆنی دەوڵەتو جێگرتنەوەی لەلایەن تێڕوانینی فەرەنسایییەوە كەبانگەشەی بۆ دەوڵەتێكی ناوەندیی یەكگرتو دەكرد كەبیرۆكراسی هەڵی دەسوڕێنیو هیچ ئاسەوارێكی حكومەتە ئیقلیمیو ناوچەییەكان لەسایەی دەوڵەتی عوسمانیدا ناهێڵێ[١].

بەگشتی دەتوانرێ ئەوە بگوترێ كەپرۆسەی دزەكردنی بیروباوەڕی عیلمانی بۆ ناو دەوڵەتی عوسمانی بەر لەوەی ئەم دزەكردنە پەرە بسەنێو لەدەوڵەتی مۆدێرنی توركیادا رەگ داكوتێ، بەدو قۆناغدا تێپەڕیوە:

١-قۆناغی یەكەم: رابەرانی عیلمانیەت لەكاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی بون وەك سەعید حەلیم پاشاو ئەحمەد جەودەت پاشاو دواتریش چینێكی رۆشنبیرانی عوسمانی چوە پاڵیان كەئەندامەكانی بۆیان لوا بوو ئاشنایەتی لەگەڵ بیروباوەڕی رۆژئاواییدا پەیدا بكەن چ بەهۆی خوێندن لەخوێندنگە بیانییەكانداو چ بەهۆی گەشتو خوێندن لەوڵاتە رۆژئاواییەكاندا. ئەوانو ئەمان زۆر كەوتنە ژێر كاریگەریی بیریارانی رۆژئاوا وەك جان جاك رۆسۆ،

مۆنتسـکیۆو هتـدو ئەوانـەیان بەئالتـەرناتیڤێکی بـەهاو بیروباوەڕە((کلاسیکییەکانی)) دەوڵەتەکەی خۆیان ژمارد.

ئەندامانی ئەم چینە زۆر هەوڵیاندا لەنێو شەریعەتی ئیسلامدا شوێنێك بـۆ ئەم بیروباوەڕە رۆژئاواییی‌یانە بدۆزنەوەو لەم روەوە جەختیان لەسەر ئەوە کرد کـە ((دەبـێ لەبـەر رۆشـنایی‌ی چـەمکی لیـبرالیزم، چـاو بـەدیدو تێڕوانینـە ئیسلامییەکاندا بگێڕدرێتەوە))[10]. لەو رۆشنبیرانە، نامق کـەمالو زیـا پاشـا. نامق کەمال کەزۆر لـەژێر کاریگـەریی رۆسـۆو مۆنتسـکیۆدا بـوو پـەیڕەویی لەتێڕوانینە بنەڕەتییەکانی بیری سیاسیی ئـەوروپایی کـرد بـەڵام زۆر هـەوڵیدا شوێنێك لەو بیرە لەشەریعەتی ئیسلامدا بدۆزێتەوە. لەبـەر ئـەوە هاوسـەنگی‌ی دروست کرد لەنێوان دەسەڵاتی گەلو بەیعەو لـەو بڕوایـەدا بـوو کەشـەریعەت خەوشی تێدا نیەو بۆ هەر دەوڵەتێك دەگونجێ. هەروەها زیا پاشا جەختی لەسەر پێویستی‌ی تازەگەری‌و جێبەجێ‌کردنی شـەریعەتی ئیسـلام لـەژیانی گشـتیدا کرد[11]. ئەم دو کەسەو چەندەها رۆشنبیری تری عوسمانی‌ی ئەو سەردەمە لەسـەر ئەوە یەکڕا بون کە((پیاوە نەخۆشەکەی ئـەوروپا))-ئەمـە ئـەو نازناوەیـە کـە لـەکۆتایی‌ی تەمـەنیدا بەدەوڵـەتی عوسمـانی دەگوتـرا-پێویسـتی بـە بڕێـك پرنسیپو دیدو تێڕوانینی تازەیە کەبیروباوەڕی کۆن پوچەڵ ناکاتـەوەو لـەژیانی گشتی‌ی بەیەکجارەکی دور ناخاتەوە.

لاوانی عوسمانی‌ی لەبابەتی ئەم دو کەسـەو کەسـانی‌تر تـۆوی سـەرەتایی‌ی عیلمانیـەت بـون ئەگـەرچی بـەمانای وشـە عیلمـانی نـەبون چونکـە نیشتمانپەروەرێتی‌و دڵسۆزییان بۆ فریاکەوتنی دەوڵەتەکەیانو رزگارکردنی لەو هەمو ئاشوبو پشێوی‌و قەیرانانەی دوچاریان بـوە، هـانی دان بەئاشـکرا داوا بکەن سیاسەتی دەستوری‌و کارگێڕی لەسـەر مۆدێلـی لـبرالیزمی ئـەوروپایی پەیڕەو بکرێ.

کەواتە ئەمە قۆناغی یەکەمی دزەکردنی بیروباوەڕی عیلمـانی بـور کـەوەك ئەمین حەسەن عومەر ساغی کردۆتەوە، بەهۆی هەندێ لاوی عوسمانییەوە پەیدا

بوو. شۆڕشگێڕترین گروپ لەو دەستەیە بەپێویستی دەزانی پیاوە نەخۆشەکە کەمترین بڕی کەلتوری رۆژئاوایی وەرگرێ تا هێزی دێتە بەرو چاك دەبێتەوە.

ب-قۆناغی دوەم:

ئەم قۆناغە پاش سیاسەتی کەمترین بڕ بەرۆژئاوایی کردنو عیلمانیەت هات. بەلاّم ئەم سیاسەتە شکستی خوارد بەهۆی تۆکمەییو کۆنەپەرستیی سولّتان عەبدولحەمیدەوە کە هیچ کەمتەرخەمیی نەکرد لەدژایەتی کردنی((بیرکردنەوەی مەترسیداری)) لاوە عوسمانییەکانو بەدرێژاییی سی سالّی دەسەلاّتی رەها بۆ ئەوە کاری کرد تا دلّنیا بێ لەوەی کەلیبرالیزمی سیاسیو ریفۆرمی کۆمەلاّیەتی دەرفەتیان نابێ لەتورکیا سەر دەربێننەوە، بەلاّم سولّتان عەبدولحەمید لەگەلّ ئەوەشدا نەیتوانی هەمو دەرووەکانی روەو رۆژئاوا داخات چونکە خۆی هەولّی دەداو دەیویست خوێندنی سوپاییی تورکیا وەك خوێندنی رۆژئاوایی لیّ بکا بەلاّم لەتەنگەبەرترین سنوری پیشەکەدا. دواتر پاش ئەوەی ئەو لاوە تورکانە بۆیان لوا فێری زمانە ئەوروپایییەکان بن بۆ خوێندنی کتێبەکانیان، ساغ بۆوە کەمەحالّە لەبیری سیاسیی رۆژئاوایی دابڕدرێن. بەجۆرە، خوێندکارانی سوپا بەهۆی ئەوەی کەبۆیان رێککەوت پەیوەندی بەبیروباوەڕی ئەوروپاییەوە بکەن، لەئایندەدا بونە رابەرانی شەپۆلی بەتینو تاوی رۆژئاواگەرایی کەئالاّ هەلّگرەکانی کۆمەلّێك ئەفسەر بون[١٢].

هەولّی لاوانی عوسمانیی روناکبیر وەك یەکەمو بنچینەی قۆناغی رێ خۆشکردن دەژمێردرێ کە رێی بە بیروباوەڕی عیلمانی دا جیّیەك بۆ خۆی لەناو ژینگەی عوسمانیدا بکاتەوەو دوا بەدوای ئەمە هەولّی ئەفسەران دەستی پیّکرد کەهەنگاوی هەڕاوی بۆ پێشەوە نا ئەگەرچی سولّتان عەبدولحەمیدی دوەم هەولّی داخستنی هەمو ئەو کونو کەلەبەرانەی دا کەئەم بیروباوەڕانە دزەیان لێوە دەکرد.

هەولّی گروپی دوەم، یەکەم هەولّە لەجیهانی ئیسلامدا بۆ بەعیلمانیکردنی کۆمەلّو دورخستنەوەی ئاین لەویژدانی زۆربەی توێژەکانی کۆمەلّ. بێگومان چەندەها فاکتەر هەیە کەبونە هۆی ئاسانکردنو

بەخێراکردنی هێنانە دیی ئەم ئامانجە کەهەندێکی فاکتەری خۆیی‌یەو پەیوەندیی بەهەرەسهێنانی ناوخۆیی‌ی دەوڵەتی عوسمانییەوە هەیە لەکۆتایی‌ی ژیانیدا وەك لەمەوبەر ئاماژەمان پێ داو لەئاکامدا دەوڵەت لەکۆنترۆڵکردنی سەرزەمینەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی کلۆڵی‌و بێ دەرەتانی‌ی نواندو هەندێکیشی فاکتەری دەرەکی‌یەو پەیوەندیی بەپەرەسەندنی دەسەڵاتی ئەوروپاوە هەیە کە لەدواییدا توانی هەڵ بکوتێتە سەر پیاوە نەخۆشەکەو میراتەکەی دابەش بکات.

## ٢-روخسارەکانی عیلمانیەت لەسایەی ریفۆرمە کەمالیستەکاندا

ئاینی ئیسلام وەك بەشێك لەیادەوەریی کۆمەڵی عوسمانی‌و مەرجەعیەتە بنچینەیی‌یەکەی لەهەمو بوارەکانی ژیاندا مایەوە، جگە لەوەی کەتەنانەت لەقۆناغەکانی دوایی‌ی تەمەنی دەوڵەتی عوسمانیشدا وەك هێزێکی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی مایەوەو بەقەد ئەم توانایەو بەقەد شۆڕبونەوەی بەناخی کۆمەڵدا، ریفۆرمە کەمالیستی‌یەکان هەوڵی ونکردنیان داو ویستیان پرنسیپەکانی عیلمانیەت لەجێی دابنێن.

ئامانجی سەرەکیی ریفۆرمە کەمالیستی‌یەکان دورخستنەوەی ئاینی ئیسلام بوو لەنواندنی هەر رۆڵێك لەژیانی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی لەناو کۆمەڵی تورکدا. ئنجا بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، سەرانی ریفۆرمە کەمالیستی‌یەکان چەند هەنگاوو کردەوەیەکیان جێبەجێ کرد کەچوار روخساریان بەخۆوە گرت:

١-عیلمانیەتی هێمایی: کە لەریفۆرمە کەمالیستییەکاندا دورایی‌یەکی گرنگی پەیدا کردبوو و لەدو هەنگاودا دەرکەوت:

-هەنگاوی یەکەم: بریتی بوو لەهەڵوەشاندنەوەی خەلافەت لەساڵی ١٩٢٤دا لەو روانگەیەوە کەخەلیفە هێمای یەکپارچەیی‌ی موسڵمانان‌و رەمزی شەرعیەت بوو و دامەزراوی خەلافەت ماناو بەهایەکی رەمزی‌ی هەبو کە کاریگەریی لەسەر موسڵمانان بەگشتی زۆر بوو.

-هەنگاوی دووەم: بریتی بوو لەپرۆسەی ریفۆرمی زمان کە بەچەند کردەوەیەك دەستی پێ کرا گرنگترینیان گۆڕینی نوسین بوو بەپیتی عەرەبی بۆ

...سین بەپیتی لاتینی لەساڵی ١٩٢٨داو سەپاندنی بەتورکی کردنــی قورئــان‌و ...دەغە کردنی بانگ بەزمانی عەرەبی‌و پەیڕەوکردنی ڕۆژژمێری گریگۆری.

٢-عیلمانیەتی دەستوری: ئەم شێوەیەی عیلمانیەت بــۆ ئــەوە داهێــنرا تــا ...مری دەستوریی ئیسلام نەهێڵێ‌و هیچ ڕۆڵێکی لەکاروباری دەستوریی کۆمەڵی ...ولدا نەمێنێ. هەڵوەشاندنەوەی خەلافــەت لەســاڵی ١٩٢٤دا لــەم بارەیــەوە ...ەکەم هەنگاوی بەرایی بوو. دەستوری ریفۆرمـــە کەمالیستـی‌یەکان وای بــاس ...ردبــو کەدەســەڵاتی دەســتوری شــەرعیەت لەچــەمکی ســەروەریی نەتـــەوەوە ...وەردەگرێ نەك لەویستی خواوەندەوە، هەروەها لەساڵی ١٩٢٨دا خاڵی ســێیەمی دەستوری ساڵی ١٩٢٤ لابرا کەئیسلامی بەدینی دەوڵەت دانابو.

٣-عیلمانیەتی سیاسی: ئەمەش لەوەدا بــەڕونی دەردەکــەوێ کــە لــەبواری دادوەری‌و خوێندندا هیچ ڕۆڵێکی ئاینی بۆ سوڵتان نەهێڵدرایەوەو چــەندەها ڕێ‌و ڕەسمی کۆن بەچەند ڕێ‌و ڕەسمێکی نوێ گۆڕدرانەوە کەروخســاری ڕۆژئــاوایی زاڵ ...و بەسەریاندا.

٤-عیلمانیەتی یاسایی: ئەمەش بەسەپاندنی سستمی تەنزیمات دەستی پێ کرد بەڵام سەرەڕای ئەمە هەندێ لەدەقە یاسایی‌یەکانی وەرگــیراو لەشــەریعەتی ئیسلام دەستبەکار مانەوە شانبەشانی بڕیاری حکومەتی کەمالیست ســەبارەت بــەپیادەکردنی یاســای مــەدەنی‌ی سویســرە، یاســای تــاوانی ئیتالیــاو یاســای بازرگانیی ئەڵمانیا بەهەندێ دەستکاریی کەمەوە کە کاریان نەکردە سەر یاســا هاوردەکان[١٣].

### سێیەم: پێکهاتەکانی ڕەهەندی ئیسلامی

#### ١-کاردانەوەی ڕەهەندی ئیسلامگەرا بەرامبەر بەهەڵسوکەوتی ڕەهــەندی عیلمانی

هەڵسوکەوتی ڕەهەندی عیلمانی لەســەردەمی جێبــەجێ کردنــی ریفۆرمــە کەمالیســتییەکاندا-کــەزیانێکی زۆریــان بەموســڵمانان گــەیاند، هــەم لــەو سەردەمەداو هەم لەسەردەمی پاشــتردا-بەگشــتی روخســاری دژایــەتی کردنــی

ئاینی پێوە دیار بوو. بەرامبەر بەمە، لەگەڵ روخاندنی خەلافەتدا کە کاریگەریی قوڵی لەسەر دەرونی موسڵمانانیدا بەجێ هێشت کاردانەوەی ئیسلامی بەشێوەی پێکهێنانی چەند گروپێکی ئاینیی تایبەت گوزارشتی لەخۆ کرد. لەگەڵ ئەم روخانو هەرەسهێنانە کتوپڕەی هێمای ئیسلامدا- کەسەدەها ساڵ بەسەر بڵندی مایەوە-کۆمەڵێك پرسیار هاتنە ئاراوە سەبارەت بەپێویستیی کۆبونەوە لەدەورو خولی هێمایەكو لەم سەروبەندەدا هەر گروپێك بەهەڵەداوان دەورو خولی گەورەی خۆیان داو بەهێمای خەلیفەی دانا. بەجۆرە هەر گروپێك کەپەرەی دەسەندو ژمارەی لایەنگرو پشتیوانانی زیادی دەکرد، خۆی لەخۆیدا دەبو بەقەوارەیەکی سەربەخۆو هەر هەموشیان پێکەوە ئەوەیان لێ پێك هات کەپێی گوترا: رەهەندی ئیسلامگەرا.

کاردانەوەی بەهێزی موسڵمانان بەرامبەر بەریفۆرمە کەمالیستییەکان کۆمەڵێك دەستەو دەزگاو کەسی گرتەوەو ئەم کاردانەوانە کاردانەوەی جیاواز بونو بەپێی لایەنەکان دەگۆڕانو لایەنەکان بریتی بون لەوەزارەتی کاروباری ئاینو زاناکانو شێخەکانی تەریقەتە سۆفییەکانو هەندێ کەس.

بەشێوەیەکی گشتی، دەکرێ کاردانەوەکان بکرێن بەسێ جۆرەوە:

-کاردانەوەی یەکەم: کەرادیکاڵ بوو و لایەنگرەکانی داوای بەرپەرچدانەوەی حکومەتو راپەڕینییان کرد لەدژی سیاسەتە ریفۆرمیستییەکان.

-کاردنەوەی دوەم: لایەنگرەکانی داوایان کرد پێی رازی بن چونکە ئەوەی رویدا قەدەرەو موسڵمان هەر ئەوەندەی لەدەست دێ سەبر بکا.

-کاردانەوەی سێیەم: لایەنگرەکانی بەشێکی سیاسەتەکانی دەوڵەتی کەمالیستیی مۆدێرنیان رەت کردەوەو لەهەمان کاتدا رازی بون لەگەڵ کردەوەو سیاسەتەکانی تریدا بژین. ئەمەش بەشێکی زۆری پێکهاتەکانی کۆمەڵی تورکیای گرتەوە وەك جۆرەها تەریقەتی سۆفیو کەسانێك کە بۆ ئیسلام بەپەرۆش بون.

لەنێو کاردانەوەی سێیەمدا کۆمەڵێك تەریقەتی سۆفیگەریو گروپی ئیسلامگەرا بەدی دەکەین. گرنگترین تەریقەتە سۆفییەکان تەریقەتی

نەقشبەندی، مەولەوی، جەراحیو قادرییە. کۆنترینیشیان تەریقەتی نەقشبەندییە کەلایەنگرانێکی زۆری هەبوو و ئێستاش هەیەتی لەچەندەها شاری تورکیا. گروپە ئیسلامگەراکانیش ئەوە زۆربەی هەرە زۆریان وەك بەرەنجامێکی ریفۆرمە کەمالیستییەکان دەرکەوتن لەجۆری بیرکردنەوەو هەلسوکەوتو چۆنێتیی کارکردنیدا لەگۆڕەپانی تورکیا بەکۆمەڵو دامو دەزگاوە، جیاوازییان لەگەڵ یەکتریدا هەبوو. ئێمەش وای بۆ دەچین کە ئەم گروپانە ناو بنێین گروپی ئیسلامگەرای خاوەن دوراییی پەروەردەییو فیکریو لێرە مەسەلەکە پەیوەندیی بەگروپی نورەوە هەیە کەدەچێتەوە سەر شێخ بەدیعوززەمانی نەورەسیو گروپی نەشیکشیکیو گروپی سلێمانی. ئەم گروپانە بەتەواویو بەشێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندییان بەژیانی سیاسییەوە نەکرد بەقەد ئەوەی لەرێگەیەکی ترەوە بەشدارییان لەسیاسەتدا کرد، ئەویش بەپشتیوانی کردن لەفلانو فیسار حزب بەرامبەر بەهەندێ قازانجی دیاریکراو.

بەلام جگە لەمانە گروپێکی تریش هەبو پێی دەوترا بزوتنەوەی بۆچونی نیشتمانی بەسەرکردایەتیی نەجمەددین ئەربەکان کەبیرکردنەوەکەی نزیکترین بیرکردنەوە بوو لەبیرکردنەوەی رێکخستنی ئیخوان موسلمینو ئەم گروپە لەگرنگترین گروپە ئیسلامگەراکانە لەسەر ئاستی مەیدانی سیاسیی تورکیاو ئەم گروپە - بەپێی رێبازە گشتلاییو هەمەگیرەکەی لەپرۆسەی گۆڕیندا- لەهەناویدا ئەزمونێکی سیاسیی ئیسلامگەرا گەلالە بوو کە بەهۆیەوە رۆلێکی کاریگەری لەسەر ئاستی سیاسی گێراو ئێستاش خەریکی گێرانی ئەم رۆلەیە.

## ٢-ئەزمونی سیاسیی ئیسلامیو هەولەکانی دامەزراندن

ئەو هەلومەرجەی ژیانی سیاسی کەپاش پەسەندکردنی سستمی فرە حزبی هاتە پێش، رێی بۆ چەند هەولێکی سەرەتایی بۆ دروست کردنی حزبی ئیسلامی خۆشکرد کە راستەوخۆ گوزارشت لەهەستو روخساری

ئیسلامگەرایی بکەن. بەمجۆرە، لە ١٩ی تەموزی ١٩٤٦دا نەجمی کوناش‌و مستەفا ئۆزبەك حزبی پاراستنی ئیسلامیان پێك هێناو لە ١٢ی ئەیلولی هەمان ساڵدا کاربەدەستانی تورکیا حزبەکەیان داخست بەو بیانووەی کەحزبەکە ئاینی کردۆتە ئامرازی سیاسەت. لە ٨ی تەموزی ساڵی ١٩٤٧دا جەواد رەفعەت ئەتیل خان کەبەدژایەتی کردنی جولەکەو زایۆنیزم ناوی دەرکردبوو و خۆیشی کۆنە جەنراڵێکی سوپای تورك بوو، خۆی‌و چەند هەڤاڵێکی، پارتی پارێزگارانیان دروست کردو لەبەرنامەی حزبەکەدا باسی ئەوەیان کرد کەحزبەکە پەیڕەوی لەبنەمای ئیسلامی دەکا. کاربەدەستانی تورکیا بەر لەوەی حزبەکە دەست بەکار بێ، دایانخست. پاشان مارشال فەوزی چەقماق-کەیەکێ لەدەسکەلاکانی مستەفا ئەتاتورك بوو لەکۆنترۆڵ کردنی سوپاو کاروباری وڵاتدا-خۆی‌و چەند کەسێکی راستڕەوی موسڵمان لە ٢٠ی تەموزی ١٩٤٨دا حزبێکی راستڕەویان بەگیانی ئیسلامگەرا بەناوی پارتی گەلەوە دروست کرد. لەبەرنامەی ئەم حزبەدا هاتبو کەحزبەکە ڕێز لەداب‌و نەریتی وڵات‌و ئیسلام دەگرێ بەڵام ئەم حزبەش دەوڵەت لەساڵی ١٩٥٣دا هەڵی وەشاندەوە گوایە حزبێکە دانوی لەگەڵ ئەو سستمە کۆمارییەدا ناگونجێ کە کەمال ئەتاتورك دایمەزراندووە.

وەك بینیمان، هەستی ئیسلامگەرایی لەسەرەتادا نەیتوانی ڕێچکەیەك بەشێوەی حزبێکی سیاسی‌ی یاسایی‌ی دانپێدانراو پیادە بکا، ئەو تێبینی‌یەی لەم چوارچێوەیەدا جێی سەرنج‌و تێڕامانە ئەوەیە کەخەڵکانێکی ناو دامەزراوی سوپا بونە سەرمەشقی رابەرایەتی کردنی پرۆسەی بەعیلمانی کردن لەکۆتایی‌ی رۆژانی دەوڵەتی عوسمانیدا. ئایا بەڕێکەوت بوو خەڵکانی ناو خودی دامەزراوی سوپا ببنە سەرمەشقی بڵاوکردنەوەی بانگەواز بۆ ڕێزلێنانەوەی ناسنامەی ئیسلامییانەی کۆمەڵی تورکیاو هەوڵی بێ وچان بدەن بۆ دامەزراندنی حزبی ئیسلامی؟ لێرە جیاوازییەکە لەوەدایە کەپرۆسەی بەردەوامبون لەسەر بڵاوکردنەوەی بانگەواز بۆ سەرلەنوێ هێنانەوەی ئیسلام بۆ ناو کۆمەڵی تورکیا دەبێتە ئەرکی سەرشانی نوخبەی ئیسلامگەرای روناکبیری

کۆمەڵی مەدەنی، واتە بەپێچەوانەی ئەوەی کە لەگەڵ پرۆسەی بەعیلمانی کردندا رویدا کەتێیدا روناکبیرانی نوخبەی عوسمانی سەرمەشقی دامەزراندنی عیلمانیەت بون وەك نامق کەمالو زیا پاشا بەلام ئەوانەی بەردەوام ئەو عیلمانیەتە دەپارێزن ئەفسەرانو جەنراڵەکانی دامەزراوی سوپان.

### ٣-ئەزمونی سیاسیی ئیسلامگەراو هەوڵی دزەکردن بۆ ناو حزبە باوەکان

شکستی هەوڵدانی ئیسلامگەرا بۆ دۆزینەوەی دەروبەك بۆ دروست کردنی حزبێك کەپشت ئەستور بێ بەمەرجەعیەتی ئیسلامی، رێی لەوە نەگرت کە ئیسلامگەراکان دزە بکەنە ناو ئەو حزبانەی کەهەن بەڵکو ئەو حزبانە بتوانن گوزارشت لەبیرو دیدو تێروانینو ئاواتیان بکەن، بەتایبەتی لەگەڵ سیاسەتی کرانەوەدا کەهەندێ لەحزبەکان بەرامبەر بەرۆڵەکانی رەوەندی ئیسلامگەرا پەیڕەویان کرد. لایەنی سەیرو سەمەر لەوەدا بوو کە پارتی گەلی کۆمار، تاکە حزبی دەسەڵاتدار پێش بڕیاردان لەسەر سستمی فرەیی‌و رابەرو پێشەوای ریفۆرمە کەمالیستی‌یەکان، سەرمەشقی سیاسەتی کرانەوە بوو و بەهۆی ئەم سیاسەتەوە چەمکی کلاسیکی‌ی عیلمانیەتی گۆڕی کەدروشمی حزبەکە بوو. ئەم حزبە لەساڵی ١٩٤٧دا چەند هەنگاوێکی هەڵهێناو لەیەکێ لەکۆنگرەکانی‌دا وای دانا کەئاین خۆراکی روحی‌ی کۆمەڵە. لەو هەنگاوانە:

- کردنەوەی خول بۆ دەرچواندنی مەلاو خەتیب.
- کردنەوەی کۆلێجی ئیلاهیات لەئەنقەرە.
- کردنی ئاین بەدەرسێکی ئارەزومەندانە لەقۆناغی سەرەتایی‌دا.
- ئاسانکردنی چون بۆ حەج.

ئەوەی لەهەموان زیاتر سودی لەم سیاسەتی کرانەوەیە وەرگرت پارتی دیموکرات بوو کە بەیەکەم حزبی بەرهەڵستکاری پارتی کۆمار دادەنرێ‌و رابەری ئەوسای عەدنان مەندرێس بوو کەیەکێ لەرابەرانی پێشوی پارتی کۆمار بوو و بەوە ناسرابوو کەبیرکردنەوەیەکی لیبرالی هەیەو خۆی لەوە دەپارێزێ کە بەئاشکرا دژایەتی‌ی هەستی ئیسلامی بکا.

لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٠دا تای تەرازوی ئەو حزبە سەنگینتر بوو کە ئاین توخمێکی بەهێز بوو لەپرۆژەو داواو ریفۆرمەکانیدا. پارتی دیموکرات بەسەرۆکایەتی‌ی مەندرێس لەحزبەکانی‌تر زیاتر مشورخۆری ئەو ریفۆرمانە بوو و لەگەڵ ئەم حزبەدا ئیسلام بۆ ژیان گەڕایەوە لەساڵانی پەنجادا ئەویش بەکۆمەڵە هەنگاوێك، کە لەکاتی بونی بەدەسەلاتدار، نران، وەك رێدان بەبانگدان بەزمانی عەرەبی، نەهێشتنی یاساغی سەر پرۆگرامە دینی‌یەکان، خوێندنی وانەی ئاین لەقۆناغی ناوەندیدا، دروست کردنی مزگەوت‌و دابین کردنی چەترێکی یاسایی بۆ ئامۆژگاکانی مەلاو خەتیبانی مزگەوتەکان، بەڵام لەبەرامبەریشدا ئەم حزبە رازی نەبو هیچ حزبێکی ئیسلامی سەر دەربێنێ لەترسی ئەوەی ئەوەك ئەو کەرتە ئیسلامی‌یە پان‌و پۆڕەی لێ بسەنێتەوە کەبنەما جەماوەری‌یەکەی پێکدەهێنا، جگە لەوەی کەزۆر بەپەرۆش بوو بۆ بەدی هێنانی تەرازویەك لەنێوان هەردو مەیلی ئیسلامگەراو عیلمانی. ئەم حزبە لەڕەوتی پاراستنی مەیلی عیلمانیدا، هەندێ هەنگاوی گرنگی جێبەجێ کرد بەڵام ئەو هەنگاوانە دادیان نەداو وایان لێ نەکرد رەزامەندیی پارێزەرانی عیلمانیەت بەدەست بهێنێ چونکە ئەو پارێزەرانە لەگەڕانەوەی روخسارە ئیسلامییەکان بەڕونی بۆ ژیانی تورکیا پەست‌و بێزار بوون‌و لەئاکامدا یەکەم کودەتای سوپا لەمێژوی تورکیا لەئایاری ساڵی ١٩٦٠دا لەژێر ناونیشانی ((پاراستنی عیلمانیەت))دا هەڵایساو کوشتنی عەدنان مەندرێسی رابەری پارتی دیموکراتی لێ کەوتەوە.

دوا بەدوای کودەتا سوپایی‌یەکەی ساڵی ١٩٦٠ ئارامییەکی سیاسی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشاو پاشان هەندێ هەنگاوی یاسایی‌ی تر نرا بەمەبەستی دەستەبەرکردنی برێکی دیاریکراوی ئازادیی بزوتن‌و رێکخستن. گرنگترین ئامانجەکانی ئەو هەنگاوانە سڕینەوەی ئاسەواری ئەو گرژییە سیاسییە بوو کەپاش کودەتاکە باڵی بەسەر گۆڕەپانی سیاسیی تورکیادا کێشا. لەو قۆناغەدا چەند حزبێك دروست بون کەتیایدا هەندێ حزب هەبو بۆچون‌و تێڕوانینی ئیسلامگەرا مەرجەعیەت‌و سەرچاوەیان بوو.

بەجۆرە تێبینیی ئەوە دەکەین کەروالّەتو هەستی ئیسلامگەرا لەنێوان دو سیاسەتدا مانۆری دەکرد:

١-سیاسەتی پاکتاوکردنو ڕەتکردنەوە بەرامبەر بەریفۆرمە کەمالیستییەکان (١٩٢٣-١٩٤٥).

٢-سیاسەتی لەخۆگرتنو سود لیّ وەرگرتن لەلایەن حزبە عیلمانییەکانەوە (١٩٤٦-١٩٦٩).

ئەم سیاسەتەش درێژەی کێشا تا ڕەوتی ئیسلامگەرا لەدواییدا هەندیّ حزبی دۆزییەوە کەتوانییان بەئاشکرا دەنگ هەلّبڕنو داواو خواستەکانیان بخەنە نێو چوارچێوەوە.

## ٤-سەرەتای ئەزمونی ڕەهەندی ئیسلامگەرا: بزوتنەوەی موسلّمانە سەربەخۆکان

نەجمەددین ئەربەکان بەیەکیّ لەستونەکانی بزوتنەوەی بۆچونی نیشتمانی دادەنریّو لەهەلّبژاردنی سالّی ١٩٦٩دا لەزێدگای خۆی، قۆنیە، بەناوی پارتی دادەوە، کەجێی پارتی دیموکراتی گرتەوە ناوی کەوتە لیستی پالّێوراوانەوە بەلاّم ئەو ڕازی نەبوو و ویستی بەسەربەخۆیی بچێتە هەلّبژاردنەوەو لەپارێزگای قۆنیە سەرکەوتنی بەدەست هێنا، هەروەها چەند برادەرێکی لەپارێزگاکانی تر سەرکەوتنیان بەدەست هێناو پێکەوە لەناو پەرلەماندا فراکسیۆنێکیان بەناوی بزوتنەوەی موسلّمانە سەربەخۆکانەوە پێك هێنا.

سەرکەوتنی ئەربەکان دەروازەیەك بوو بۆ وێستگەیەکی گرنگو مێژوویی لەڕەوتی بگرەو بەردەی نێوان عیلمانییەکانو ئیسلامگەراکان، هاوکات لەگەلّ بوژانەوەی ئەو نوسینانەی بانگەشەیان بۆ دامەزراندنی دەولّەتێکی ئیسلامی دەکرد. لەهەمان کاتدا هەستو نەستی ئیسلامگەرا تا دەهات زێدەتر لەسەر گۆڕەپانی تورکیا بەرچاودەکەوت بەوە گەیشتە لوتکە کەئەربەکان یەکەم پارتی ئیسلامگەرایی کەپارتی ڕژێمی نیشتمانییە، دامەزراند. ئەم پارتە بوە ڕوی سیاسیی بزوتنەوەی بۆچونی نیشتمانی کەهێشتا بەشێوەی ڕێکخستنێکی

دیاریکراوی یاسایی (لیگـال) پێـك نـەهاتبوو. بـەجۆرە، بزوتنـەوەی بۆچونـی نیشتمانی لەگـەڵ دامـەزراندنی یەکـەم گـروپ کەمەرجەعیـەتو تـیۆروانینی لەئیسلامەوە سەرچاوە دەگـرێ، بـەکردەوەو راسـتەوخۆو بەشـێوەیەکی یاسـایی کەوتە چالاکیی سیاسیو پاش ئەو حزبەش چەندەها حزبی تر دروست کران وەك پارتی سەلامەی نیشتمانی لەساڵی ١٩٧٢داو پـارتی رەفـا لەسـاڵی ١٩٨٣داو پارتی فەزیلەو دواتریش پارتی سەعادەت لەساڵی ٢٠٠١دا کە لەم دواییـیـەدا نەجمەددین ئەربەکانی بەسەرکردەی خـۆی هـەڵبژاردەوەو دواتریـش پـارتی دادو پەرەپێدان کەئەویش لەساڵی ٢٠٠١دا دامەزرا.

لێرەدا گرنگە ئاماژە بۆ ئەوە بکـەین کەئـەم ئەزمونـە لـەم هەلومەرجـەی ئەمرۆدا بەدو رێچکەدا دەروا:

أ-رێچکەی یەکەم: رێچکەی دیدە کۆنەکـە کـە لەگـەڵ یەکـەم ئـەزمونی حزبایەتیدا، واتە ئەزمونەکەی پارتی رژێمی نیشـتمانی، سـەری دەرهێنـاو تـا ئەمرۆ خۆیو ئـەزمونی پـارتی سـەعادە لـەژێر سـەرکردایەتیی ئەربـەکاندا بەردەوامە.

ب-رێچکەی دوەم: رێچکەی دیدێکی نوێیە کەپاش ئـەزمونی پـارتی رەفـا بەرە بەرە گەلاڵـە بـوو و ئـەمرۆ خـۆی لەئـەزمونی پـارتی دادو پـەرەپێداندا بەرجەستە کردوە. ئەزمونی ئەم رێچکەیە رەوەندێکیتر دەردەخا کەبەهۆی چەند فاکتەرێکەوە رێی خۆی گرتە بـەرو رێچکەیـەکی نوێـی لێ پێکـهات لـەرەوتی ئەزمونی بزوتنەوەی ئیسلامگەرای تورکیـادا. هـەردو رێچکـەی کـۆنو نـوێی ئەزمونی سیاسیی ئیسـلامگەرا ئـەو لایەنـە دیـارو بزوێنـەرەی ململانێکـەن لەتورکیا.

## چوارەم: هاوکێشە پەنهانییەکانی ململانێی نێوان هەردو رەوەندی ئیسلامگەراو عیلمانی

پاش دامەزراندنی کۆماری تورکیا نوخبەی کەمالیست چوار گرفتی هاتـە بەر رێ:

-گرفتی یەکەم: پەیداکردنی ناسنامەیەکی نیشتمانیی گونجاو بۆ هەلومەرجی تورکیا کە رەگوریشەیەکی ئیسلامییانەی هەیە.

-گرفتی دووەم: دروست کردنی ساختمانێکی سیاسی کە لەگەڵ ناسنامە پێشنیارکراوەکەدا بگونجێ.

-گرفتی سێیەم: چارەسەرکردنی مەسەلەی مۆدێرنیزەکردنو هەنگاونان بەتورکیا بۆ پێشەوە بۆ گەیشتن بەکاروانی یەکێتیی ئەوروپا.

-گرفتی چوارەم: یەکلاکردنەوەی چەمکی دیموکراسی.

سەبارەت بەگرفتی یەکەم، نوخبەی کەمالیست هەولێدا ناسنامەی تورك لەچوارچێوەی قاڵبی ((تورکیای ئەناتۆلیایی)) دابڕێژێتەوەو سەبارەت بەگرفتی دوەمیش پێکهاتەی سیاسی لەسەر بنچینەی کۆمارخوازی دامەزرا. پرۆسەی مۆدێرنێزەکردنیش کە کرۆکی گرفتی سێیەم بوو، ململانێی هەرێمەکانی بەقازانجی دامەزراوی سوپاییو بیروکرات یەکلا کردەوەو هەروەها ململانێی هەرێمەکانی لەدوراییە هەیکەلییەکەیدا بەقازانجی ناوەند یەکلا کردەوە، ئەگەرچی نرخێکی گرانیشی دا کەخۆی لەسەرکوت کردنی بێ بەزەییانەی هەر داوایەکی جیاخوازیدا نواند، بەتایبەتی لەناوچە کوردنشینەکاندا.

سەبارەت بەگرفتی چوارەمیش، ئەو گرفتە بەهەڵپەسێردراوی مایەوە چونکە نوخبەی سوپاییو بیروکراتی دەسەلاتدار-واتە نوخبەی دەولەت-شێوازێکی هەڵسوراندنو رێکخستنی بەمیرات بۆ مابۆوە کەریشەکەی دەچۆوە سەر سەردەمی عوسمانییەکان بەلام توانی بەرگێکی ئایدیۆلۆژیی مۆدێرن بکاتە بەر ئەم شێوازەو چەمکی ((سەر)) بۆ دیموکراسی پیادە بکا بەو پێیەی کەدیموکراسی مەسەلەیەکی تایبەت بەلێپرسراوەتیی سیاسییەو مەرج نیە بەمانای بەشداریی سیاسی بێ. ئەمەش دیدو تێروانینی هەر سێ حکومەتی سوپایی بوو سەبارەت بەدیموکراسی لەجەنگی دوەمی جیهانەوەو هەر کات لادان لەو دیدو تێروانینە رویدابایە سوپا خۆی لەمەسەلەکە دەگەیاند بۆ کۆنترۆڵ کردنی دیموکراسی تاکو گونجاوتر بێ لەگەڵ چەمکی پێشینو پاشان خێرا دەگەڕایەوە بۆ ناو کامپەکانی خۆی.

لەگەڵ پەسەندکردنی سستمی فرەیی‌دا، پێکادان رویدا لەنێوان ((نوخبەی دەوڵەت))و بۆچونەکانی ((نوخبەی سیاسی)) کەجۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ گروپە کۆمەڵایەتییەکاندا پەیدا کردبوو و لەم بووارەدا هەندێ لەنوخبەکان‌و هەندێ لەگروپە کۆمەڵایەتییەکان پێشوازییان لێ کرد.

نوخبەی سیاسی کە لەپەرلەمانتارە هەڵبژێردراوەکان پێك هاتبو، خۆی بەنوێنەری گەل دادەناو بەڕونی جەختی لەسەر چەمکی ئاسۆیی‌ی دیموکراسی، بەو پێیەی کەبەشداریی سیاسییە، کرد.

لێرەدا خۆمان لەبەردەم دو توخمی یەکلاکەرەوەی پێکهاتەی سیاسی‌و دەستوریی دەوڵەتی مۆدێرنی تورکیادا دەبینینەوە:

أ-توخمی یەکەم: لەدامەزراوی سوپا پێکدێ‌و دیدێکی تایبەتی هەبو سەبارەت بەبنیاتنانی دەوڵەت‌و ئەو دیدەش بەهۆی چەند قاڵبێکی یاسایی‌یەوە هەیی.

ب-توخمی دوەم: توخمی دەوڵەتگەرایی (Etatism) بوو کە لێ نەدەگەڕا هیچ چەشنە جیاوازی‌و ناکۆکییەك سەبارەت بەئەرك لەناوخۆی رژێمی سیاسیدا لەنێوان مەسەلە تایبەت‌و گشتییەکاندا پەیدا ببێ. سەرەتا ململانێکە بەقازانجی نوخبەی دەوڵەت یەکلا کرایەوە کەخۆی بە ((میراتگری)) نەریتە عیلمانییەکان دەزانێ.

پەسەندکردنی سستمی فرە حزبی لەتورکیاو مشتومڕی پێشوی نێوان نوخبەی دەوڵەت‌و نوخبەی سیاسەت بووە هۆی کرانەوە بەڕوی هەمو هێزە ناوخۆیی‌یەکانی تورکیاو ئەم کرانەوە سیاسییە بۆ رەهەندی ئیسلامگەرا سودی دەبێ‌و لەم رەوتەدا رەهەندی ئیسلامگەرا لەکۆتایی‌ی شەستەکان‌و سەرەتای حەفتاکاندا زۆر جموجۆڵ دەنوێنێ‌و لەناو هەناوی ئەم رەهەندەدا نوخبەیەکی سیاسی‌ی ئیسلامگەرا پەیدا دەبێ کەنەك هەر داوای مافی بەشداری کردن لەپرۆسەی سیاسەتدا دەکا بەڵکو هەروەها داوای دابەشکردنی خودی دەسەڵاتیش دەکا. ئەمەش وای کرد نوخبەی دەوڵەت روبەڕوی هەڕەشەیەکی راستەقینە ببێ، بۆیە ئەم نوخبەیە هەمو هەوڵ‌و رەنج‌و تەقەللای خۆی بەگەڕ

خست بۆ بنکۆڵ کردنی تەلاری ئـەم نوخبـە هەڵسـوڕاوە لـەڕێی پـەیڕەوکردنی سیاسەتی وشك کردنەوەی سەرچاوەکانیو تەنگەبەر کردنی دەرەتـانی چـالاکیو جموجۆڵو هەڵسوڕانی. لەسەرەتادا بۆ ڕوبەڕوبونەوەی نوخبـە تـازە پیدابووەکـە، هاوکارییەکی ناڕاگەیەنراو لەنێوان نوخبەی دەوڵەتو نوخبەی سیاسەتدا هاتـە دی. ئـەو ڕوبەڕوبونەوەیـەش سـەرەڕای گرتـنو هەڵوەشـاندنەوەی حزبـەکانو ڕاگەیاندنی باری نائاسایی لەوڵاتدا زیاد لەجارێك، ئاماژەیەك بوو بـۆ ئـارەزوی کروپێکی ناو نوخبەی دەوڵەت بۆ هێشتنەوەی چەمکە دێرینەکەی دیموکراسیو کەمارۆدانی هەر لێك نزیکبونەوەیەك کەدەشێ لەنێوان ڕەوەندی ئیسـلامگەراو ڕەوەندی عیلمانیدا روو بدات.

## ١-سستمی فرەیی: سەرەتای کرانـەوەی هـەردو ڕەهـەندی ئیسلامگەراو عیلمانی بەسەر یەکتریدا

پەسەندکردنی سستمی فرە حزبیو دیموکراسی ئاماژەیەکی گرنگ بـوو بـۆ دەست پیکردنی قۆناغێکی نوێی پەیوەندی لەنێوان ئاینو دەوڵەت لەکۆمـەڵی تورکیا بەو ئاڕاستەیەی کەدەشـێ پێـی بگوتـرێ ((ئاڕاسـتەی ئاشـتبونەوە)). دەست پێکردنی قۆناغی لێك نزیکبونەوەی ڕەهەندی ئیسـلامگەراو عیلمـانیو هاتنە کایەی گفتوگۆیـەکی دیموکراتـی لـەنێوانیاندا، سـەرەتای داننـان بـوو بەمافی هەڵسوڕانی کەلتوریو ڕۆشنبیریی هەر لایەك. لەگـەڵ ئـەم داننانـەدا هەر وتارێك لەڕوی پێکهاتەی ئایدیۆلۆژیو سیاسییەوە کەوتە خۆ گونجاندن بـۆ تێپەڕاندنی قۆناغی لێك دابڕان. ئەم دان پێدانانە لەو حکومەتە فرە حزبییانـە ڕەنگی دایەوە کەهەر لایەك لەگەڵ ئەوی تـری پێـك هێنـا لەوانـە حکومـەتی هاوبەشـی نێـوان پـارتی سـەلامەی نیشـتمانیو پـارتی گـەلی کۆمـار بەسەرکردایەتیی ئەجەوید لەساڵی ١٩٧٤داو حکومەتە هاوبەشـەکەی سـاڵی ١٩٩٦ی پارتی ڕەفاو پارتی ڕێگای ڕاست کەحزبێکی عیلمانیی ڕاستڕەو بـوو و ئەوسا تانسۆ چیللەر سەرۆکی بوو.

سەرجەمی ئەو هاوپەیمانی‌یانەی نێوان حزبە سیاسییە ئیسلامگەراکان‌و حزبە عیلمانییەکان لەو نمونانەی کەناومان هێنان، نەك هەر سنوری بۆ بەرنامەکانی هەڵبژاردنی هەردو لا دانا بەڵکو یاخیبونێکی ئاشکراش بوو لەسەرجەمی ئەو چەمك‌و نەریتە کلاسیکی‌یانەی کەزۆربەی هەرە زۆری هەردو ڕەهەند پیادەیان دەکرد. لێرەدا کاتێك لەو گۆڕانە دەکۆڵینەوە کەبەسەر گوتاری سیاسیی هەردو لادا هاتوە، باشتر درك بەمەسەلەکە دەکەین‌و قوڵتر هەستی پێ دەکەین.

## ٢-ئاستەکانی گۆڕانی گوتاری ڕەهەندی ئیسلامگەرا

لەسەر ئاستی ئەزمونی سیاسیی ئیسلامگەرا، دەشێ بگوترێ کەمۆرکی هەڵوێستەکانی ئەزمونەکە بەتایبەتی لەسەرکردایەتیی نەجمەددین ئەربەکان بەرامبەر بەکۆمەڵێك مەسەلە، مۆرکێکی توند بوە. لەچەندەها هەڵمەتی هەڵبژاردنی ئەزمونی سیاسیی ئیسلامگەرادا، بەتایبەتی لەسایەی حزبە کۆنەکانی ئەم ڕەوتەدا، جەخت لەسەر ئەوە دەکرایەوە کەنابێ-لەسەر هیچ ئاستێك-تەنازول بۆ بەرەی عیلمانی‌ی سوپایی یان مەدەنی بکرێ‌و لەم سەروبەندەدا بەئاشکرا هەڵوێستی توند بەرامبەر بەچەندین کێشەی هەرە هەستیار وەرگیرا وەك هاوپەیمانی‌ی ستراتیجی‌ی نێوان تورکیاو ئیسرائیل کەهاوپەیمانی‌یەکە ئەمریکا پێی خۆشەو بەهەمو هێزییەوە پشتیوانیی لێ دەکاو وەك هەڵوێست بەرامبەر بەداموو دەزگا بانکی‌یە نێودەوڵەتییەکان‌و مەسەلەی وەرگیرانی تورکیا لەیەکێتی‌ی ئەوروپاو چەند مەسەلەیەکی ناوخۆیی‌ی تری وەك کێشەی حیجاب.

بەڵام لەڕەوتی ئەزمونە کورتەکەی پارتی ڕەفا لەحوکمڕانی‌ی لەگەڵ پارتی ڕێگای ڕاست لەساڵی ١٩٩٦داو بەر لەوەی ئەم ئەزمونە پاش کەمتر لەساڵێك بەکودەتایەکی سپی‌ی سوپا لەبار بچێ، هەست بەگۆڕان لەهەڵوێستی ئەزمونی سیاسی‌ی ئیسلامگەرا دەکەین. ئەوەی لەکاتی هەڵمەتی هەڵبژاردندا بەرز دەکرایەوە، بەتەواوی هاوجوت نەبو لەگەڵ واقیعدا. ناشڵێین ئەزمونی سیاسیی

ئیسلامگەرا کەوتە نێوان دوو بەرداش، بەرداشی پاراستنی ئەو هەڵوێستانەی کەجەماوەرە زۆرەکەی پێ دڵخۆش دەکراو بەرداشی گوشارو فشاری دەرەکی و ناوەکی و لەسەروی هەمویانەوە گوشاری دامەزراوی سوپا، بەڵکو دەڵێین لەگەڵ هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ پارتە راستڕەوەکەی رێگای راستدا سەرەتای خەفەبونی کوڵ و کۆی ئەزمونەکە دەستی پێ کرد، هەروەها ئەمە لەو کاتەشدا دەرکەوت کەئەزمونەکە سەری دای لەدیوارو کۆمەڵێك کردەوەی ناوخۆیی و دەرەکی ی پێ ئەنجام درا کەبەهۆیانەوە ناچار بوو توندوتیژیی گوتارو هەڵوێستی خۆی کەم بکاتەوە. نکۆڵی لەوە ناکرێ کەئەزمونەکە بەو تەمەنە کەمە توانی شتی گرنگ بۆ کۆمەڵ ئەنجام بدات و بەرین بونی پانتایی ی ئەو شتانە بوە مایەی نیگەرانی و دڵەڕاوکێی دامەزراوی سوپا کەبەدڵی نەبوو و حەزی نەدەکرد رەهەندی ئیسلامگەرا-کەسالآنی ئابلوقەو گرتن و تەنگەبەرکردن و قەدەغەکردن دەستەمۆیان نەکردبوو-بگا بەدەسەلآت، چ جا کەیفی بەپەرەسەندنی ناوبانگی بێ لەناو کۆمەڵدا؟

لەهەوڵدانێکدا بۆ دەربازبون لەهەستیاریی بارودۆخەکە، ئەزمونەکە ناچار بوو خۆی لەهەندێ لەمەرجەکانی دامەزراوی سوپا راپسکێنێ. دامەزراوی سوپا کەنەیویست هەلەکە لەکیس خۆی بدات، بەهۆی کودەتایەکەوە کەپێی وترا کودەتای سپی کەوتە بنکۆڵ کردنی بناغەی ئینتلافەکەو توانی ئەو ئەزمونە لەبار بەرێ کە بە نەسکێکی لێك نزیکبونەوەی رەهەندی ئیسلامگەراو رەهەندی عیلمانی دادەنرا.

دوا بەدوای ئەم قۆناغە، لەنێو ئەزمونە سیاسییە ئیسلامگەراکەدا گفتوگۆی قوڵ کراو بەو سەرەنجامە گەیشت کەپێویستە چاو بەچۆنێتی ی هەڵسوڕاندنی ململانێ سیاسییەکەدا بخشێنرێتەوە ئەویش لەرێی فراوان کردنی پەراوێزی کرانەوە بەروی لایەنەکانی تری سەر گۆڕەپانی سیاسی و سەرلەنوێ ریزکردنەوەی مەسەلە گرنگەکان و کەم کردنەوەی توندوتیژیی گوتاری سیاسی و رێکخستنەوەی نەبەردەکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی بەو جۆرەی کەخزمەت بە بەرژەوەندیی نیشتمان بگەیەنێ و خۆی لەپێك هەڵشاخانی سیاسی لاداو وزەو

تواناکان بەخۆڕایی بەفیڕۆ نەدات. ئەم گفتوگۆ قوڵانەی ناو دەرونی ئەزمونە سیاسییە ئیسلامگەراکە-کەسەرکردەی لاو ڕێبەرایەتی‌ی کرد-بەوە بەئەوەگ گەیشت کەپارتی دادو پەرەپێدان لەدایك بوو کەوەك لەمەوپێش ئاماژەی پێ درا، گۆڕانو وەرچەرخان بوو لەئەزمونی سیاسی‌ی ئیسلامگەرا لەتورکیا. ئەگەرچی زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی ئەم حزبە کادێرە کۆنەکانی ئەزمونە سیاسییە ئیسلامگەراکەن بەڵام ئەندامی واشی تێدایە کەڕیشەو ڕەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر ڕەهەندی عیلمانی.

ڕاستە کۆمەڵێك فاکتەر هەیە ئەو گۆڕانەیان بەزۆر سەپاندوە بەڵام لەهەمان کاتدا شتێکی تریش هەیە کە لەم ڕووەوە سەنگێکی دیاری هەبو ئەویش ئەو لێك نزیکبونە ڕونو ئاشکراو دیارەیە لەنێوان هەندێ لایەنی ناو ڕەهەندی عیلمانی‌و چەند لایەنێکی ناو ڕەهەندی ئیسلامگەرا. لەم لێك نزیکبونەوەیەدا سەرکردایەتی‌ی وا سەری دەرهێنا کەمرونەتێکی سیاسی‌ی باش‌و کارامەیی‌یەکی سیاسی‌ی دیاریان هەیە کەلێی ڕادەبینرێ مۆرکێکی دیموکراتی‌ی نوێ بەئەزمونی دیموکراسی‌ی تورکیا بداو ڕەوتی ئەزمونە دیموکراتەکە بەگشتی بۆ پێشەوە ببا. ئەو لێك نزیکبونەوەیەش کەڕویدا تەنها قۆناغێکی تری دان بەیەکتری نانی هەردولایەو بەکردەوە دەیسەلمێنێ کەپانتایی‌ی دیدو تێڕوانینی هەردولا دەشێ سەرکەوتوانە بەرفراوان بکرێ‌و هەر لایەك دەستبەرداری هەندێ بۆچونو چەمك ببێ‌و واز لەئایدیالیزم‌و شتی خەیاڵاوی بێنێ.

## ٣-ئاستەکانی گۆڕانی گوتاری ڕەهەندی عیلمانی

ژمارەیەك دەنگی خەڵکانی توندڕەوی ناو ڕەهەندی عیلمانی کە بەژمارەیەکی کەم دانانرێ، نیگەرانیی خۆیان لەوە دەربڕی کەڕەهەندی ئیسلامگەرا گەشەی کردوەو لەسایەی ئەزمونەکەی ئەم دواییەی پارتی ڕەفا بەسەرکردایەتی‌ی نەجمەددین ئەربەکان کەیەکەم ڕابەری ئیسلامی بوو لەدەوڵەتێکی عیلمانیدا بگات بەدەسەڵات‌و ئەزمونەکەی پارتی دادو پەرەپێدان

کەبەسەرکردایەتیی رەجەب تەیب ئەردوغان رابەرایەتیی حکومـــەتی تورکیـا دەکا، گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کەدەسەڵات بگرێتە دەست.

لەم روانگەیەوە، ئەم گروپـــە عیلمانییـــە توندرەوە وای بـۆ دەچـن کـەدەبێ رەهەندی ئیسلامگەرا لەهەمو لایەکەوە گەمارۆ بدرێ، ئەگینا لەگەڵ زیادبونی جەماوەرێتییدا رادیکالتر دەبێو سود لەو بارودۆخـە دیموکراتـیو ئازادییـەش وەردەگرێ کەدیموکراسی لەتورکیا دەستەبەری دەکا.

## ٤-کرانەوەی عیلمانییەتی دیموکرات

نوخبەی عیلمانیو لەگەڵ ئەودا کۆمەڵێك چـەپی توندرەو وای بـۆ دەچـن کەبرەو سەندنی ئەم دواییـەی رێکخستنی سیاسیی ئیسلامگەرا هەرەشـە لەبنچینە دیموکراتیو عیلمانییەکانی رژێمی سیاسیی تورکیا دەکا. ئەم نوخبـە توندرەوەی عیلمانییـەکان ئـەوەیان پـێ هـەرس نـەکرا کەئەزمونـە سیاسـییە ئیسـلامییە کـۆنو نوێکـە پابـەندبونی رونو ئاشـکرای خـۆی بـــە بنـەماو مەرجەکانی یاریی دیموکراتی راگـەیاندوەو جـەختی کردۆتـە سـەر پابـەندبون بەعیلمانیـەتو وای دانـاوە کەعیلمانیـەت لێـی رادەبیـنرێ ئـازادیی ئـاینی دەسـتەبەر بکـات. لـەم سـەروبەندەدا سـەرانی ئـەم رەوەنـدە وای بـــۆ دەچـــن کەپابـەندبونی رێکخسـتنی سیاسـیی ئیسـلامگەرا یـان ئـەزمونی سیاسـیی ئیسـلامگەراو بەرزکردنـەوەی دروشمـی دیموکراسـی لەلایەنییـەوە، تەنـها تاکتیکێکی سیاسییەو هیچیتر، تاکتیکێکە هەلومەرجی ئەمرۆی سیاسـەت سەپاندویەتیو هەر کات دەستەڵاتو نفوزێکی زۆرتری لەناو کۆمـەڵو رژێمـی تورکیادا پەیدا کرد، خۆی لەهەمو پابەندییەکان رادەپسکێنێو ملکەچی هیچ پابەندییەك نابێ.

لـەم بـوارەدا زۆر سـازانو گونجـان لـەنێوان ئـەم گروپـەو گروپەکـەی نـاو دامـەزراوی سـوپا دێتـە دیو زۆر جـار دەبێتـە مایـەی هەراسـان کـردنو تەنگەبەرکردنێك کەتەنها دو فاکتەر سنورێك بۆ بـەردەوام بـونو قولبونـەوەی دادەنێن:

١-فاکتەری یەکەم کەفاکتەرێکی دەرەکییە، سەرنج و تێبینییەکانی چاودێرانی نێودەوڵەتییە، بەتایبەتی یەکێتیی ئەوروپا، کەزۆر جار گازاندە لەسیاسەتمەدارانی تورك دەکاو دەیانداتە بەر تانەو تەشەرو گلەیی چونکە پێشێلکارییەکی زۆر لەبواری ئازادیو مافی مرۆڤدا ئەنجام دەدەن.

٢-فاکتەری دووەم کەفاکتەرێکی نێوخۆییەو ئەویش گرنگە، راو بۆچوونی ئەو گروپەی عیلمانییەکانە کەمیانڕەوو هاوسەنگو سەنگینن.

خاوەنە عیلمانییەکانی ئەم رەهەندە وا تێدەگەن درەوشانەوەی ئەستێرەی رەهەندی ئیسلامگەراو سەرکەوتنی ئەزموونە سیاسییەکەی چ ئەزموونە کۆنەکەو چ ئەزموونە تازەکە، مەرج نیە وا لێك بدرێتەوە کەئەمە کەڵەوەکێشی کردنە لەگەڵ عیلمانیەتو دیموکراسیدا لەتورکیاو وای دەبینن کەدیموکراسیو عیلمانیەت بەچەمکە لیبرالییەکەی کەرێی بەفرەییو جیاوازیی بیروڕا داوە، بەدرێژایی سەدە جێی خۆیان لەناو کۆمەڵو رژێمی سیاسیی توركدا کردۆتەوەو لەم سەروبەندەدا دیموکراسی بەتایبەتی هەمو هەڵسوڕاوە سیاسییەکان پێی رازین چ ئەو هەڵسوڕاوانە ئیسلامگەرا بن یاخود عیلمانی، چەپ بن یاخود راستڕەو. جگە لەوەی کەنیو سەدە کاری دیموکراتیانە بۆتە هۆی سەرهەڵدانو گەلاڵەبونو پەیدابونی کەلتورێکی دیموکراتیو کۆمەڵێکی مەدەنیی چوستو چالاك کەخۆی بەرگری لەو دیموکراسیو ئازادییانە دەکا کەرژێمە سیاسییەکە بۆی دەستەبەر دەکەن[١٤].

لەگۆشەی نیگایەکی ترەوە، ئەم گروپەی میانڕەوی عیلمانی وای بۆ دەچێ کەرژێمی سیاسیی تورکیا تاڕادەیەکی زۆر سەرکەوتو بوو لەتێکهەڵکێش کردنی رەهەندی ئیسلامگەرا لەیاریی دیموکراسیداو چەند کەناڵێکی کاری سیاسیو ئازادیی رادەربڕینی بۆ کردەوەو رێی پیێدا بەرنامەی خۆی لەرێی هۆکانی راگەیاندنەوە بڵاو بکاتەوە. ئیتر تێکهەڵکێش کردنی ئیسلامی سیاسی لەکاری دیموکراتیداو بونی لەناو ناوەندەکانی حوکمڕانیو دروستکردنی بڕیارداو لەنزیکەوە شارەزابون لەگیروگرفتو کێشەکانی کۆمەڵی تورك، بونە هۆی خەفەو هێدی کردنی پرۆگرامو گوتاری سیاسیی رەهەندی ئیسلامگەراو لەم

سۆنگەیەوە ئەزمونی سیاسیی ئەم رەهەندە زیاتر بەرەو میانرەوی رۆیی‌و بەهێمنی بوو بە بەشێك لەتەونی سیاسیی ولاَت‌و لەچوارچێوەی دیموکراسی‌و فرەیی‌دا کەوتە کار بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکانی خۆی.

بونی ئەزمونی سیاسیی ئیسلامگەرا لەناو هەناوی سیاسەتی تورکیادا، لەروانگەی گروپە میانرەوەکەی ناو رەهەندی عیلمانی‌یەوە بەشداریی کردووە لەهاتنە پێشەوەی هێمنانەی رەهەندی ئیسلامگەراو بەشداربونی ئاسایی‌ی لەژیانی سیاسیدا. ئیدی لەباری سەرنجی ئامانجە رەواکەیەوە، ئەو مافەی هەیە کەتێڕوانین‌و بۆچونی خۆی سەبارەت بەهەمو ئەو مەسەلانە هەبێ کە لەسەر گۆڕەپانی تورك گەرم‌و گوڕن، لەوانە دیدو تێڕوانینی خۆی سەبارەت بەپرنسیپی عیلمانیەت چونکە ئەزمونی سیاسیی ئیسلامگەرای کۆن‌و نوێ وای بۆ دەچێ کەچەمکی عیلمانیەت بەو جۆرەی کە کەمال ئەتاتورك دایڕشتوەو تائێستا لەلایەن گروپێکی دەمارگرژو توندڕەوی عیلمانییەکانەوە پەیڕەو دەکرێ، دەبێ برێك دەستکاری بکرێ. عیلمانیەت لەدیدی ئەم گروپەی عیلمانییەکانەوە بەمانای لێك جیاکردنەوەی دین‌و دەوڵەت‌و ملکەچ کردنی دین‌و دام‌و دەزگاکانی بۆ دەوڵەت دێ، لەکاتێکدا نوخبەی ئیسلامگەرای خاوەن ئەزمونی سیاسی‌ی ئیسلامگەرا هەوڵ دەدا دین لەهەژمونی دەوڵەت دور بخاتەوەو سەربەخۆیی‌یەکی دیاریکراوی بۆ مسۆگەر بکات، ئەمەش گۆڕانێك لەچەمکی عیلمانیەت لەناوخۆی تورکیا دێنێتە دی‌و عیلمانیەتەکە لەعیلمانیەتێکی دکتاتۆرو زۆردارەوە کەدەیەوێ ئاین ملکەچی دەوڵەت بکا، بکا بەعیلمانیەتێکی راستەقینە کەئازادییە ئاینی‌یەکان بۆ هەموان دابین دەکات.

گروپی عیلمانییە میانرەوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکا کەبونی بەشێکی زۆری رەهەندی ئیسلامگەرا (بەو هەمو هەوڵ‌و کۆششەی بۆ گۆڕینی چەمکی عیلمانیەت‌و فراوان کردنی پەراوێزی ئازادییە ئاینی‌یەکان) بۆتە مایەی دەوڵەمەندکردنی بوارو ژیانی سیاسی‌ی تورکیاو وای کردوە دیموکراسی‌ی تورك دیموکراسییەکی بەڕاست لیبرال بێ‌و رێ بەجیاوازی‌و فرە جۆری لەچوارچێوەی فرەیی‌یەکی ئازادو بێگەردا بدات، ئەمانە وا دەڕواننە دەستێوەردانی

بەردەوامی سوپاو دامەزراوی سوپایی لەژیانی سیاسیی تورکیادا کەدەستدرێژییەکی رونو ئاشکرایە بۆ سەر رەوتی دیموکراسیو مایەی لاوازکردنی ئەو دیموکراسییەشە[15].

دەستێوەردانی دامەزراوی سوپا بۆ کۆنترۆڵ کردنی پرۆسە کۆمەڵایەتییەکانی ناو هەناوی کۆمەڵی تورکیا نەك دەرەوەی- بەپێی رەهەندە عیلمانییە میانڕەوەکە - دەشێ کردەوەی زۆردارانەی لێ بکەوێتەوە کەروبەری دیموکراسی تەنگەبەر دەکاتەوە. هەروەها نزیکبونەوەی دامەزراوی سوپا لەدینامیکیاو پانتاییی کۆمەڵ کارێکی وا دەکا ئەگەری پێك هەڵشاخانی عیلمانیەتی مەدەنیو عیلمانیەتی سوپایی ببێتە ئەگەرێکی چاوەڕوانکراو چونکە عیلمانیەتی مەدەنیی ناو تورکیا تەنها بەپشت ئەستوربون بەدیموکراسی دەتوانێ خۆی نۆژەن بکاتەوە، لەکاتێکدا نزیك بونەوەی دامەزراوی سوپا لەم دینامیکیای کۆمەڵو چاودێری کردنی بەم چەشنە توندوتۆڵە پەراوێزی دیموکراسی تەسك دەکاتەوە. ئەمەش لەسەرەنجامدا دەبێتە هۆی تێکشکاندنو وێرانکردنی عیلمانیەتی مەدەنی کە لەچوارچێوەی کۆمەڵە حیزبێکی سیاسی پەیڕەو دەکرێو لەناکامدا رژێمێکی عیلمانیی نیمچە دیموکراتو نیمچە دکتاتۆر پێك دێ کە لەهەناویدا حزبە عیلمانییەکان نیمچە دیموکراسییەك پیادە دەکەنو دامەزراوی سوپاش نیمچە دکتاتۆرییەك لەدژی نەیارانی رژێمی عیلمانیو بنەما کۆمەڵایەتییەکانیان بەکار دێنێ.

بەپێی عیلمانییە میانڕەوەکان، دەستەمۆکردنی رەهەندی ئیسلامگەراو دەستەبەرکردنی پابەندبونی ئەم رەهەندە بەو پرنسیپانەی کەرژێمی سیاسیی تورکیای لەسەر دامەزراوە، نە بەو رەفتارە دێتە دی کەسوپا پیادەی دەکاو نە بەو جۆرەی نوخبەی عیلمانیی توندڕەو دەیەوێ چونکە ئەم جۆرە سیاسەتانە بۆ ماوەیەك رەهەندی ئیسلامگەرا وەلاوە دەنێنو قەوارەکەی بچوك دەکەنەوە بەلام لەهەمان کاتیشدا وا دەکەن جارێکی تر بەگوڕو تینێکی لەجاران زیاترو کاریگەرتر بگەڕێتەوە بۆ سەر شانۆی ژیان.

عیلمانییە میانڕەوەکان پێیان وایە کامپی عیلمانیی و چەپ تاڕادەیەکی زۆر بەرپرسیارە لەگەشەکردن و هەڵکشانی ڕەهەندی ئیسلامگەراو چارەسەرەکەش بەوە نایەتە دی کەپیلان لەدژی ئەم ڕەهەندە ساز بکرێ بەڵکو چارەسەرەکە لەوەدایە کەعیلمانییەکان و چەپەکان متمانەی جەماوەر بەدەست بێننەوەو ئەم متمانە بەدەست هێنانەوەیەش بەپرۆسەی بەخۆداچونەوەیەکی قوڵو ڕەخنە لەخۆ گرتنێکی ڕاستەقینەو بە سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی ریزبەندییەکان بەپێی پێداویستییەکانی قۆناغەکە دەست پێ دەکا[16].

## پێنجەم: هەڵێنجانی پەند لەنەبەردی ململانێی نێوان دو ڕەهەندەکە

چاودێران و لێکۆڵەرەوەکانی بواری تورکیا یەکدەنگیی‌یەکیان تێدا بەدی دەکرێ لەسەر ڕودانی گۆڕانێکی دیار لەئەزمونە دیموکراتییەکەی تورکیا. بەجۆرە دەبینین هەلومەرجی نەوەدەکان و سەرەتای هەزارەی سێیەم جۆرو ئامرازی تازەی لەبەڕێوەبردنی کاری سیاسیی ئاشتیخوازانەدا هێناوەتە پێش کەزۆر جیاوازە لەڕێوشوێنی کاری کودەتاچیی‌یانەی ساڵانی شەست. لەگەڵ ئەم گۆڕانەدا ئێستا زەحمەتە عیلمانیەت بەپێی کلێشە سەرەتایی‌یە بێ گەردەکانی کۆمارە عیلمانیەکەی مستەفا کەمال ئەتاتورك بەڕێوە بچێ. ئەمەش شتێکی زۆر بەسودە بۆ پێوانەکردن و هەڵسەنگاندن و زانینی ئەو دینامیکیایەی کە لەهەناوی پەرەسەندنی مێژویی و کۆمەڵایەتیی پێشهاتە تازەکاندا خۆی مات کردوە. گرنگترین ئەو ئەنجامگیری‌یانەی کەئەزمونە دینامیکی‌یەکەی دیموکراسیی تورکیا بەدەستی هێناون و نیشانەی ئەوەن کە ئەم ئەزمونە جێی ڕەهەندی سیاسیی دیکەی تێدا بۆتەوە، ئەمانەن:

١-ئەزمونی دیموکراسیی تورکیا گۆڕانێکی چۆنایەتیی تایبەتی وای بەدەست هێنا کەتێیدا هەر ڕەهەندێك دەستبەرداری ئەوە بوە کەتێڕوانینی ئایدیۆلۆژیی تەسکی بەرامبەر بەرەهەندەکەی تر هەبێ. ئەم ئەزمونە لەوەدا سەرکەوتو بوو کە گوتاری عیلمانیی ئەتاتورکی‌یانەو گوتاری ئیسلامگەرای شێوە سەلەفی سەرلەنوێ دابڕێژێتەوە بەڕادەیەك کەهەردولا توانییان بەبونی لاکەی تر ڕازی بن.

ئەم بەیەکتری رازیبونە، ئەوەی لێ کەوتەوە کەهەر لایەك دانی بەرەوایی‌ی بونی ئەوی تردا ناو ئەوەی بۆ سەلماند کەمافی خۆیەتی لەروی کەلتوری‌و سیاسییەوە بەئاشکرا چالاکی بنوێنێ[17] و ئەمەش لەسەرەنجامدا پێکەوە ژیانی بۆ هەردولا دەستەبەر کرد هەروەك برێك لێك حالّی بونی بۆ هەڵسوراندنی دیموکراسی خولقاند.

٢-سەرەڕای ئەو لایەنە خراپانەی لەئەزمونی سیاسیی تورکیادا بەدی کراون‌و بەدی دەکرێن، ئەم ئەزمونە توانیویەتی گەورەترین‌و بەهێزترین دو جەمسەری سیاسی‌ی ئایدیۆلۆژی لەهەردو جیهانی عەرەب‌و ئیسلامدا بەشێوەیەکی ئاشتییانە لەخۆ بگرێ، واتە دو جەمسەرەکەی رەهەندی مەدەنی عیلمانی‌و رەهەندی ئاینی ئیسلامی.

سەرەڕای هاوپەیمانێتی‌ی نێوان بەشێکی گرنگی نوخبەی عیلمانی‌و دامەزراوی سوپایی، بەلاّم ئەم نوخبەیە بەهەمو باڵەکانی‌یەوە دەستکاریی سەرەنجامی هەڵبژاردنی پەرلەمانی نەکردو دەستی تێ وەر نەداو راستی‌یەکانی نەشێواندو هەروەها هیچ هەوڵێکیشی بۆ لەکارخستنی پارتی رەفای نوێنەری ئەوسای ئەزمونی سیاسیی ئیسلامگەرا لەرێی کودەتای سوپایی‌یەوە نەدا بەلاّم ئەوەندەی پێی کرابێ هەوڵی‌دا سود لەهەمو هاوپەیمانی‌یەکان‌و گوشارە سیاسییەکان وەربگرێ بۆ وەلانانی ئەزمونی سیاسیی ئیسلامگەرا لەو رێوشوێنەوە کەئەزمونەکەی پێ گەیشتە دەسەلاّت[18].

هەمان شت لەگەڵ ئەزمونی پارتی دادو پەرەپێدانیش رویدا، واتە نە کەس دەستی بۆ سنوقەکانی دەنگدان بردو نە کەس ئیرادەی هەڵبژێرەکانی شێواندو نە سەرەنجامەکانیش تێکەڵ‌و پێکەڵ کران. راستە گوشاری تر خرایە سەر ئەزمونەکەو ئێستاش هەر دەخرێتە سەر بەلاّم هەمو ئەمە لەچوارچێوەی سیناریۆ دیموکراتەکان ناترازێ.

٣-بۆ هەردولا یاخود بۆ هەردو رەهەندی ئیسلامگەراو عیلمانی‌ی ناو کۆمەڵی تورکیا دەرکەوت کەململانێ مێژویی‌یە دورو درێژەکەی سەبارەت بەمەسەلەی ناسنامە ململانێیەکە هەردولای پێ دەپرۆکێ‌و چەند ئەم

ململانێیە درێژە بکێشێ ئەوەندەش هەردولا شکاوترو لاوازترو بێ تواناتر دەبن.
هەردولا لەڕێککەوتنێکی ناڕاگەیەنراودا بەو سەرەنجامە گەیشتن کەشەڕی ناسنامە شەڕێك نیە ئەوەندەی سالآنێکی دورو درێژ دەخایەنێ ئەوەندە بەماوەیەکی کەم یەکلا نابێتەوە، بۆیە هەردولا لەبری درێژەدان بەم شەڕە، رویان کردە گەشەپێدانی ئابوریو کۆمەلآیەتیی ولآتەکەیان. دیارە ئەمە بەو واتایە نایەت کەئیدی شەڕی ناسنامە بڕاوەتەوە بەلکو مەبەست ئەوەیە کەپاش سالآنێکی سەختو دژواری پڕ ململانێ سەبارەت بەم مەسەلەیە، بۆ هەردولا دەرکەوت کەدەکرێ لەبری خەریك بون بەم شەڕەوە، خەریك بن بەشەڕی ترەوە کە بەرهەمدارترو بەروبومدارترە لەوانە شەڕی پەرەپێدانی کۆمەلْ بۆ ئەوەی ولآت لەسەر شانۆی نێودەولەتیدا رۆلی شارستانێتی بنوێنێ.
٤-پاش قۆناغێکی پڕ کێشمەکێشو ململانێ، هەردولا بەشێوەیەکی ناڕاگەیەنراو پەیان بەوە برد کە لەنێوان هەردو رەهەنددا پانتاییی هاوبەش هەیەو هەروەها پانتاییی بیروڕای جیاوازیش هەیە، بۆیە ئەگەر نیمچە قەناعەتێك بەوە هەبێ کەیەك لایەن بەتاقی تەنیا لاکەی تری پێ ناسڕدرێتەوە، قەناعەت بەوەش پەیدا دەبێ کەپرۆسەی پێکەوە کارکردن لەپانتاییە هاوبەشەکاندا شتێکی ئاساییەو ئیتر دەبێ هەر لایەك لەڕوبەری خۆیدا بکەوێتە هەولْدان بۆ چاککردنی هەلسوڕانی کار.
شتێکی لەم بابەتە ماوەیەکە لەنێوان رەهەندی ناسیۆنالیستو رەهەندی ئیسلامگەرا لەجیهانی عەرەب خەریکە گەلآلە دەبێو جێیەك بۆ خۆی لەسایەی کۆنگرەی نەتەوەیی ئیسلامیی عەرەب دەکاتەوەو دەتوانم بلێم کەدەشێ ئەم چەشنە پێك گەیشتنە لەنێوان رەهەندی ئیسلامگەراو رەهەندی عیلمانیشدا روو بدات.
٥-مەسەلەیەکی فرە گرنگ هەیە کەهەردولا لەگەرمەی بەشەڕهاتندا پێی گەیشتن ئەویش ئەوەیە کەریفۆرمو گۆڕان نەك هەر بۆ رەهەندی ئیسلامگەرا سنوردارو چێوەدارە بەلکو هەروەها بۆ لایەنی عیلمانیو باقی لایەنە سیاسییەکانی تریش بەهەمو بیروباوەڕەکانییانەوەو لەم سۆنگەیەوە

هەردولا پێکەوەو هەروەها هەمو لاکانی‌تر ناتوانن تەنها بەویستی خۆیان ئەمە تێپەڕێنن چونکە هەمیشە، پێشەکی، چەندین هێڵی سور هەیەو چەندین گوشارو فشاری نێودەوڵەتیو ئیقلیمیی بەهێز هەیە کەسازش کردن لەگەڵیاندا پێویستی بەهەوڵو تەقەللای هەمو لایەك هەیە.

هەر چی چاودێریی گۆڕەپانی دیموکراتیی تورکیا بکا دەمو دەست درك بەوە دەکا کەئەم گۆڕەپانە بڕێکی باش سەرکەوتنی بەدەست هێناوەو گەشەی بەخۆوە دیوەو ئەمەش بۆتە هۆی لەخۆ گرتنی یەکێ لەگرفتە گەورەکان بەمانا کەلتوریو سیاسییەکەی لەچوارچێوەی دابو نەریتەکانی دیموکراسیو فرە حزبایەتیدا.

کەس گومانی لەوە نیە کە گۆڕەپانی دیموکراتیی تورکیا چەندەها کەموکوڕیی تێکەوتوەو ئێستاش لەو جۆرە کەموکوڕییەی تێدایە بەلام کەس نکۆڵی لەوە ناکا کەلایەنەکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی لەتواناایان دایە کەچارەسەری ئەو کەموکوڕییانە بکەنو بەشێکی زۆریشی بکەن بەهۆکارێك بۆ بەهێزکردنی پانتاییی دیموکراسی. ئەمەش بەخۆڕاییو بەهەوەنتە نایەتە دی بەڵکو پاش ئەوە دێتە دی کەلایەنەکانی هاوکێشەکە یاخود لایەنەکانی ململانێکە باش لەیەکتری بگەن چونکە بەشێکی هۆکانی شکستی دیموکراسی ناچێتەوە سەر چەند هۆکارێکی دەرەکی وەك هەندێ وای لێ تێگەیشتون بەڵکو بەشێکی زۆری هۆی ئەم شکستە دەگەڕێتەوە بۆ دیدی تەمومژی لاکانی هاوکێشەکە. من وا تێدەگەم پرۆسەی راست کردنەوەی ڕێچکەی دیموکراسی بەڕاست کردنەوەی دیدی هەر لایەك بۆ ئەوەی تر دەست پێ دەکاو ئیتر لێرە بەدواوە دەبێ پرۆسەیەك بۆ بەخۆداچونەوەو رەخنەگرتن لەهەنگاوەکانی پێشوی هەر لایەك بەجیا، بێتە ئاراوە، ئەویش لەهەوڵدانێکدا بۆ دەستنیشان کردنی شوێنەکانی هەڵەو شوێنەکانی راستی.

ئازاد میرخان لەعەرەبییەوە وەریگێڕاوە.

المصدر: المستقبل العربي، العدد ٢٩٩، السنة السادسة والعشرون، كانون الثاني ٢٠٠٤.

سەرچاوەکان:

[١] جمال عبدالهادي محمد مسعود ووفاء محمد رفعت جمعة، اخطاء يجب ان تصحح في التاريخ: منهج كتابة التاريخ الاسلامي لماذا؟ وكيف؟، الطبعة الثانية، المنصورة، دار الوفاء، ١٩٩٥، ج ١، ص ١.

[٢] هەمان سەرچاوە، ل٢.

[٣] هەمان سەرچاوە، ل١.

[٤] احمد نوري النعيمي، الحركات الاسلامية الحديثة في تركيا: حاضرها ومستقبلها دراسة حول الصراع بين الدين والدولة في تركيا، عمان، دار البشير، ١٩٩٣، ص٥.

[٥] دكتۆر ئەحمەد عيماری توستادی میژووە لەزانکۆی محەمەدی کوری عەبدوللا لەشاری فاس لەمەغریب.

[٦] نادية محمود مصطفى، العصر العثماني من القوة الى بداية المسألة الشرقية: مشروع العلاقات الدولية، منشورات المعهد العالمي للفكر الاسلامي، ١٩٩٦، ج١١، ص١٥٩.

[٧] هەمان سەرچاوە، ل١٦٠.

[٨] هەمان سەرچاوە.

[٩] امين حسن عمر، الصراع بين العلمانية والاسلام في الشرق الاوسط، ترجمة اسامة حسن عمر، ام درمان، منشورات بيت المعرفة للانتاج الثقافي، ١٩٩٠، ص١٥ ١٦.

[١٠] هەمان سەرچاوە، ل٢٣.

[١١] هەمان سەرچاوە، ل٢٤.

[١٢] هەمان سەرچاوە، ل٢٤ ٢٥.

[١٣] هەمان سەرچاوە، ل٣٩ ٤٣.

[١٤] دينا صلاح شحاتة، الاسلام السياسي ومستقبل العلمانية في تركيا، مجلة السياسة الدولية، العدد ١٣١، ١٩٩٨، ص١٥٨.

[١٥] هەمان سەرچاوە.

[١٦] هەمان سەرچاوە.

[١٧] عمرو الشوبكي، الديمقراطية التركية نموذجا للاستيعاب السياسي، مجلة السياسة الدولية، العدد ١٣١، ١٩٩٨، ص١٦٣.

[١٨] هەمان سەرچاوە، ل١٦٥.

تەوەری
ئاین و دەوڵەت لەتورکیا

# حزبە سیاسییەکانو مەسەلەی ئاین لەتورکیا

دکتۆر خەلیل عەلی مراد
زانکۆی موسل



لەتورکیا موسڵمانان ٩٨٪ی دانیشتوان پێك دەهێنن و ئیسلام لەرابردوودا و هەروەها ئێستاش توخمێکی گرنگی پێکهاتەو کاراکتەری تورك پێك دەهێنێ[١]. مستەفا کەمال(ئەتاتورك)چاك سەرو دەری لەم شتە دەردەکرد، بۆیە سودی لەهەستو نەستی ئاینی وەرگرت بۆ جۆشدانو خرۆشاندنی جەماوەر لەخەباتدا دژی داگیرکەرە بیانییە((گوایە کافرەکان))لەساڵانی جەنگی سەربەخۆیی تورکیادا لە١٩١٩-١٩٢٢ دا[٢]. بەڵام ئەم سیاسەتە لەتاکتیکێکی کاتی بەولاوە هیچی تر نەبو ئەویش لەبەر رۆشنایی هەلومەرجێکی دیاریکراوی مێژوو. مستەفا کەمال پاش ئەوەی بەسەربەرزی لەو جەنگە دەرچوو و پاش ئەوەی هەستی بەدەستڕۆیشتویی خۆی لەناوخۆدا کرد، دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا لە٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣ دا سیاسەتێکی پەیرەو کرد ئامانجەکەی مۆدێرنێزەکردنی کۆمەڵو دەوڵەتی تورکیا بوو لەسەر مۆدێلی رۆژئاوایی بەمەبەستی گەیشتن بەهێنانەدیی دەوڵەتێکی هاوچەرخی لائیکی(عیلمانی). ئەم کارەش پێویستی بەکۆمەڵێك ئیجرائات هەبو بۆ دابڕاندنی تورکیا لەرابردوو و ژینگەی ئیسلامیی خۆی وەك هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتو وەزارەتی شەریعەتو ئەوقاف، یاساغ کردنی تەریقەتە سۆفییەکان، داخستنی زۆر خوێندنگەو ئەنستیتوتی ئاینی لەوانە کۆلیجی ئیلاهیات لەزانکۆی ئیستانبول، یاساغ کردنی وانە ئاینییەکان لەخوێندنگاکاندا، یاساغ کردنی حەج کردن، بانگ نەدان بەزمانی عەرەبی، پیادەکردنی یاسایەکی

مەدەنیی تازەی وەرگیراو لەیاسای سویسری کەبوە مایەی کار نەکردن بەشەریعەتی ئیسلام تەنانەت لەکاروباری تایبەتیشدا، دەستکاری کردنی دەستوری تورکیا لەنیسانی ١٩٢٨دا بەسڕینەوەی ماددەی دوەمی دەستورەکەی ساڵی ١٩٢٤ کەباس لەوە دەکات کەئیسلام ئاینی دەوڵەتە، جگە لەچەندەها ئیجرائاتی تر[٣]. جێبەجێ کردنی ئەم ئیجراناتە لەسەردەمی ئەتاتورك ١٩٢٣-١٩٣٨ لەسەر حیسابی ئۆپۆزیسیۆنی ناوخۆیی کرا کەئۆپۆزیسیۆنێك بوو هەر لەزوەوە خەڵکانێکی نزیك لەئەتاتورکی لەخۆ گرتبوو[٤].

سیاسەتی مۆدێرنێزەو عیلمانیی ئەتاتورك ئاسەواری گرنگی لێ کەوتەوەو لەم بوارەدا دەوڵەت گەلە موسڵمانەکەی خۆی لەچۆنێتیی فێربوونی باوەڕە دینییەکەی بێبەش کردو سیاسەتی دەوڵەتیش بوو بەسیاسەتێکی دژی ئاین[٥] کە لەئاکامدا ئەمەش بەنۆرەی خۆی بوە هۆی لێك دابڕانی گەل و حکومەت[٦] چونکە بەعیلمانی کردنی کۆمەڵ و دەوڵەت لەتورکیا، بەپێچەوانەی ئەزمونی چەندەها دەوڵەتی رۆژئاواییەوە، زادەی پەرەسەندنی روداوو بیروباوەڕی فەیلەسوفەکانەوە نەبوە بەڵکو دەرهاوێشتەی((کاری راستەوخۆو حەماسەتی شۆڕشگێڕانەی هەڵبژاردەیەکی بچوکی بیروکرات و ئەفسەرە لاوەکان))بوە[٧]. ئیدی بەمجۆرە تەواوی پرۆسەی مۆدێرنێزەکردن بوو بەپرۆسەیەکی میکانیکییانەی گواستنەوەی بیروباوەڕی رۆژئاوایی لەکاتێکدا ژینگەی کۆمەڵایەتیی زۆرینەی هێزە کلاسیکییەکانی تورکیا پێی رازی نەبوو چونکە جێبەجێ کردنی ئەو سیاسەتە بەسەپاندن بوو و ئەوەشی کەسەپاندی هەڵبژاردەی سیاسیی دەسەڵاتدار بوو و ئەوەشی کەباوەڕی پێ بوو چەند توێژێکی بورژوازیی تازە پێگەیشتوو بوو، شانبەشانی دامەزراوی سوپاو زەویدارەکان و بیروکراتە مەدەنییەکان[٨]. زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی کە بەتەنگ پرۆسەی مۆدێرنێزەکردنەوە بون، لەریزی پارتی گەلی کۆماردا کۆبونەوە. ئەو حزبەش ئەوە بوو کەئەتاتورك لەساڵی ١٩٢٣دا دروستی کرد بەمەبەستی مسۆگەرکردنی پشتیوانیی پێویست بۆ جێبەجێ کردنی سیاسەتەکانی خۆی لەمەڕ مۆدێرنێزەکردن و عیلمانیەت بەشێوەیەکی تایبەت. ئەم حزبە تا ساڵی ١٩٥٠ دەسەڵاتی سیاسیی تورکیای بۆ خۆی پاوان کرد.

لە١٠ی تشرینی دووەمی ١٩٣٨دا مستەفا کەمال ئەتاتورك کۆچی دوایی‌ی کردو عیسمەت ئینونو جێی گرتەوە لەسەرۆکایەتیی کۆمارو سەرۆکایەتیی پارتی گەلی کۆمار. لەئاکامی گۆڕانکارییە ئابوری- کۆمەڵایەتییەکانی تورکیا لەسالآنی دوەم جەنگی جیهاندا(١٩٣٩-١٩٤٥)و لەئاکامی پەرەسەندنی گرنگی پەیوەندیی نێودەوڵەتان پاش ئەو جەنگە، عیسمەت ئینونو هەستی بەپێویستی‌ی سەلماندنی پێکهێنانی حزبی سیاسی کرد. بەجۆرە لەساڵی ١٩٤٦ بەدواوە ولآت پێی نایە قۆناغی فرە حزبی‌و لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٤٦-١٩٦٠دا چەندین حزبی سیاسی لەسەر گۆڕەپانی سیاسەتی تورکیا دەرکەوتن کەهەندێکیان هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نەبو[٩]. ئەوەندەی مەسەلەکە پەیوەندیی بەم باسەوە هەیە، ئێمە زیاتر بایەخ بەو حزبانە دەدەین کەهەڵوێستی دیاریکراویان بەرامبەر بەمەسەلەی ئاین هەبوەو دەشێ ئەم حزبانە بکرێن بەدو بەشەوە: بەشی ئەوانەن کە لەحزبی سیاسیی لاوەکی پێکدێن کە کەم تا زۆر دیدو تێڕوانینی ئیسلامگەرایان هەبوو وەك جەخت کردن لەسەر ریشەو رەچەڵەکی تورکیا لەجیهانی ئیسلامدا، خوێندنی ئاینی، پێداچونەوە بەعیلمانیەت‌و خاوکردنەوەی کۆت‌و زنجیر لەسەر نواندنە ئاینی‌یەکان. ئەم چەشنە حزبانەش بریتی بون لە:

١-پارتی راپەڕینی نەتەوەیی(میللی کالکینما پارتسی): ئەم حزبە لەتەموزی ١٩٤٥دا دامەزراو دامەزرێنەرەکانی کۆمەڵێك نەتەوەپەرستی تورکی بەدیدو تێڕوانین ئاینی بوون لەسەروی هەموپانەوە نوری دمیراغ کەیەکێك بوو لەسەرمایەدارە پیشەسازە دیارەکانی تورك. پرۆگرامی حزبەکە جەختی لەسەر پان ئیسلامیزم‌و خۆنزیك کردنەوە لەولآتە عەرەبییەکان دەکردەوە. ئەم حزبە لەدەرەوەی پەرلەمان رۆڵی ئۆپۆزیسیۆنی گێڕا چونکە نەیتوانیبو هیچ کاندیدێکی خۆی بگەیەنێ بەئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورك لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٠دا. ئەم حزبە تا ساڵی ١٩٥٥ درێژەی بەچالاکییەکانی خۆی داو دواتر ناچار بوو دەرگاکانی خۆی دابخات. ئەم حزبە لەململانێی سیاسیی ئەو سەردەمەی ولآتدا رۆڵێکی گەورەی نەبوو[١٠].

٢-پارتی پارێزگـارانی تـورك(تـورك موهافـەزكار پارتسـی): ئـەم حزبـە لـەحوزەیرانی ١٩٤٧دا بەسـەرۆكایەتیی جـەواد رەفعـەت ئەتیلـهان دامـەزرا كەناسرا بوو بەدژایەتی كردنی زایۆنیزمو پشـتگیری كردنـی پـان ئیسـلامیزم. ناوبراو پشتیوانیی خۆی بۆ خوێندنی ئاین دەربڕی[11].

٣-پارتی میللـەت(میللـەت پارتسـی): ئـەم حزبـە لەتـەموزی ١٩٤٨دا لەئاكامی لەتبونی پارتی دیموكراتدا سەری دەرهێنا. پارتی دیموكـرات بـۆ زۆر كەس لەوانەی باوەڕیان بەرەهەندی ئاینی هەبو، ببوە مایەی بێئومێدی چونكـە ئـەم حزبـە بەئاشـكرا رایگـەیاندبوو كـەدژی رەت كردنـەوەی بیروبـاوەڕی كەمالیستی‌یە. پاشان چەندەها ئەندامی پارتی گەلی كۆمـاریش چونـە ریـزی پارتی میللەتەوە[12]. سەرۆكی حزب مارشال فەوزی چەقماق بوو و پاش مردنـی لەسالّی ١٩٥٠دا حیكمەت بایۆرو دواتر عوسمان بلۆك باشی بونە سەرۆك. ئـەم حزبە خێرا تەشەنەی سەندو خەلكانی بەتێڕوانین ئاینیی بەلای خۆیدا راكێشـاو توانی دەوروبەری ٢٠٠٠ لق لەشوێنی جیاجیـا بكاتـەوە. ئۆرگـانی ئـەم حزبـە رۆژنامەی((یەنی سوبح))بوو[13]. ئەم حزبە دژایەتیی بیروباوەڕی كەمالیزمی كرد بەتایبەتی عیلمانیەت[14] و لەبەرنامەكەیدا جـەختی لەسـەر خوێندنـی ئـاینی كردەوە[15]. لە٨ی تەموزی ١٩٥٣دا حكومەت حزبەكەی داخستو ئەوەی خسـتە پالّ كەحزبێكە كار بۆ گێڕانەوەی پاشایەتیو خەلافەت دەكاو پەیوەندیی بـەمیر فاروقەوە كردوە كەمیرێكی عوسمانی بوو و ئەوسا لەمیسر دەژیا بـۆ گێڕانـەوەی بنەمالـّەی عوسمانییـەكان، جگـە لـەوەی كـە بەدژایـەتی كردنـی كـەمالیزم گوناهبار كرا[16]. لە ٢٧ی كانونی دوەمی ١٩٥٤دا یەكێ لەدادگاكانی ئەنكـەرە بڕیاری هەلوەشاندنەوەی حزبەكەی دەركرد[17] بـەلاّم پاشـان گـەورەترین دادگـای توركیا كەدادگای تێهەلچونەوەیە بڕیارەكەی هەلوەشاندەوە[18]. لەلایـەكی تـرەوە ئەم حزبە لەسالّی ١٩٥٤ سەرلەنوێ كەوتەوە گـەڕو چـەندەها لقـی بـۆ خـۆی لەشوێنی جیا جیا كردەوەو كەوتەوە راكێشانی لایەنگران بەلای خۆیدا[19]. پاشان سـەرلەبەر خـۆی دروسـت كـردەوەو نـاوی لـەخۆ نـا پـارتی كۆمـارخوازی میللەت(جومهوریەت میللـەت پارتسـی)و لەهـەلبژاردنی ئایـاری ١٩٥٤دا

بەشداری کردو پێنج کورسیی لەئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورك بەنوێنەرایەتیی شاری کیشەهر بەهۆی دەسەڵاتی دەروێشە بەکتاشییەکانەوە بەدەست هێنا[20]. سەرجەمی دەنگە بەدەستهێنراوەکانیشی گەیشتە ٤٨٠,٢٤٩ دەنگ[21].

شانبەشانی ئەم حزبانە چەند رێکخراوێکی سیاسیی ئیسلامیی تر کەوتنە گەڕ وەك پارتی پارێزگاری لەئیسلام‌و پارتی دیموکراتی ئیسلامی‌و رێکخراوی رۆژهەڵاتی گەورە(Buyuk Dogu)[22]و لەم روەوە هەوڵی تیرۆرکردنی رۆژنامەوانی تورك ئەحمەد ئەمین یلمان لەپایزی ١٩٥٢ لەشاری مەلاتی خرایە پاڵ پارتی دیموکراتی ئیسلامی‌و رێکخراوی رۆژهەڵاتی گەورەوە. یلمان کەیەکێ بوو لەسەرکردەکانی جولەکەی دۆنمە، خاوەنی رۆژنامەی وەتەن(Vatan) بوو کەرۆژنامەیەك بوو ناسراو بوو بەدژایەتی کردنی ئیسلام‌و پشتگیری کردنی زایۆنیزم[23]. بەڵام سەرچاوەکان هیچ زانیارییەکی تێروتەسەل‌و گرنگ دەربارەی ئەو رێکخراوانە ناخەنە بەر دەست.

گروپی دووەمی حزبە سیاسییەکان لەو حزبانە پێکدێ کەپەیڕەوییان لەبیروباوەڕی کەمالیزم دەکرد بەڵام لەبەر چەندین هۆی جیا جیا لەبەرامبەر مەسەلەی ئاینی لەتورکیا نەرمی‌یەکی زۆریان نواندبوو. ئەم گروپە دو حزبە سەرەکییەکەی وڵاتی دەگرتەوە کەبریتی بون لەپارتی کۆمارخوازو پارتی دیموکرات. ئەوی راستی بێ، رۆڵی ئاین لەژیانی تورکیا یەکێ لەکێشە سەرەکییەکانی مایەی مشتومڕ بوو لەنێوان ئەم دو حزبەداو پاشساڵی ١٩٤٥ ئەم بابەتە بوو بەیەکێ لەمەسەلە گشتییە هەرە گرنگەکان[24]. ئێستا ئەو پرسیارەی کەلێرە قوت دەبێتەوە ئەوەیە کەبۆچی‌و چۆن مەسەلەی ئاین بەو گەورەیی‌یە هاتە پێش بەڕادەیەك کەهیچ یەکێ لەو دو حزبە لەخۆی رانەپەڕمو خۆی لێ بدزێتەوە؟

گومان لەوەدا نیە کەیەکێك لەهۆیە سەرەکییەکان مانەوەی ئیسلامە وەك هێزێکی شاراوە بەدرێژایی‌ی ئەو ساڵانە چونکە هەنگاوەکانی مۆدێرنیزەکردن‌و عیلمانیەت هەنگاوی زۆردارەکی‌و زادەی بۆچونی توێژێکی بچوك بون‌و

نەیانتوانیبو شۆڕ ببنەوە ناخی لادێی تورکیا[25]، جگە لەوەی کەچەندەها شاری بچوکی وەك قۆنیەو سیواس کەوەك مۆڵگەیەکی بەهێزی داب‌و نەریتی ئیسلامی مابونەوە، بڕێکی کەمی مۆدێرنیزەیان بەرکەوت[26]. سەرباری ئەوەی کە کەمالیزم((نەیتوانی ئەرکی میتافیزیکییانەی ئاین جێبەجێ بکات، واتە هیچ سیستمێکی وای بۆ بیروباوەڕو نەریتی ئاین دانەنا کەکارێکی وا بکات خەڵکی بەهۆیەوە زاڵ بن بەسەر گرفتە گەورەکانی ژیانی مرۆڤایەتیدا))[27]. لەم بارەیەوە لێکۆڵیار بێرنارد لویس لەکاتی هەڵسەنگاندنی ئەوەی ناوی ناوە((بزاوتی بێداریی ئیسلام))لەتورکیا لەساڵانی پەنجاکاندا ئاماژە بەوە دەدا کەئەم بزاوتە((ئارادەیەك زادەی هەستێکی ئاینیی راستەقینە بوو، زادەی شۆڕشی گەلێکی ئێجگار دیندار بوو لەدژی بیروباوەڕی ساردو سڕو کلۆری عیلمانی کەوەك عەدنان ئەدیوار گوزارشتی لێ کردوە تورکیای کرد بەگۆڕستانێکی گەورەی بیروباوەڕی زەبرگەرایی(الحتمیه)(posivistic))[28]. بەپێی نوسینەکانی ئۆریل هاید لەسەرەتای ساڵی ١٩٤٧دا((رۆژئاوایی کردنی خێرا، لەڕوی ماددی‌و روحی‌یەوە، بوە مایەی سەرهەڵدانی قەیرانێکی کۆمەڵایەتی‌و ئەخلاقیی قوڵ لەتورکیا.. جێی تێڕامانە کەرۆژنامەکانی تورك لەم دواییەدا چەندەها وتاریان بڵاو کردۆتەوە کەجەخت لەسەر رۆڵی خوێندنی ئاینی لەگێڕانەوەی بەها ئەخلاقییەکانی ژیانی تایبەت‌و گشتی‌دا دەکەن))[29]. جگە لەهەمو ئەوەی باس کرا، هەنگاوەکانی تورکیا بەرەو قۆناغی فرەیی‌ی حزبی لەساڵی ١٩٤٦دا دوراییەکی سیاسیی بەمەسەلەی ئاینی داو لەم بوارەدا هەردو حزبی سەرەکی بۆ بەدەست هێنانی دەنگی دەنگدەران هانایان بۆ ئەم مەسەلەیە بردو هەوڵیان دا کەڵکی لێ وەرگرن))[30].

هەر کەسێك لەسیاسەتەکانی پارتی گەلی کۆمارخواز بکۆڵێتەوە، دەتوانێ سەرنجی ئەوە بدات کەپاش مردنی ئەتاتورك‌و بونی عیسمەت ئینونو بەسەرۆکی کۆمارو سەرۆکی حزب، ئەم حزبە هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بەئاین تارادەیەك گۆڕیوە. ئەگەرچی هەندێ کەس هۆی ئەو گۆڕانە دەگێڕنەوە بۆ ئەوەی کەئینونو تارادەیەك بەبیروباوەڕی میانڕەوو محافزکار ناسرابوو[31] بەڵام زیاتر

ڕێ بۆ ئەوە دەچێ کەهاندەری بۆ ئەو گۆڕانە جوانکردنی سیمای حزبەکەی بووە لەبەردەم گەل دا، جگە لەوەی کەویستویەتی سەنگی حکومەتیشی پێ سەنگین بکات. ئەوی ڕاستی بێ ئینونو تەنها بەهۆی هەلومەرجی نزیکبونەوەی هەلگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانەوە توانی دەسەلاتی ڕەهای خۆی لەنێو حکومەتدا بپارێزێ[32].

سەرەتای گۆڕانی ڕێژەیی هەلوێستی پارتی گەلی کۆمارخواز بەرامبەر بەمەسەلەی ئاین خۆی لەچەند هەنگاوێکدا نواند وەك سەرلەنوێ ئاوەدان کردنەوەی هەندێ مزگەوت کە لەڕوی مێژوویی و بیناسازییەوە بایەخی خۆیان هەبو، دەرکردنی بڕیاری دروست کردنی پەیکەرێك بۆ سولتانی عوسمانی محەمەدی دووەم(محەمەدی فاتیح) کەئەمەش ئاماژەیەك بوو بۆ پەی بردنێکی زۆر بەرابردوی ئیسلامیی دەولەتی مۆدێرنی تورکیا[33]. لەسالی ١٩٤١ بەدواوە، حزبەکە ڕێی دا مەلاکان بگەڕێنەوە بۆ ناو سوپا[34] و هەر لەو سالەشدا ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیی تورك دەرچو. لەم سەروبەندەشدا کۆمەلێك نوسەری خاوەن دیدی ئیسلامییانە لەوانە ئەشرەف ئەدیب، سەرنوسەری پێشوی بلاوکراوەی ئاینیی سەبیلوڕڕەشاد Sebilurresad، زۆر بەسەختی بەگژ ئەو بڕیارەی وەزارەتی پەروەردەدا چونەوە کەبڕیاری دابوو هاوکاریی دەستەی نوسەرانی ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیی لیدن بکا تاکو ئەو ئینسکلۆپیدیایە بکرێ بەزمانی تورکی و هەندێ وتاریشی بخرێتە پال کەچەند لێکۆلیارێکی تورك نوسیویانە. ئەو کۆمەلە نوسەرە دەیانگوت ئەو ئینسکلۆپیدیا ئیسلامییەی لەلیدن دەرچوە کارێکە چەند مژدەبەرێکی مەسیحی گوایە بۆ لەق کردنی بناغەکانی بیروباوەڕی ئیسلام ئەنجامیان داوە[35]. پێشەکیی بەشی یەکەمی ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیی تورك کەسالی ١٩٤١ لەئیستانبول دەرچو، وای بۆ چوو بوو کەئیسلام لەمێژووی جیهاندا خالێکی وەرچەرخان بووەو شارستانێتیی ئەورووپا زۆرێ لەبەها بنەڕەتییەکانی لەئیسلام وەرگرتووە.

بەپێچەوانەی بیرو بۆچونی دامەزرێنەرانی تورکیای کەمالیستەوە، پێشەکییەکە ئاماژەی بەوە دابو کەتورکەکان بۆیە بونە موسلمان چونکە

ئیسلام ئەو ئاینە بوو کە لەگەڵ گیان و کاراکتەری نەتەوەیی‌یاندا دەگونجا. گومان لەوەدا نیە کەئەم چەشنە ئینسکلۆپیدیایە بەهیچ شێوەیەك نەیدەتوانی لەسەردەمی ئەتاتورکدا دەربچێ[36].

هەر لەسەرەتای سەردەمی فرە حزبیی تورکیاوە لەساڵی ١٩٤٦دا، پارتی گەلی کۆمارخواز هەندێ نەرمیی سەبارەت بەمەسەلەی ئاین نواند ئەویش لەژێر گوشارو فشاری رای گشتی بەشێوەیەکی سەرەکی‌و لەژێر گوشارو فشاری پارتی دیموکراتی بەرهەڵستکار کەهێرشی دەکردە سەر پارتی گەل‌و بە((حزبێکی دژ بەئیسلام)) ناوزەدی دەکرد[37]. پارتی گەل هەم ئەم نەرمییەی نواند هەم دەستبەرداری عیلمانیەتیش نەبوو و وا پاساوی بۆ تەنازولاتەکانی هێنایەوە کە((گرەنتی‌یەکە لەدژی توندڕەوی‌و تاریکپەرستی))[38]. لەکانونی یەکەمی ١٩٤٦ بەدواوە ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورك دەستی بەگفتوگۆ کرد سەبارەت بەخوێندنی ئاینی[39] و ئەگەرچی لەو کاتەدا خودی پارتی گەل داوای نەکردبو خوێندنی ئاینی بگێڕدرێتەوە بەڵام رۆژنامەکانی تورکیاو ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورك گفتوگۆی تێروتەسەلیان سەبارەت بەم بابەتە کردو لەکۆتاییدا پارتی گەل لەساڵی ١٩٤٩دا رازی بوو خوێندنی ئاینی بەشێوەیەکی ئارەزومەندانە بگێڕێتەوە بۆ خوێندنگە سەرەتایی‌یەکان[40]. پاشان ئەم حزبە لەساڵی ١٩٤٧دا ئەو کۆت‌و زنجیرانەی کەم کردەوە کەخرابونە سەر حەج بۆ مەککەو لەم روەوە ئیدی یەکەم گروپی حاجییانی تورك سەردانی حیجازیان کرد[41]. حکومەتی تورك لەسەردەمی ئەتاتورك حەجی قەدەغە کردبوو چونکە نەیدەویست هاوولاتییەکانی خۆی بەشداری لەم چەشنە خڕبونەوە ئیسلامییە بکەن[42]. ئیدی لەکانونی دوەمی ١٩٤٨ یەکەم پێشنیاری رەسمی سەبارەت بەکردنەوەی کۆلیجی ئیلاهیات پێشکەش کراو ئەمەش دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبو. لە٤ی حوزەیرانی ١٩٤٩دا یاسای ژمارە ٥٤٢٤ بڕیاری کردنەوەی ئەم کۆلیجەی‌دا لەزانکۆی ئەنکەرە، ئیتر کۆلیجەکە لە٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٩دا کرایەوەو بۆ دەرس وتنەوە مامۆستا لەمەغریب‌و یۆگۆسلاڤیاو چەند دەوڵەتێکی ئیسلامی پەیدا کرا[43]. لەبەیاننامەی

دامەزراندنی کۆلیجەکەدا ئاماژە بۆ ئەوە کرا کەدو مەبەست لەپشت کردنەوەی کۆلیجەکەوەن یەکەمیان پەروەردەکردنی پیاوانی ئاین کەگەلی تورك وەك گەلێکی بەزۆرینە موسڵمان پێویستی پێیانەو دووەمیان بەشداری کردنە لەپەرەپێدانی بیری ئیسلامی لەبەر رۆشنایی زانستی مۆدێرندا[44]. شانبەشانی ئەمە وەزیری پەروەردە لەساڵی ١٩٤٧ەوە رایگەیاندبوو کەپلانێکی بەدەستەوەیە بۆ مەشق پێ کردنی ئیمامی مزگەوتەکان لەئامۆژگە ئاینییە تایبەتەکانو ئەم پلانە لەکانونی دووەمی ١٩٤٨ دەست بەجێبەجێ کردنی کرا[45]. دوایین هەنگاوی پارتی گەلی دەسەڵاتدار بەرلەوەی بەهۆی هەڵبژاردنی ئایاری ١٩٥٠ەوە لەدەسەڵات دەرچێ، بریتی بوو لەو یاسایەی کەئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورك لە٢٣ی ئازاری ١٩٥٠ دەری کرد ئەویش سەبارەت بەفراوان کردنی دەزگای کاروباری ئاین بوو کەدەزگایەك بوو پاش هەڵوەشاندنەوەی وەزارەتی شەریعەتو ئەوقاف لەساڵی ١٩٢٤دا دامەزرێنرا بوو. یاساکە وای دانابو کەجێگرێك بۆ بەڕێوەبەرو لێژنەیەکی راوێژکار بۆ چاپەمەنیو هەڵسوڕاندنی دامودەزگای خێرخوازو کۆمیتەیەك بۆ سەرپەرشتی کردنی چاپ کردنی قورئان، دابندرێ. هەروەها یاساکە بڕیاری دابو بۆ هەر ناوچەیەکی وڵات مفتییەك دیاری بکرێ. ئیدی لەهەڵمەتی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٠دا پارتی گەل بەڵێنیدا کەگۆڕستانو مەرقەدەکان دەکاتەوەو هەمیشە وەك دڵسۆزی ئیسلام دەمێنێتەوە[46]. پاش ئەوەی حزبەکە لەهەڵبژاردن دەرنەچو، بوو بەحزبێکی بەرهەڵستکاری حکومەتەکەی پارتی دیموکراتو هەڵوێستەکانی سەبارەت بەمەسەلەی ئاین لەبەر رۆشنایی ململانێی سیاسیی لەگەڵ ئەو حزبەدا رەنگیان دایەوە.

پارتی دیموکرات لەکانونی دووەمی ١٩٤٦دا دامەزراو ئەوانەی کەداشیانمەزراند بریتی بون لەجەلال بایار، عەدنان مەندریس، رەفیق کۆرالتانو محەمەد فوئاد کوپرولو کەهەر هەمویان جاران ئەندامی دیارو کارا بون لەپارتی گەلی کۆمارخواز[47]. ئەم حزبە پەیڕەوی لەشەش پرنسیپە کەمالیستییەکەی کۆمارخوازی، نیشتمانپەروەری، گەلگەرایی، دەوڵەتگەرایی،

عیلمانیەتو شۆڕشخوازی کرد کە لەساڵی ١٩٣٧ـەوە تێکهەڵکێشی دەستوری تورکیا کرابون، جگە لەوەی کەپڕۆگرامی حزبەکە جـەختی لەسـەر لیـبرالیزمو دیموکراسـی کردبـۆوە. ئـەم حزبـە لـەپاش دامـەزراندنی بەماوەیـەکی کــەم، ژمارەیـەکی زۆری لـەو تورکانـە بــەلای خۆیــدا راکێشــا کــەنارازی بــون لەسیاسەتەکانی پارتی گەلو پاوان کردنی دەسەڵات، لەوانە ئەو کەسانەش کـە دیدو تێڕوانینی ئیسلامگەرایان هــەبو بـەڵام ئەمانــەی دوایـی هەسـتیان بـە نائومێدی کرد کاتێك حزبەکە بەئاشکرا بەگژ بناغەکانی کەمالیزمدا نــەچۆوە بەتایبەتی عیلمانیەت. هەر ئەمانەش بون کـە لەپشـت ئـەو لەتبونـەوە بـون کەساڵی ١٩٤٨ بەرۆکی حزبەکەی گــرتو بـوو بەمایـەی پێکـهێنانی پـارتی میللەت. پێدەچێ ئەم لەتبونە بوو بێ بەهاندەرێك بۆ ئـەنجامدانی گۆڕانکـاری لەسیاسـەتی پـارتی دیموکـرات چونکـە ئـەم حزبـە هــەوڵیدا خـاوەن دیـــدە ئیسلامییەکانی نـاو ریزەکـانی خـۆی بپـارێزێو نەیـەڵێ پـەیوەندی بـەپارتی میللەتەوە بکەن[48]. فاکتەرەکەی تر هەوڵدان بوو بۆ بەدەسـت هێنـانی دەنگـی دەنگدەران لەگوندو لادێکاندا لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٠دا. لەڕاسـتیدا هـۆی سـەرکەوتنی دیـاری دیموکراتـەکان لـەو هەڵبژاردنـەدا بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە کەجوتیارەکان دەنگیان بەو حزبە دا[49]. ئیتر لەبەر رۆشنایی‌ی ئـەم دو فاکتـەرە، پارتی دیموکرات لـەکاتی هەڵمـەتی هـەڵبژاردنی ١٩٥٠دا بـەڵێنێکی زۆریدا کەپەیوەندیی بەمەسەلەی ئاینەوە هەبو وەك گێڕانەوەی بانگ بەزمانی عەرەبی کەئەتاتورك لەساڵی ١٩٢٨ـەوە یاساخی کردبو، گێڕانەوەی خوێندنـی ئـاینی، پشتیوانی کردن لەکۆلیجی ئیلاهیاتی زانکۆی ئەنکەرە، کردنەوەی مزگــەوت، قـەرزدان بـەهاوولاتییان بـۆ چـون بـۆ حـەج، خۆهەڵنــەقورتاندنی دەوڵــەت لەمەسەلەی جلوبەرگی ژنان[50]. فاکتەری ئاینی شانبەشـانی فاکتـەرەکانی تـر رۆڵێکی کاریگەری هەیە لەسەرکەوتنی پـارتی دیموکـراتو بەدەسـت هێنـانی زۆرینەیەکی دیار لەکاتی هەڵبژاردندا[51].

پارتی دیموکرات تــا کودەتـا سـوپایی‌یەکەی ٢٧ی ئایـاری ١٩٦٠ لەسـەر دەســەڵات مایـەوەو توانـی هـەڵبژاردنی سـاڵی ١٩٥٤و هـەڵبژاردنی ســاڵی

١٩٥٧یش بباتەوە. ئیتر لـەو دە ساڵەدا وڵات گۆڕانێکـی بـەرچاوی سـەبارەت بەسیاسەتی حکومەت بەرامبەر بەمەسەلەی ئاین لـەتورکیا بینـیو حـزب وا سەیری ئیسلامی کرد کەئامرازێکی کاراو کاریگەرە بـۆ بـەهێزکردنی ئاکـارو بەرپەرچدانەوەی کۆمۆنیزم[٥٢]. ئیدی لێرەوە ئامـانجی سیاسـەتی کـەلتوری بـوو بەپاراستنی ئیسلام وەك توخمێك کەناکرێ لەکەلتوری تـورك جـوێ بکرێتـەوەو ئەم سیاسەتە بوە مایەی دەستەبەرکردنی وەرگرتنی خاوەن دیدە ئیسلامگەراکان لەڕیزی پارتی دیموکراتدا[٥٣].

لەلایەکی ترەوە ئەم سیاسەتەی پارتی دیموکرات پەیوەندیی بەڕەهـەندەکانی سیاسەتی دەرەوەی تورکیاوە هەیە چونکە لەسەرەتای پەنجاکاندا تورکیا کەوتـە هەڵپەی خۆنزیککردنەوە لەعیراقو ئێرانو پاکسـتانو ئـەم خۆنزیککردنەوەیـە ڕێـی بـۆ هاتنـە کایـەی پـەیمانی سـاڵی ١٩٥٥ی بـەغدا خۆشـکرد. یـەکێ لەپێداویستییەکانی ئەم خۆنزیککردنەوەیە دەرخستنی سیمای ئیسـلامییانەی تورکیا بوو و کـاتێك کاربەدەسـتانی ئـێرانو پاکسـتانو ئەفغانسـتانو چـەند دەوڵـەتێکی تـری موسـڵمان دەسـتیان بەسـەردانی ڕەسمـی بـۆ تورکیـا کـرد، کاربەدەستانی تورکیا زۆر بەتـەنگ ئـەوەوە بـون کەوێنـەی ئـەو کاربەدەسـتە بیانییانە بگرن لەکاتی سەردانی مزگەوتەکانو نوێژکردنـدا. هـەروەها کـاتێك میسرو سوریا کەوتنە بەتوندی ڕەخنەگرتن لەتورکیا بەهۆی پەیمانی بـەغداوە، ئەم دو دەوڵەتـە گومانیـان خسـتە سـەر ئیسـلامیبونی تورکیـاو لـەئاکامدا ڕۆژنامەکانی تورکیـا لـەڕەوتی کاردانـەوەیاندا سـەرو سـیمای ئیسـلامییانەی تورکیایان دەرخستو جەختیان لەسەر کرد. هەر بۆ نمونە لەلاپەڕە یەکی ژمـارە ١٩ی کـانونی یەکـەمی ١٩٥٦ی ڕۆژنامـەی((هاڤـادس Havadis)) کـە لەئیستانبول دەردەچو، بەهادر دولگێن لەوەڵامە تۆمەتو ڕەخنەکانی میسـردا نوسی کەتورك ڕۆڵێکی مێژوییی هەبوەو توانیویەتی بەرگری لەئیسـلام بکـاو پەرەی پـێ بـداو تورکیـا ڕۆڵـی گرنگـی هـەبوە لـەداهێنانی ڕۆشـنبیرییەکی ئیسلامی، هەروەها وتی((سوربونی تورکیا لەسەر بەرگری کردن لەڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست لەدژی کۆمۆنیزمو ڕابردوی ئیسلامییانەی تورکیا ئەو دەرفەتـەی بـۆ

دەستەبەر دەکەن کەزیاتر لەمیسری هاوپەیمانی روسیا خۆی بەدەوڵەتێکی ئیسلامی بزانێ))[٥٤].

حکومەتی پارتی دیموکرات چەند هەنگاوێکی بەقازانجی مەسەلەی ئاینی ناو کەوتە کەم کردنەوەی ئەو کۆتو بەندەی خرابوە سەر رێورەسمی ئاینیو هۆکانی گوزارشت کردن لەئاین لەوڵاتدا. هەندێ لەچاودێرە رۆژئاواییەکان سەردەمی حوکمڕانیی پارتی دیموکراتیان بەسەردەمی((سەرهەڵدانەوەی ئیسلام))لەتورکیا ناو برد[٥٥].

یەکەم روخساری سیاسەتی پارتی دیموکرات لەم بوارەدا بریتی بوو لەپیادەکردنی هەندێ هەنگاو کەوەك جێبەجێ کردنی ئەو بەڵێنانە وابون کەحزبەکە لەکاتی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٠دا بەخەڵکی دابو. پاش دەوروبەری یەك مانگ لەگەیشتنی بەدەسەڵات، یاسایەکی نوێ لە١٧ی حوزەیرانی ١٩٥٠دا دەرچوو کەیەکەم رۆژی مانگی رەمەزان بوو و ئەو یاسایە رێیدا لەمەودوا بانگ بەزمانی عەرەبی بێ نەك زمانی تورکی. ئیدی لەو رۆژە بەدواوە چیتر بانگ بەزمانی تورکی نەدرا[٥٦]. هەروەها لە ٥ی تەموزی ١٩٥٠ قەدەغەی سەر بەرنامەی ئاینی لەرادیۆی تورکیا هەڵگیراو ئێزگە کەوتە پەخش کردنی قورئان. لەتشرینی یەکەمی هەمان ساڵیش وانەی ئاینی لەخوێندنگە سەرەتاییەکاندا بوو بەوانەی تەوزیمی[٥٧]. لەساڵی ١٩٥١دا چەند خوێندنگەیەك بۆ دەرچوواندنی مەلاو خەتیب کرایەوەو دواتریش خوێندنی ئاین خرایە نێو پرۆگرامی خوێندن لەقۆناغی پاش سەرەتاییو هەروەها هەڵمەتێك بۆ دروست کردنو ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتەکان دەست پێ کراو بودجە بۆ ئەم کارە بۆ گوندەکان تەرخان کرا. ئیدی لەسەردەمی حوکمڕانیی پارتی دیموکراتدا ٥٠٠٠ مزگەوت دروست کرا[٥٨] و حکومەتیش فەرمانی دا کەمەرقەدو زیارەتگا بەناوبانگەکان بکرێنەوە چونکە ئەو مەرقەدو زیارەتگایانە لەسەرەتای دروستبونی کۆمارەوە داخرا بون، بەتایبەتی لەئیستانبوڵو قۆنیە. هەروەها حکومەت رێیدا مەولود لەیادی لەدایکبونی حەزرەتی پێغەمبەردا لەمزگەوتەکاندا ساز بکرێ[٥٩].

لەسەرەتای سـەردەمی حوکمڕانـیی پارتی دیموکراتـدا تەریقـەتو بزاڤـە سۆفییەکان دیسان کەوتنەوە گەڕ، لەسەروی هەموویانـەوە تەریقـەتی تیجـانی، نورچیو هی تر. تەریقەتی تیجانی یەکێ لەتەریقەتە سۆفییە گرنگـەکان بـوو کەژمارەی مریدەکانی دەگەیشتە دەوروبەری ٣٠٠ هـەزار کـەس. رابەرەکەشـی کەمال پیلاڤ ئۆغلو بوو کەپێش هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٠ لەلایەن حکومەتی پارتی گەلی کۆمارخوازەوە گیرا بوو و خرابـوە زیندانـەوە[٦٠]. تەریقـەتی نورچـی یاخود نەورەسی، بەدیعولزەمان سەعید نەورەسی(١٨٧٦-١٩٦٠)[٦١] دامەزراند کەشێخێکی بەرەگەز کوردەو دانەری کتێبی((پەیامەکانی نور))بـوو کـەداوای دەکرد تەواوی روخسارو رواڵەتەکانی ژیانی مۆدێرن پشت گوێ بخرێو خـەڵکی بچنەوە سـەر ئیسـلام. ئـەم تەریقەتـە لەتەریقەتـە سـۆفییە گرنگـەکان بـوو کەراستەوخۆ لەلایەن حکومەتی پارتی دیموکراتەوە پشتگیری لێ کراو هەر ئـەم حکومەتەش بوو کەرابەری بزوتنەوەکەی بەخۆیو لایەنگرانیـیەوە ئـازاد کـردو رێی بەلایەنگرانی ئەم تەریقەتـە دا رێکخسـتنێك بـۆ هەڵسـوڕاندنی بزاڤـی نورچی پێك بهێننو رۆژنامەیەك بەناوی((ئیتیحاد))دەربکەن[٦٢].

نەورەسـی لەپەیامـەکانیدا بانگـەوازی بـۆ نـەفرەت کـردن لەروخسـارە ئەتاتورکییەکان بڵاوکردەوەو هێرشی کردە سەر سەردەمی ئەتاتورکو حکومەتی پارتی گەلی کۆمارخوازو تۆمەتی دکتاتۆریو گومڕایی رەهای خستە پاڵەوە[٦٣].

یەکێ لەدیاردە گرنگەکانی سەردەمی حوکمڕانیی پارتی دیموکرات رێگەدان بـوو بـەجۆرەها شـێوەی گوزارشـت کـردن لەئیسـلام بەتایبـەتی بـەهۆی رۆژنامەگەرییەوە. ئاشکرایە کەئەم جۆرە هۆیانە لەسەردەمی حوکمڕانیی پارتی گەلی کۆمارخوازدا سەرکوت کرابونو رێگەیان پێ نـەدرابوو. هـەر بـۆ نمونـە، لەساڵی ١٩٣٩دا زیاد لەهەزار کتێـب لـەتورکیا بـڵاو کرابـۆوە کەتەنـها ١٢ کتێب تیایدا سەبارەت بەئاین بوو، ئەوانـەش زۆربـەیان بـۆ فـێرکردنی نوێـژو وەعزو ئاکارو فەریزەتە ئیسلامییەکان بون. جارێ لـەوە گـەڕێ کەرۆژنامـەکان باسی کاروباری ئاین بکەن[٦٤]. بەڵام بارودۆخەکە لەسەردەمی حوکمڕانیی پـارتی دیموکراتدا زۆر گۆڕاو چەندەها رۆژنامە بەپێی ئارەزووی خوێنەرەکانییانەوە چونو

کەوتنە بڵاوکردنەوەی وتار دەربارەی کاروباری ئاین‌و تەرخان کردنی ستونێکی ئاینی لەمانگی رەمەزاندا بۆ باسکردنی مەسەلەکانی پەیوەندیدار بەم مانگەو مەسەلە ئاینی‌یەکان. هەروەها درێژە درا بەبڵاوکردنەوەی ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی‌و چەندەها وتاری لێکۆڵیارە تورکەکان کە بەتێروتەسەلی بۆ باسکردنی بابەتی ئادگارە تورکییەکانی مێژوو و پەرەسەندنی ئیسلام تەرخان کرابون. هەروەها لەساڵی ١٩٥٢ بەدواوە کۆلیجی ئیلاهیات کەوتە دەرکردنی((گۆڤاری کۆلیجی ئیلاهیات))و بڵاوکردنەوەی چەندەها کتێب دەربارەی مێژوی ئاینەکان‌و هونەری ئیسلامی. سەرۆکایەتیی کاروباری ئاینیش کتێبێکی گرنگی بەناونیشانی((ئاینی ئیسلام))لەساڵی ١٩٥٤دا بڵاوکردەوە کەسەرۆکی کاروباری ئاینی حەمدی ئاکسەکی نوسیبوی‌و تێیدا هەوڵ درابوو ئیسلام وا بناسێنرێ کەئاینێکە لەگەڵ گیانی جیهانی مۆدێرندا دەگونجێ، سەرباری ئەوەی کەتێیدا بەتێروتەسەلی باسی ئیسلامییەکان کرابوو. شایانی باسە کەنوسەری ئەم کتێبە لەساڵی ١٩٣٣ـەوە کتێبەکەی تەواو کردبوو بەڵام هەلومەرج بۆ بڵاوکردنەوەی لەبار نەبو. هەروەها وەزارەتی پەروەردە تارادەیەك دەستی هەبو لەجەخت کردنە سەر رەگوڕیشە ئیسلامییەکانی تورکیا لەڕێی دەرکردنی چەند وەرگێڕدراوێکی کلاسیکیی چەند نوسەرێکی کلاسیکی‌ی وەك ئیبن خەلدون، غەزالی، سەهرەوەردی، حەریری، موحیدین ئیبن عەرەبی، جەلالەددینی رۆمی‌و هی‌تر. هەروەها لەساڵانی پەنجادا چەندەها گۆڤاری تر بڵاو کرایەوە کەهەر هەمویان ئەرکەکەیان بڵاوکردنەوەی مەسەلە ئاینی‌یەکان بوو وەك گۆڤارەکانی رێگای ئاین(Din Yalu)، دەنگی موسڵمان(Musulmansesi)، ئیسلام(Islam)و سەبیلوررەشاد(Sebilurresad). سەرباری تیراژێکی زۆری چاپی هەرزانی هەندێ کتێبی بابەت ئاینی. جگەلەوە، کتێبخانەیەکی تایبەت بەفرۆشتنی کتێبی ئاینیش پەیدا بوو کەوەك سەنتەرێکی ئەو چالاکییانەی لێ هات کەرەهەندێکی ئاینی‌یان هەبو[٦٥].

هەروەها لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بەوەش بکەین کەتورکەکان لەسەردەمی حوکمڕانیی پارتی دیموکراتدا بەشدارییان لەچەندەها کۆنفرەنسی

ئیسلامیدا کرد لەدەرەوەی تورکیا[٦٦] و چەندەها ڕێکخراوی ئاینی‌یان پێکهێنا وەك(کۆمەڵەی دروست کردنی مزگەوت) و چەند ڕێکخراوێك بۆ ئەو خوێندکارانەی کەپێویستیان بەچەند کۆرسێك هەبو بۆ خوێندنی قورئان، شایانی باسیشە کەئەم چەشنە ڕێکخراوە ئاینی‌یانە بەپێی یاسایەکی ساڵی ١٩٣٨ قەدەغە کرابوو[٦٧].

لەو چەشنە کەش و هەوایەدا هەندێ کردەوە لەدژی کەمالیزم و بیروباوەڕەکانی بەگشتی و عیلمانیەت بەتایبەتی، ئەنجام درا. پەیڕەوانی تەریقەتی تیجانی لەساڵی ١٩٥١دا لەچەندەها شوێن کەوتنە هێرش کردنە سەر پەیکەرەکانی ئەتاتورك و وێران کردنیان[٦٨]. هەروەها بەئاشکرا سەرکۆنەی پرنسیپی عیلمانیەت کرا. لەساڵی ١٩٥٢دا دیموکراتەکان نوێنەرانی شاری سامسۆنیان لەئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورك دەرکرد چونکە لەچەندین وتاردا هێرشیان کردبوە سەر عیلمانیەت و تەگبیرە کەمالیستی‌یەکان[٦٩]. لەساڵی ١٩٥٥دا کۆنفرەنسێك لەئیستانبول سەبارەت بەمەسەلەی بەڕۆژئاوایی کردنی دادوەریی تورکیاو ئاسەوارەکانی بەستراو چەندەها پسپۆری یاساناسی بیانی و چەندەها پارێزەری دیاری تورك و چەندان مێژونوس و زانا ئامادەی بون. هەندێ لەئامادە بووەکان لەوانە پرۆفیسۆر عەلی فوئاد باشگیل، مامۆستا لەزانکۆی ئیستانبول، ڕەخنەیان لەکردەوەکانی مستەفا کەمال ئەتاتورك گرت و لەبواری دادوەریدا باشگیل هێرشی کردە سەر یاسای شارنشینیی ساڵی ١٩٢٦ و ڕایگەیاند کەئەم یاسایە جەزرەبەی بەهێزی لەژیانی نیشتمانیی تورکیا داوە بەتایبەتی سیستمی خێزانی خۆماڵی[٧٠]. باشگیل لەساڵی ١٩٥٥دا کتێبێکی بەناونیشانی((دین و لائیك))بڵاو کردبوەوە تیایدا ڕەخنەی لەعیلمانیەتە مۆدێل تورکییەکە گرت چونکە ئەو عیلمانیەتە بۆتە هۆی زیادکردنی دەستێوەردانی دەوڵەت لەکاروباری ئاین لەکاتێکدا عیلمانیەت لەناوەڕۆکدا وەك باشگیل گوتویەتی((بەمانای دەست تێوەرنەدانی دەوڵەت لەکاروباری ئاین و دەست تێوەرنەدانی ئاین لەکاروباری دەوڵەت دێ))[٧١].

هەروەها لەکۆتایی‌ی سەردەمی حوکمڕانیی پارتی دیموکراتدا هەندێ

لەپەرلەمانتارەکان لەوانە نوێنەری شاری قۆنیە فاخر ئاغا ئۆغلو لەساڵی ١٩٥٩داو چەند پەرلەمانتارێکی تر لەساڵی ١٩٦٠دا هەندێ پێشنیاریان پێشکەش کرد بۆ دەستکاری کردنی دەستوورو گێڕانەوەی ئەو بەندەی دەستور کەدەیگوت ئیسلام ئاینی دەوڵەتە بەڵام ئەو پێشنیارانە ئەوەندە پشتیوانییان لێ نەکرا کەبتوانرێ گفتوگۆیان لەسەر بکرێ[٧٢].

ئەو گروپانەی کەپشتیوانییان لەمۆدێرنیزەو عیلمانیەت دەکرد، بەتایبەتی رۆشنبیرانی شارەکان، رەخنەی توندیان لەپارتی دیموکرات گرتو بەگومانەوە باسی ئەوەیان کرد کە لەساڵانی داهاتودا عیلمانیەت لەتورکیا خۆی راگرێو ئەو تۆمەتەیان لەئەستۆی سەرەك وەزیران مەندرێس شەتەك دا کە بەهۆی نواندنی نەرمی بەرامبەر بەچالاکییە ئاینییەکان دەیەوێ دەنگی دەنگدەران بکڕێ[٧٣]. تەنانەت لەنێو خودی پارتی دیموکراتدا رەخنە لەهەندێ کردەوە گیراو هەر بۆ نمونە رۆژنامەی((جمهوریەت))لەژمارەی رۆژی ٩ی تەموزی ١٩٥٠دا باسی کرد کەخەڵکانێك لەنێو ریزەکانی پارتی دیموکرات رەخنەیان لەو بڕیارە گرتوە کەرێی داوە ئێزگە پرۆگرامی ئاینی پەخش بکات[٧٤]. هەروەها لەساڵانی دواتردا چەند کەسی دیاری نێو ریزەکانی پارتی دیموکرات بانگەوازی ئەوەیان بڵاوکردەوە کەپێویستە بەرپەرچی چالاکیی ئاینی بدرێتەوە[٧٥].

لەلایەکی ترەوە پارتی گەلی کۆمارخواز کە لەساڵانی پەنجادا حزبی سەرەکیی ئۆپۆزیسیۆن بوو، چەند جارێك رەخنەی لەپارتی دیموکرات گرتو وەهای ناساند کەحزبێکە دژایەتیی عیلمانیەتو کەمالیزم دەکاو ئاین بەمەبەستی سیاسی بەکار دەهێنێ. بەڵام لەهەمان کاتدا ئەم حزبە هەوڵیدا ئەو پەڵەیەش لەتەوێڵی خۆی بسڕێتەوە کەگوایە دژایەتیی ئیسلام دەکاو ئەو تۆمەتە لەسەر خۆی لابەرێ کەنەیارەکانی پێوەیان نوساندبوو. تەنانەت هەندێ جار پارتی گەلی کۆمارخواز بەمەبەستی سیاسی، هەندێ هەڵوێستی وەرگرت کە لەگەڵ رێچکەی سیاسییدا نەدەگونجان وەك ئەوەی کەدژی ئەو تەگبیرە سەرەتاییانە نەوەستایە کەپارتی دیموکرات ئەنجامی دابوو وەك رێدان بەبانگ بەزمانی عەرەبیو پەخش کردنی پرۆگرامی ئاینی لەرادیۆ. هەر لەم روەوە

پەرلەمانتارانی ئەم حزبە لەکاتی دەنگدانی پەرلەماندا، دەنگیان بەو یاسایە دا کەرێی دەدا بانگ بەزمانی عەرەبی بێ[76]. کاتێك حکومەتی پارتی دیموکرات کەوتە پەکخستنی چالاکیی پارتی میللەت لەتەموزی ١٩٥٣داو تۆمەتبارکردنی بەوەی کە((ئاین بەمەبەستی سیاسی بەکار دێنێو هەوڵ دەدا گێرەشێوێنی لەوڵات دروست بکا))پارتی کۆمارخواز بەرپەرچی دایەوەو هێرشی کردە سەر حکومەت چونکە((کەوتۆتە زەوت کردنی ئازادیو ئەنجامدانی کاری وا کە لەگەڵ دەستوردا یەکناگرێتەوە))و ئەم هەنگاوانەی حکومەتیشی بە((نیشانەیەکی فرە ترسناك))[77] دایە قەڵەم. پارتی گەلی کۆمارخواز بەمەش نەوەستا بەڵکو عیسمەت ئینونو بڕیاریدا هاریکاریی پارتی میللەت بکات کە لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٤دا ناوی لەخۆ نا پارتی کۆمارخوازی میللەت[78] بەڵام پارتی گەلی کۆمارخواز لەو هەڵبژاردنەدا شکستی کەمەرشکێنی بەخۆوە بینیو لەساڵانی دواتردا ولەگەڵ پەرەسەندنی داپلۆسینو سەرکوت کردنی گروپەکانی ئۆپۆزیسیۆن لەلایەن پارتی دیموکراتەوە، پارتی گەلی کۆمارخواز درێژەی بەرەخنەگرتن لەسیاسەتی پارتی دیموکرات دا سەبارەت بەئاینو لەهەمان کاتیشدا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کەمەبەستی دژایەتی کردنی ئاین نیە بەڵام سەرنج بۆ ئەوە رادەکێشێ کەبەکارهێنانی ئاین لەسیاسەتدا وڵات توشی کارەسات دەکا[79].

ئایا تا چ ئەندازەیەك ئەم رەخنانە راستو دروست بون؟ ئایا تا چ ئەندازەیەك پارتی دیموکرات لەسیاسەتەکەیدا بەرامبەر بەئاین پاش هاتنە سەر کار لەساڵی ١٩٥٠، زیاد لەپێویست رۆیی؟ ئایا ئەم حزبە پرنسیپی عیلمانیەتی تێپەڕاندو وازی لێ هێنا؟

دیارە پارتی دیموکرات لەچەندەها بۆنەدا سودی لەهەستی ئاینی وەرگرتو نەرمیی بەرامبەر بەمەسەلەی ئاین نواندو کۆتو زنجیرەکانی سەر ئەم مەسەلەیەی کەم کردەوەو ئەمەش بوو بەهۆی گوزارشت کردنی خەڵکانی دیندار لەو هەستە ئاینییەی کەبیست ساڵ بوو عیلمانیەت سەرکوتی دەکرد[80]. بەڵام لەکاتێکدا پارتی دیموکرات ئەم سیاسەتەی گرتە بەر، هیچ

دەستكارییەكی پرنسیپی عیلمانیەتی نەكرد[81] و سیاسەتەكەی كەپەیڕەوی كرد هیچ هەڕەشەیەكی بۆ سەر دەسەلاتی ناوەندیو ڕێبازە لائیكییەكەی پێك نەهێنا[82].

لەڕاستیدا پارتی گەلی كۆمارخوازو پارتی دیموكرات لەسەرەتادا لەبەرەیەكی یەكگرتودا بون لەدژی ڕەهەندی ئیسلامگەرا كەهەرگیز لەئەناتۆلیا بەر لاوازی نەكەوتبوو. پارتی دیموكرات ئەگەرچی لەپارتی گەلی كۆمارخواز كەمتر دژایەتیی ئاینی دەكرد بەلام سور بوو لەسەر پیادەكردنی بنەمای عیلمانیەت[83]. سەركردەكانی پارتی دیموكرات كەخۆیان بەكەمالیست دادەنا[84] لەچەندەها بۆنەدا ئەم هەلوێستەیان دەربڕیو هیچ دودڵ نەبون لەپیادەكردنی چەندین تەگبیری توندوتۆڵ لەدژی هەر چالاكییەكی ئاینی كەدەشێ ببێ بەمایەی هەڕەشەكردن لەڕژێمی سیاسیو كۆمەلایەتیی ولات. كاتێك پەیكەرەكانی ئەتاتورك لەساڵی ١٩٥١دا لەلایەن پەیڕەوانی تەریقەتی تیجانییەوە دەستدرێژییان كرایە سەر، ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورك كەدیموكراتەكان تیایدا زۆرینە بون، لەكۆتاییی حوزەیرانی١٩٥١دا یاسایەكی دەركرد كە بەهۆیەوە هەر كەسێك كەسایەتیی ئەتاتوركی بدایەتە بەر پلار یاخود سوكایەتیی بەپەیكەرەكانی بكردایە، سزا دەدرا. هەروەها لەمانگی تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورك یاسایەكی تری دەركرد كەتیایدا هەمو ئەو سەركردەو ئەندامە هەڵسوڕاوانە بەر سزای لەناوبردن دەكەوتن كە((لەریزی ئەو رێكخراوانەن كەئامانجیان لەق كردنی سیستمە كۆمەلایەتیو ئابورییە پەیڕەوكراوەكانی ولاتە)). مەبەست لەو یاسایە رێگە نەدان بوو بەگروپە ئاینی- سیاسییە توندڕەوەكانو ڕەهەندە ماركسیستەكان بۆ چالاكی نواندن[85].

لەو سەروبەندەدا حكومەتی پارتی دیموكرات كەوتە سازدانی هەڵمەتێكی فراوان بۆ گرتنی پەیڕەوانی تەریقەتی تیجانی. لە٢٧ی حوزەیرانی ١٩٥١دا سەرۆكی تەریقەتەكە، كەمال پیلاڤ نوغلو، دەستگیر كراو لەتەموزی ١٩٥٢دا بەدە ساڵ زیندانی حوكم درا. هەروەها لەشوباتی ١٩٥٢دا رۆژنامەكان بلاویان

